# سەردەم 25

گۆڤارێکی تایبەتە بە وەرگێڕان و کەلتووری بییانی



لە ئینتەرنێتەوە

—سەردەم گۆڤارێکە بە دوو مانگ جارێك دەردەچێت، تایبەتە بە وەرگێڕانی کەلتووری بیانی لە بواری فەلسەفە و فیکر و ڕەخنە و لێکۆڵینەوە و داهێنانی ئەدەبی و هونەریدا.

—تکایە ئەو بەرهەمانەی بۆ سەردەمی دەنێرن، ناوی نووسەر و وەرگێڕیان لەسەر بێت، دەقی وتارە ئەسڵییەکەی لەگەڵدا بێت، لەسەر دیوێکی پەڕەکە نووسرابێتەوە یان کۆمپیوتەر کرابێت. پەراوێز و سەرنجەکانیش لە کۆتایی وتارەکەدا هەبن. ئەگەر یەکێك لەو مەرجانە نەهاتنە دی دەستەی نووسەران مافی بڵاونەکردنەوەی هەیە و پێشەکی داوای لێبوردن لە وەرگێڕی بەڕێز دەکات.

—بەرهەمەکان بڵاوبکرێنەوە یان نەکرێنەوە نادرێنەوە بە خاوەنەکەی.

—هەموو پەیوەندییەك لە ڕێگای سەرنووسەرەوە دەبێت


**دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم بڵاویدەکاتەوە**





**ناونیشان**

سلێمانی – فولکەی یەکگرتن

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

تەلەفۆن/ سەرنووسەر 3130347

دەزگای سەردەم 3129609

**بۆ پەیوەندیکردن لە دەرەوەی وڵاتەوە**

Tel - Fax: 0044 7543129839

ناردنی بابەت لە دەرەوەی وڵاتەوە لە ڕێی سندوقی پۆستی ژمارە (14665/615 و 14665/616) تاران

**لە ڕێگەی ( e~mail )ەوە**

sardam@sardam.net

25 سەردەم

شوباتی
2003
ســـــاڵی پێنجەم

# ناوەرۆك

## • فیکر و فەلسەفە



## • ڕەخنە و لێکۆڵینەوە



## • لە ئەدەبی گەلانەوە



## • گفتوگۆ



## • وێستگەکانی سەردەم

# خەڵاتی نۆبڵی ئەدەبیاتی *2002*



ئیمری کێرتیس

لەم ساڵانەی دواییدا زۆر جار ڕووی داوە خەڵاتی نۆبڵ بە کەسانێك دراون تا ڕادەیەك نەناسراو بوون، بە تایبەتی لە بوارەکەی ئێمەدا -بواری ئەدەبیات-، کە ساراماگۆی پورتوگالی و ڤیسلاڤا شیمپۆرسکای پۆڵۆنی و نایبۆڵ بانگەشەی خەڵاتی نۆبڵیان بۆ کرا نەك تەنیا لە وڵاتانی ڕۆژهەڵاتدا گەلێك لە کەس و دەزگا ڕووناکبیرییەکانیش بە ناوەکان سەرسام بوون، تەنانەت لە هەندێك وڵاتی ئەوروپایشدا هەر ناوەکان تازە و شوێنی پرسیار بوون، بە تایبەتی لە بواری داهێنانی ئەدەبیدا، بۆیە پاساوی سیاسی هاتە گۆڕێ و نووسەرەکان لە جێگایەکدا خانەبەند کران زیاد لەوەی ئەدەب و داهێنان بێت دالآنی سیاسەت بوو.

ساڵی پاریش (*2002*) *Imre Kertesz* کە ڕۆماننووسێکی هەنگاریە و بە ڕەچەڵەك جوولەکەیە ئەم خەڵاتەی پێ برا. ئەمە یەکەمین جارە لە هەنگاریادا خەڵاتی نۆبڵ وەربگیرێت. هۆی وەرگرتنی وەك ئاکادیمیای سویدی لە هەڵسەنگاندنی کارەکانیدا نووسیویەتی: (ئەزموونی تاکە کەسە بەرانبەر ستەمە وەحشیگەرانەکەی مێژوو)

تەوەری نووسینەکانی کیرتیس ئازار و مەینەتییەکانی مرۆڤی ئەم سەردەمەیە و، ئەو بەرگری و خۆنەدانە دەستەوەیەی کە ئەو مرۆڤە بۆ مانەوە دەیکات. ئەمە بەشێکە لە ئەزموونی سەرەکی خودی نووسەر کە لە تەمەنی (*15*) ساڵیەوە تووشی هاتووە و پاشان بووەتە هەوێنی بەرهەمەکانی، وەك ئەنجامیش کاریگەریی لەسەر ئایندەی چارەنووسساز و نەمری ئەو نووسەرە داناوە کە پێبەخشینی گەورەترین خەڵاتی دنیایە.

ئیمری كیرتیس ساڵی *1929* لە بوداپستی پایتەختی هەنگاریا لەدایك بووە، ساڵی *1944* لە تەمەنی پانزە ساڵیا نازیەكان بە تاوانی ئەوەی جوولەكەیە گرتوویانــە و ڕەوانــەی ئۆردوگاكـانی زۆرەملێـی ئاشـڤیتس و بوخنندالدیان كردووە، خۆی لە بارەی ئەو تۆمەتەوە دەڵێت (من لە جوولەكایەتی خۆم بە گومانم، چونكە لە ڕاستیا جوولەكـەیم بە بیروباوەڕ وەرنـەگرتووە، هەرچەندە وەك جوولەكەیەك لەناو كۆمەڵگایەكدا ژیـاوم كـە پەیوەندی بە جوولەكەوە نییە، بەڵام من وا هەست ئەكەم ناچار كراوم بە جوولەكایەتی و ئەوەیشم قبووڵە، بەڵام نابێت ئەوە لەیاد بكرێت كە من جوولەكایەتیم بە زۆر بەسەردا سەپێنراوە).

دوای كۆتایی پێهاتنی شەڕ و ڕزگاربوونی كاری پەیامنێری ڕۆژنامەی كردووە و دوو ساڵیش بووەتە سەرباز، لەو ماوەیەدا دەستی داوەتە وەرگێرانی ئازاد و هەندێك لە كارەكانی نیچە و فرید و هوفمانشتاڵی وەرگێراوە.

یەكەمین ڕۆمانی كیرتیس كە بە ناوی مرۆڤی بێ سەرئەنجامەوەیە *Fateless*. باسی منداڵێكی تەمەن پانزە ساڵە بە ناوی گۆركی كوفیس، لەبەرئەوەی بە ڕەچەڵەك جولەكەیە ڕەوانەی ئۆردوگازۆرەملێكان دەكرێـت، لەوێ ڕووبەڕووی ئازاری برسیەتی و نەخۆشی و گرێی دەروونی دێت و هەمیشە بۆنی ئەوانەیشی بەسەرا دێت كە نازیەكان لە فڕنەكاندا دەیانسوتێنن. بەڵام منداڵەكە دەیەوێت هەرچۆنێك بوە بژی و بەردەوامی بە مانەوەی خۆی بدات، ئەمەیش لای كیرتیس بە مانای ئەو خۆشەویستییەیە كە نەمریی دەداتە ڕۆح و ژیانی ئایندەی بۆ دابین دەكات.

بەلای كیرتیسەوە تراژیدیای (هۆڵۆكۆست) بۆ ئەم سەردەمەیش شیمانەی ڕوودانی هەر هەیە، نەوەكان چەندە مەترسیان لەسەرە ئەوەندەیش بەرپرسیارن لە ڕوودانی، ڕەنگە هەر لەبەر ئەمەیش بێت كە تا ئێستا نە خۆی و نە ماگدای ژنی بیریان لە نەوە خستنەوە نەكردبێتەوە. ئەمە بە خەستی لە هەموو كارەكانیدا ڕەنگی داوەتەوە و وەك خۆی دەڵێت (كە بیر لە نووسینی ڕۆمان ئەكەمەوە ئۆردوگای ئاشڤیتسم دێتەوە بیر). لە كارە هەرە گرنگەكانی ئیمری كیرتیس بێجگە لە ڕۆمانی مرۆڤی بێ سەرئەنجام كە باسمان كرد ڕۆمانی ناكامی *Fiasco* و چەمەری منداڵێكی لەدایك نەبوو *Keddish Fore a child not born* و زمانی تاراوگە *Tge Exiled Langage*و كوشتنی جوولەكە وەك كولتور *The Holocaustas calture* و چركەساتی ئەوكاتەی كە تیپی بكوژان تفەنگەكانیان پڕ دەكەن.

كە كیرتیس هەواڵی پێبەخشینی خەڵاتەكەیان دایە وتی (شانازییەكی گەورەیە، ڕەنگە مانای ئەوە بێت كە ئیدی لە مەودوا دەتوانم ژیانێكی ئاسوودەتر بەسەر بەرم، بە تایبەتی لە ڕووی دەرامەتەوە. بۆیە وام نیازە لەگەڵ نزیكترین هاوڕێما ئاهەنگێكی گەورە سازبكەم).

**سەرنووسەر**
**شوباتی 2003**

# فیکر و فەلسەفە

- عەلمانییەت و ئایین — د.محەمەد ئارکۆن
- لە دایکبوونەوەی ڕەواقیگەری و تیۆرەکانی "مافی سروشتی" لە بارەی دەوڵەتەوە — ئەرنست کاسیرەر
- خۆپەرستی و خۆشویستنی خود — ئەریك فرۆم
- ناسیۆنالیزم — د. موسا ئیبراهیم
- بێردیاییڤی بیرمەند — جیۆرجی ڤیدوتۆڤ

# عەلمانییەت و ئایین

## ئیسلام، مەسیحییەت، خۆرئاوا

• د. محەمەد ئارکۆن
▪ لە عەرەبییەوە: نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد

**پێشدەستی:**

ئەمە دەقی ئەو لێکچەرەیە کە محەمەد ئارکۆن لە سێنتەری (تۆماس مۆر)دا پێشکەشی کرد، ئەم سێنتەرە سیمیناری سالانە لە بارەی بابەتگەلی هەمەجۆر دەبەستێ و گەورە توێژەران بۆ وتوێژکردن بانگ دەکات. ئەمە دووەمین لێکچەری محەمەد ئارکۆنە کە لەم سێنتەرەدا لە بارەی عەلمانییەتەوە پێشکەشی کردبێت. لێکچەری یەکەم لە مانگی دیسەمبەری سالی (*1978*)دا بە ناوی "ئیسلام و عەلمانییەت" پێشکەشی کرد و ئێمە وەرمان گێڕایە سەر زمانی عەرەبی و لە کتێبی "مێژووگەرایی بیری عەرەبی ئیسلامی"دا بلاومان کردەوە، لە سالی (*1985*)یشدا بۆ جاری دووەم محەمەد ئارکۆن بۆ ئەم سێنتەرە بانگهێشت دەکرێ بۆئەوەی ئەمجارە نەك تەنها لە بارەی ئیسلام و عەلمانییەت بدوێ، بەلکو بە شێوەیەکی فراوانتر لە بارەی "عەلمانییەت و ئایین" بدوێ سا هەر ئاینێك بێت. لێرەدا ئارکۆن لە شیکردنەوەکەیدا پتر تەرکیز دەکاتە سەر ئیسلام و مەسیحییەت و خۆرئاوای بەعەلمانیکراو.

ئەم لێکۆلینەوەیە "عەلمانییەت و ئایین" تەواوکەری بەشەکەی دیکەیە "ئیسلام و عەلمانییەت"، پێویستە خوێنەر هەردوو لێکۆلینەوەکە بخوێنێتەوە بۆئەوەی بە شێوەیەکی

وردتر لە ئاراستە و تێڕوانینەکانی محەمەد ئارکۆن بۆ عەلمانییەت و ئایین تێبگات. من پەراوێز و شەرحێکی ئێجگار زۆرم بۆ ئەم بەشە داناوە لە پێناوی ڕوونکردنەوەی هەندێ خاڵی ناڕۆشن و تەماوی یان ئەوانەی ئارکۆن بە خێرایی بەسەریاندا تێدەپەڕێت، پاشان بۆ ڕوونکردنەوەی ئەو مەرجەعییەتە مەعریفی و ئەو ئاماژانەی پەیوەستن بە کولتووری فەڕەنسییەوە کە لەوانەیە دووربێت لە مەرجەعییەتە کولتوورییەکانی خوێنەری عەرەبی یان موسڵمان بە شێوەیەکی گشتی.

هاشم ساڵح

## سەرەتا:

دەمانەوێ لێرەدا هەندێ لەو مەسەلانە بخەینەڕوو کە بە داخەوە بەپێی پێویست لە فەڕەنسەدا لێیان نەکۆڵراوەتەوە زۆر کەم نەبێت. ژمارەیەکی کەمی فەڕەنسییەکان بە ڕێگەی لێکگەیشتن و پەیوەندیی ئاڵوگۆڕی بەردەوامی نێوان کولتوورەکان و ژیارەکان ئەم مەسەلانە چارەسەر دەکەن. زۆرجار بە ڕێگەی نەفرەتی سیاسی مامەڵەی لەگەڵدا دەکەن بەپێی ئەو هەڵوێستی "ڕەتکردنەوە"یەی لە ڕابردووەوە بە میرات بۆیان ماوەتەوە، بە تایبەتی لە قۆناغی جەنگە داگیرکارییەکاندا. بەداخەوە ئەزموونی مێژوویی شەڕی جەزائیر شتێکی ئەوتۆی فێری فەڕەنسییەکان نەکردووە و بە پەلە ئەو ئەزموونەیان لەبیرچووەوە وەك چۆن بیرەوەرییەکی خراپ و ناخۆش لەبیر دەکرێ. ئیدی بەراوردکاری یان ڕووبەڕووبوونەوەی چاوەڕوانکراوی نێوان کولتوورەکان ڕووی نەدا، هەروەکو ئەمە لە سەدەکانی ناوەڕاستیشدا ڕووی نەدا و بگرە بە شێوەیەکی زۆر کەمتر لەوەی کە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا هەبوو، ڕووی دا. دەبینین ئەمڕۆ ئایدیۆلۆژیا سیاسییەکان شوێنی ئەو سیستمە تیۆلۆژییە لاهوتییەیان گرتۆتەوە کە لە ڕابردوودا باو بوو، بێگومان بۆ ئەوەی کەشوهەوای گفتوگۆ پیس بکات و ڕێگە لە هەر دیالۆگێکی ڕاستەقینە بگرێت. تەنها هەڵوێستی عەلمانی -بە مەرجێك بە باشی لێی تێبگەین- دەتوانێت مەسەلەکان بجووڵێنێ و ئیشکالیەتەکان بخاتە ڕوو[1].

محەمەد ئارکۆن

## بەرەو ئەپستیمۆلۆژیایەکی تر[2]:
## عەلمانییەت وەك هەڵوێستێك لە بەرامبەر گرفتی مەعریفە
## بەرایی: ئەوەی پێویستە ئەمڕۆ جارێکی دیکە بیری لێ بکەینەوە

### یەکەم: عەلمانییەت چییە؟

من بۆ ماوەی سێ ساڵە ئەندامێکی کارای فێرکردنی گشتیی فەڕەنسیم. لەم ئاستەدا من مامۆستایەکی عەلمانیم و لە فێرکردن و دەرسەکانمدا پرۆسەی عەلمانییەت دەکەم. ئەمە سەبارەت بە من جۆرێك لە ئینتیما و جۆرێك لە پرۆسیسی ڕۆژانەیی -لە یەك کاتدا- پێکدەهێنێ. دەمەوێ هەر لە سەرەتاوە لە بەرامبەر ئێوەدا ئەو قسەیە بکەم، چونکە دەشێت هەندێ کەس باوەڕیان وابێت مومکین نییە بە هۆی ئینتیمای

ئیسلامیم و بە هۆی ئیسلامبوونمەوە لە هێڵی عەلمانییەتدا بم[3]. بوونی من لە فەرەنسەدا زۆر شتی ئیجابی و سەلبی لەبارەی ئەزموونی عەلمانییەت و شێوەی پرۆسەکردن و جۆری ژیانێکی عەلمانی فێرکردم. دواجار گەیشتمە ئەو پرۆسەیە یان ئەو قەناعەتە فیکرییەی کە دەڵێت عەلمانییەت بەر لە هەرچی یەکێکە لە کۆشش و دەستکەوتەکانی ڕۆحی بەشەری[4]. ئەمە دەستکەوتێکە لە چەندین ناوەند و لە چەندین ئەزموونی جیاجیادا پرۆسە کراوە، لەوانە جیهانی عەرەبی–ئیسلامیش وەك دواتر دێینە سەری. بەڵام ئەو وتەیە ڕاستە کە ئەم دەستکەوتە –واتە عەلمانییەت– لە کۆمەڵگا مەسیحییەکانی خۆرئاوادا زۆر دوورتر ڕۆیشتووە لەتەك هەموو ئەو شڵەژان و گرژی و ململانێیەی یاوەریی ئەو دەستکەوتە مەزنەی کردووە. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ کۆمەڵێ هۆکاری مێژوویی و کولتووری کە دەکرێ بە ئاسانی شییان بکەینەوە[5] و دواتر دەگەڕێینەوە بۆی. ئێستا بەو وتەیە وازدەهێنم کە عەلمانییەت، سەبارەت بە من، بریتییە لە هەڵوێستی ڕۆح کە لە پێناوی بەموڵککردنی حەقیقەت یان گەیشتن بە حەقیقەت تێدەکۆشێ. لێرەدا عەلمانییەت ڕووبەڕووی دوو بەرپرسیاری یان دوو بەرەنگاری دەبێتەوە:

*1*–چۆن بە شێوەیەکی گونجاو و درووست واقیع بناسین؟ واتە چۆن دەکرێ بگەینە مەعریفەیەك گونجانێکی زەینی و عەقڵیی لەگەڵ هەموو کەسێکدا هەبێت (بە چاوپۆشین لە جیاوازییەکانیان) بەرەو گەیشتن بە حەقیقەت؟ لێرەدا ئەرك و بەرپرسیارییەکی هەمیشە کراوە هەیە، ئەمە کارێکە تەواو نابێ و لە شوێنێکدا داناخرێت، ئەمەش ئەوە لە توێژەر دەخوازێت هەموو تایبەتمەندییە کولتووری و مێژوویی و تەنانەت ئاینییەکانیش تێپەڕێنێ (واتە تەنانەت سنووری ئەو تایبەتمەندییە ئاینییەش تێپەڕێنێ کە تیایدا لەدایك بووە)، ئەمە ئەو خاڵە سەرەکی و یەکلاکەرەوەیەیە کە دەمەوێ جەختی لەسەر بکەم، ئەو خاڵەی ئەوەمان پیشان دەدات عەلمانییەت شتێکی ترە و زۆر گەورەترە لە دابەشکردنی یاسایی[6] توانا و بەهرەکانی کۆمەڵگا. ئەمە یەکەمجار و پێش هەموو شتێك مەسەلەیەکە پەیوەندیی بە مەعریفە و بەرپرسیاریی ڕۆحەوە هەیە (واتە ڕۆحی بەشەری، واتە ئینسان). لە بنەڕەتدا ئەمەیە عەلمانییەت کە بە شێوەیەکی یەکسان و ئیجباری و بەبێ جیاوازی خۆی بەسەر هەمووآندا دەسەپێنێ.


دیکارت

*2*–بەرپرسیاریی دووەم پەیوەندیی بە گفتوگۆیەکی ترەوە هەیە کە باوتر و ئاشناترە، مەبەستم ئەو وتووێژەیە کە لە سەروبەندی دامەزراندنی (قوتابخانەی گشتی بۆ هەمووان) لە لایەن فەرەنسەوە، لە ئارادایە. ئەمەش شتێکی

ڕوون و لۆجیکییە، واتە دوای ئەوەی دەگەینە چەشنێك لە زانین و ناسینی واقیع دەبێ فۆرمیولایەك یان ڕێگەیەکی گونجاو بدۆزینەوە بۆئەوەی بیگەیەنینە ئەوی دی بێئەوەی مەرج بۆ ئازادییەکەی دابنێین یان ئازادیی کۆت بکەین(7). هەموو گیروگرفتی خوێندن و فێرکردن لیرەدایە. ئەمە ئەرکێکی عەمەلی ڕۆژانەییە و هەموو ئەو مامۆستایانە پرۆسەی دەکەن کە لە بەرامبەر عەقڵگەلی تازە و گەنج و پێگەیشتودان بەڵام ئەو عەقڵە گەنجانە توانای داکۆکی لەخۆ کردنیان نییە. گرنگیی ئەم بەرپرسیارییەش لەوەی یەکەم کەمتر نییە و کۆششێکی بەردەوامی لە مامۆستا دەوێت.

من بەمجۆرە لە عەلمانییەت تێدەگەم: مەبەستم عەلمانییەتێکی واقعی وەکو گرژی یان شپرزەییەکی هەمیشەیی بۆ ئاوێزانبوون بە دنیای واقیعی کە یارمەتیی بڵاوکردنەوەی ئەو شتە دەدات کە پێمان وایە لە فەزای کۆمەڵایەتیدا (فەزای کۆمەڵایەتی= واتە کۆمەڵگا) حەقیقەتە. هەر شتێکی بەدەر لەمە (واتە هەر شتێك دواتر لەبارەی عەلمانییەت بووترێت، یان ئەوەی گوایە عەلمانییەتە= عەلمانەوی) بەرهەمی کەموکورتییەکانی ئێمەیە لە پرۆسەی توێژینەوەی زانستیدا بۆ زانینی واقیع، هەروەها لە کەموکورتییە پەروەردەییەکانی ئێمەیە لە گەیاندنی ئەو زانینە (مەعریفەیە) بە ئەوی دی، یان بە ئەوانی دی. هەر لەم کەموکورتییانەشەوە زنجیرەیەك لە ڕووداو و ململانێی عەلمانی یان دژی عەلمانییەت بەرهەم دەهێنرێن یان بەرهەم هێنراون. ئەم ململانێیانە -بە شێوەیەکی تایبەتی لە فەڕەنسەدا- بووە بە گرەوێکی سیاسی کڵۆڵ وەك بەم دواییە بینیمان(8). سەرباری ئەزموونە مێژووییە گرنگەکەیان کەچی فەڕەنسییەکان ئەو وێناکردنەیان بە کردەوە تەعمیم نەکرد و ئەو وێناکردنە فەلسەفییەیان بۆ عەلمانییەت -بە باشترین و بە فراوانترین مانای وشەکە - نەپاراست(9)، نەیانزانی چۆن سنووری شوێنگەکانی ئەو جیدال و ململانێیانە جێبهێڵن کە لە نێوانیاندا بنجی بەستووە، سا لە ئاستی ئاینیدا بێت یان لە ئاستی سیاسیدا.

کەواتە گرفتەکە -گرفتی عەلمانییەت- سەبارەت بە هەمووان بە کراوەیی دەمێنێتەوە، مەبەستم سەبارەت بە موسڵمانان و سەبارەت بەو کەسانەی خۆیان بە عەلمانی دەزانن و ململانێ و خەبات دەکەن (=عەلمانییە پەڕگیرەکان)(10). سەبارەت بە موسوڵمانەکان دەبینین زیاد لە پێویست کەوتوونەتە نێو شەیدایی یەقینیاتە دۆگماییەکانی خۆیانەوە(11). سەبارەت بە عەلمانییە پەڕگیرەکانیش دەبینین عەلمانییەتی ڕاست و دروست لەگەڵ ململانێ لە دژی ئەکلیرۆس یان پیاوانی ئاین تێکەڵ دەکەن. لە هەمان کاتدا هەوڵ دەدەن وامان نیشان بدەن کە ئەوەندە بەسە مامۆستا لە دەرسەکانیدا "بێلایەن"(12) بێت بۆئەوەی بگاتە نموونەی عەلمانی و ئاوێزانی بێت. بەڵام مەسەلەکان بەم سادەییە نین، چونکە لێرەدا مەسەلەی مەعریفە بە تەواوی خراوەتە ڕوو. بەمجۆرە دەڵێم ئەمڕۆ یەك توێژەر نییە -لە هەر پسپۆڕییەکی زانستیدا بێت- بتوانێت لێکۆڵینەوەیەکی زانستی و بابەتی و

قەناعەتپێهێنەرمان لەبارەی ماهییەتی دیاردەی ئاینییەوە پێشکەش بکات. سەرباری بوونی هەموو جۆرە لێکۆڵینەوەیەکی وەسفی و دابەشکاری و پێناسەکان تا ئێستا هیچ ڕێگەیەك نییە بۆ قسەکردن لە بارەی دیاردەی ئایینی. مەبەستم هیچ ڕێگەیەك نییە بتوانێت ئەو کۆدەنگییە عەقڵییە بەدیبهێنێت کە سنووری هەموو ئایدیۆلۆژیاکان و هەموو ململانێ تەئویلی و ڕاڤەکارییەکانی نێوان ئایینەکان و مەزهەبە جیاوازەکان ببەزێنێت. (ئەمە دیدێکی ئەنترۆپۆلۆژیی بەرفراوانە نەك دیدێکی تایبەتیی بەرتەسك).

**دووەم: لەبەرچاوگرتنی دیاردەی ئایینی:**

ئەگەر عەلمانییەت یان هەڵوێستی عەلمانی سەبارەت بە ڕۆحی بەشەری پێشکەوتنێك پێکبهێنێت، ئەوا ئێمە لەم ئاستەدا هەموومان هاوچەرخی یەکتر نین. چونکە لە پەیوەستدا بە مەعریفەو گەیاندنی بە ئەوانی دی، دەبینین هێڵەکان یەکسان نین، ئینجا هەڵوێست و ئاستەکان جیاوازن. ئەم قسەیە بەسەر خودی یەك کۆمەڵگاشدا -بۆ نموونە کۆمەڵگای فەرەنسی- پراکتیك دەبێ، هەروەکو بە شێوەیەکی ڕێژەیی بەسەر کولتوورەکانی دیکە و کۆمەڵگاکانی دیکەشدا پراکتیك دەبێ وەکو ئەو کۆمەڵگایانەی ئیسلامیان تیادا بڵاوبۆتەوە.

ئێمە لەم لێکۆڵینەوەیەدا لە مەسەلەی "عەلمانییەت و ئایین" دەدوێین نەك مەسەلەی "ئیسلام و عەلمانییەت" کە پێشتر لە بارەیەوە دواوین، چونکە دەبێ دیدگامان سەرجەمگیرتر و فراوانتر بکەین بە جۆرێك نموونەی ئیسلام تێپەڕێنێ و بچێتە سەر ئاینەکانی تریش. ئێمە لێرەدا دەمانەوێ دیاردەی ئایینی وەك گشتێك لەبەرچاو بگرین نەك یەکێ لە دەرکەوتەکانی، بۆ نموونە ئیسلام یان مەسیحییەت.

لە واقیعدا نووسراوگەلێکی ئێجگار زۆر هەیە لەبارەی عەلمانییەت یان لەبارەی مەسیحییەت و عەلمانییەت، بەڵام ئەو لێکۆڵینەوانەی لەبارەی "عەلمانییەت و ئایین"ەوە نووسراون، زۆر نین. بۆچی؟ چونکە توێژینەوەی زانستی پێشکەوتووی خۆرئاوا -نەك تەنها لە بواری زانستە سرووشتییەکان، بەڵکو تەنانەت لە بواری زانستە مرۆڤایەتی و کۆمەڵایەتییەکانیشدا- زانیارییەك لە بارەی ئاین پێشکەش دەکات کە لە (مێژووی ئایینەکان)[13] دەرناچێت و ئەویش تەنها لە پەیمانگەی دەگمەن و زۆر تایبەتیدا قەتیس کراوە. بێگومان خوێندن لەو پەیمانگایانەدا بە زۆری لە بارەی مەسیحییەتەوەیە: واتە ئایینی ئەورووپا و بە گشتی خۆرئاوا. کەچی ئاینی ئیسلام جێهێڵراوە بۆ ئەو خۆرهەڵاتناسانەی لە زانکۆکانی فەرەنسە و خۆرئاوادا کۆمەڵێ توێژەری پەراوێزین. بەڵام خوێندنی ئایینەکانی دی یان زانیاری لەبارەی ئایینە ئەفریقاییەکان کەمترە، چونکە بەپێی قسەی ئەوان ئایینەکانی ئەفریقیا ئاینگەلێکی وەسەنی - پەیگانین[14] و وابەستەی عەقڵییەتێکی "سەرەتایی"ن و ئەمەش لە پسپۆڕیی ئیتنۆلۆجیایە[15] (واتە زانستی تایبەتمەندیی میللەتان و زمان و نەریتە کۆمەڵایەتییەکانیان..) ئەم زانستەش قابیلی هەڵکشان و داکشان و

گفتوگۆیە و ئامادەبوونێکی لاوازیشی لە زانکۆکاندا هەیە. دەتوانین تا ڕادەیەك هەمان شت لە بارەی ئایینەکانی ئاسیاش بڵێین، بۆ نموونە ئێمە بە شێوەیەکی دروست چ شتێك لەبارەی بوزی و هیندۆسی و زەردەشتی و مانەوی دەزانین؟ بێگومان زۆر کەم، بگرە لەوانەیە تەنانەت لەنێو ڕۆشنبیرانیشدا هیچ شتێکیان لەبارەوە نەزانرێت.

کەواتە، یەکێ لە دەرەنجامەکانی ئەوەی پێیدەوترێ (عەلمانییەت) یان (دونیایی) بریتییە لە دوورکەوتنەوەیەکی عەقڵی و زانستیی تەواوی کەرتێك لە کەرتەکانی مەعریفە (واتە: ئایین) ئەمە سەرباری ئەوەی ئەم کەرتە مەعریفییە (ئایین) ڕۆڵێکی بنچینەیی لە لەدایکبوونی مێژوویی کۆمەڵگاکانماندا بینیوە، لەوانە کۆمەڵگا ئەورووپی و خۆرئاواییەکانیش. ڕێك لێرەدا حاڵەتی ئیسلام بە سیفەتی بەرەنگارییەك دەردەکەوێت. ئیسلام لە ڕووی عەقڵی و کولتوورییەوە پەیوەستێکی زۆری بە فیکری ئەورووپی خۆرئاواییەوە هەیە. بەڵام وەك ئایین و وەك ڕێچکەی مێژوویی چەندین کۆمەڵگا کە زۆر بە کەمی لێکۆڵراوەتەوە و وەك ئەوەی ئاینێکە نەناسراوە و بگرە ڕەت کراوەتەوە و فڕێدراوەتە فەزای "خۆرهەڵاتی"ی گریمانکراو، ئەوا زۆر دوورە لە فەزای ئەورووپی خۆرئاوایی. دەبێ پرسیار لە هۆیەکانی ئەو دوورخستنەوەیە بکەین[16]، ئێمە تێبینی دەکەین ژمارەیەکی زۆری ئەنیستیتوتی "مێژووی ئایینەکان" لە خۆرئاوادا بەشی تایبەتییان بۆ ئیسلام تیا نییە.

**سێیەم: نموونەیەك بۆ ڕوونکردنەوە: حاڵەتی جەزائیر**

هەردوو چەمکی "عەلمانییەت" و "ئایین" دوو چەمکن زۆر دوورن لەوەی بە ڕوونی گەڵاڵە کرابن و خرابنە ڕوو و پاشان دوو چەمکی نائەکتیڤن، زۆرجار ئەو شتانەی لەبارەی ئەو دوو چەمکەوە دەیانڵێین گوتارێکی زانستی پێکناهێنن بەڵکو گوتاری کۆمەڵایەتین، ئێمە دەزانین جیاوازییەکی گەورە لە نێوان ئەو دوو تەرزە گوتارەدا هەیە کە دەبێ گوتاری زانستی زاڵبێت بەسەر گوتاری کۆمەڵایەتیدا و میکانیزمی ئیشکردن و پێکهاتەکەی دەربخات. ئامانجی گوتاری زانستی بە شێوەیەکی تایبەتی بریتییە لە دەرخستنی ئەوەی کە سەرجەمی کۆمەڵگا بەشەرییەکان بەبێ دەرهاویشتە هەوڵدەدەن بەر لەهەر شتێك نکوڵی لە زەمینە ڕاستەقینەکەی بوونی خۆیان بکەن. بە مانایەکی تر کۆمەڵگا دەمامك دەخاتە سەر حەقیقەتی ئەو هێزانەی تەحەکوم بە چارەنووسی مێژوویی دەکات لە ڕێگەی زمانێکی تایبەتی گونجاو بۆ ئەو کارە (واتە زمانێکی گونجاو بۆ پرۆسەی تەمویهی واقعی ڕاستەقینە)[17].

حاڵەتی جەزائیری، بەو شێوەیەی هێنری سانسون* بۆی خستووینەتە ڕوو، نموونەیەکی ڕوونکاریی چاکمان پێشکەش دەکات، ئەمە لەگەڵ گوتاری ڕەسمی باوی ئەمڕۆدا گونجاوە، واتە گوتارێکی ملکەچ بۆ ڕابردوو و بۆ گیروگرفتە سیاسییە هەنووکەییەکان. لە جەزائیر لە ساتەوەختی سەربەخۆییدا، هێزە کۆمەڵایەتی و ئایدیۆلۆژییەکان هەموویان بە یەك چەشن بە

ئاراستەی ئەو هێڵەدا نەدەڕۆیشتن کە لە ساڵی *1962* و لە دوای گرتنە دەستی دەسەڵات لەلایەن گرووپێك لە تێکۆشەران، سەرکەوت، بەڵکو تەوژم و ململانێ جیاوازەکان پێشتر و تەنانەت لە سەروبەندی جەنگیشدا لەنێو ڕیزەکانی بەرەی ڕزگاریدا دەرکەوتن، ئەوان لەبارەی کەسایەتیی ئیسلامی یان جەزائیریی ولاتەوە گفتوگۆیان دەکرد، بەو مانایەی ئایا ئەو کەسایەتییە، ئیسلامییە یان جەزائیری؟ ئەوسا تەوژمگەلێکی جیاواز هەبوون ململانێیان لەگەڵ یەکدیدا دەکرد:" لەوانە تەوژمی "عروبییەت" کە لەگەڵ هاتنی جەمال عەبدولناسر لە میسر ئەوانیش سەرکەوتن، هەروەها تەوژمی زانایانی ئایین کە بەپێی هێڵی سەلەفییە ئیسلامییەکان پێی لەسەر ئیسلامبوونی ولات دادەگرت، هەروەها کەمایەتییەکی شەرمنیش هەبوو باسیان لە ئینتیمای جەزائیری بۆ جەزائیر دەکرد، واتە لەبارەی جەزائیریبوونی جەزائیر دەدوان. بەلام جەزائیر لە ساتەوەختی جەنگی داگیرکاریدا لە ڕووی ئایدیۆلۆژییەوە کەم و زۆر خۆی بە دابڕاوی بینی، واتە لە ئایدیۆلۆژیاکان دابڕابوو، مەبەستم ئەوەیە لەو تەوژم و ڕەوتە عروبی و سەلەفییانە جیاکرابووەوە. ڕاستە دەنگدانەوەی بیرۆکەی کۆمەڵگای ئیسلامی لە ڕێگای زانایانی ئاینییەوە دەگەیشتە دانیشتووان، بەلام ئەوانە لە لایەن خودی دانیشتوانی جەزائیرەوە ڕووبەڕووی بەرگری دەبوونەوە.

بەمجۆرە پێویستە بە نیگای سۆسیۆلۆژیستێك و مێژوونووسێك تەماشای کۆمەڵگای جەزائیری بکەین نەك بە چاوی عەقائیدییەکی ئیسلامی وەك ئێستا دەیکەن هەر لەبەرئەوەی ئایدیۆلۆژیای ئیسلامی سەرکەوتووە. ئەوسا بۆمان دەردەکەوێت کە ئیسلام لە جەزائیردا بە چەند چەشنێك ئامادەبوونی هەیە کە بە شێوەیەکی تایبەتی ملکەچی کولتوورێکە وابەستەی ئەو توێژە کۆمەڵایەتییانەیە کە لە قۆناغی داگیرکاریدا کەموزۆر لە یەکدی دابڕابوون و هەروەها لە ڕابردوویەکی دوورتریشدا دیسان لە یەکدی دابڕابوون. لە واقیعدا کۆمەڵگای جەزائیری، وەکو گشت کۆمەڵگاکانی باکووری ئەفریقیا، کۆمەڵگایەکی خێڵەکیی پەرت و پارچەپارچەیە (دابەشبووەتە سەر چەندین خێڵ و عەشیرەت و خێزانی پاتریارکی). قۆناغی داگیرکاریش پارێزگاری لەو دوورگە کۆمەڵایەتی و کولتوورییە بچووك و لێکدی دابڕاوانە کردووە تا ئەو ئەندازەیەی ئیسلامی جەزائیری هەمان ئەو ئامادەبوونە یەکدەستی و عەقائیدی و ئایدیۆلۆژییەی نەبووە کە لە ساتەوەختی سەربەخۆییدا دەیبێت بە هۆی دەرکەوتنی دەوڵەتێکی بەهێز و ئیرادەگەریی زۆرەملێ و مەرکەزییەتی دەسەلات.

دەسەلاتی نوێی جەزائیری ویستی لەیەك کاتدا پشت بە ئینتیمای حەماسییانەی خۆی بۆ جیهانی عەرەبی (یان عروبییەت) و بۆ ئایدیۆلۆژیای ئیسلامی ببەستێ، واتە جەختکردن -بە هەمان هێزەوە- بۆ ئینیتمای ئایدیۆلۆژیای ئیسلامی زۆر زیاتر لە ئینتیمای بۆ ئیسلام. دەشێت ئەم هەڵوێستە یان ئەم ڕەفتارە یان بینینی شتەکان و سەپاندنیان لە لایەن دەسەلاتی نوێوە،

وەك كاردانەوەیەكی حەتمی لە دژی قۆناغی داگیركاری، تەفسیری بۆ بكەین. ئەمە پتر كاردانەوەیەك بوو وەك لەوەی بریتی بێت لە هەڵگرتنی بەرپرسیاریی واقیعی جەزائیری بە شێوەیەكی جدی و هاوسەنگ لە ڕووی كۆمەڵایەتی و كولتووری و مێژوویییەوە، دەڵێم هەڵگرتنی بەرپرسیارییەكەی لەلایەن دەوڵەتێكی بە فیعلی ئازاد.

دەبێ بە چاكی ئاگاداری ئەم خاڵە بین و لەبەرچاوی بگرین. ئەم ناڕێكی و ناهاوسەنگییە لە نێوان دوو شتدا نیشتەجێیە: لە نێوان وێناكردنی زۆرەملێیانەی دەوڵەت و كۆمەڵگای جەزائیریی پاش سەربەخۆیی وەك كاردانەوەی داگیركاری و، لە نێوان پەرەسەندنی سروشتی كۆمەڵگایەك هێز و توانای ناوەكی و دەنگە جۆراوجۆرەكانی لە پێناوی دروستكردنی مێژووی تایبەتی خۆیدا بەكاردەهێنێت. ئەم پەرەسەندنە سروشتییە دەبێ بەدەر لە فشارە دەرەكییەكان بە ئەنجام بگات، یەكەمین ئەو فشارە دەرەكییانەش بە تەبیعەتی حاڵ بریتییە لە ئایدیۆلۆژیای داگیركاری، پاشان ئایدیۆلۆژیای عروبەوی (واتە نەتەوەخوازییەكی زیادەڕۆیی– و.ك)، مەبەستم لەو ئایدیۆلۆژیایەیە كە لەگەڵ هاتنی سەردەمی جەمال عەبدولناسردا، سەركەوت. پاشان دەبێ ئەم پەرەسەندنە سروشتییە بەدوور لە ئایدیۆلۆژیای ئیسلامێكی دیاریكراو و وێناكراو بە ئەنجام بگات، ئەو ئایدیۆلۆژیا ئیسلامییە وێناكراوەی گوایە پاڵپشتێكی گەورەیە بۆ بەرەنگاربوونەوە لە دژی ئیمپریالیزمی داگیركاری. هەموو ئەمانە بەرەو ئەوەمان دەبەن بڵێین ئەو حاڵەتەی هێنری سانسۆن بۆمانی وەسف دەكات بریتییە لە بەرهەمی هێزە دەرەكییەكان زۆر زیاتر لەوەی بەرهەمی هێزە تایبەتییەكانی خودی كۆمەڵگای جەزائیری بێت بە هەموو فرەییە كۆمەڵایەتی و مێژووییەكەی و بەو شێوەیەی بە درێژایی سەدەكان شێوەی گرتووە و لەو كاتەوەش كە دیاردەی ئیسلامی و عەرەبی چووەتە نێو ئەو كۆمەڵگایەوە(18).


مارتن لوسەر

من بە ئەنقەست وشەی "دیاردە"م بەكارهێنا و وتم: "دیاردەی ئیسلامی" و بە ئاسانی نەمووت "ئیسلام"، ئەم جیاوازییەش لە چەمكدا گرنگیی خۆی هەیە. كاتێ وشەی "ئیسلام" بەكاردەهێنین، زاراوەیەك واژە دەكەین لە ڕووكاردا وادیارە چەمكێكی ڕوونی هەیە، یان وەك بڵێی هەركە ئەم زاراوەیەت دركاند ئیدی خەڵكی دەمودەست لێی تێدەگەن و دەتوانن بە ئاسانی بەكاری بێنن. ئەوان وا تێدەگەن ئەوەندە بەسە بگەڕێنەوە بۆ دەقە كلاسیكییە گەورەكان كە پێیان وایە ئەو دەقانە بۆیان ڕوون دەكاتەوە ئیسلام چییە. بەڵام ئەمە تەنها لە خەیاڵی ئەو چاودێرە بیانی و ئایدیۆلۆژیستانەدا هەیە كە بۆ ئەم مەبەستە تیۆرییەكان ئاوێتە دەكەن، بە تایبەتی لە فەرەنسەدا. ئەمانیش بۆ ئەوە ئەم كارە

دەکەن تا بیکەن بە پاساوێك بۆ مەیل و ئارەزووی جۆراوجۆری سیاسییانەی ئەو کرێکارە عەرەب و دوورە وڵاتانەی لە هەندەران دەژین، هەروەها بۆ ئیسلام و.. هتد، بێگومان قسەکانیان بە ئاسانی لەلای جەماوەری فەرەنسی وەك ڕاستییەکی ڕەها وەردەگیرێ. بەڵام لە واقیعدا ئەمە لەو خەیاڵکراوە سیاسی و کۆمەڵایەتییەوە بەرهەم هێنراوە کە بە تەواوی چاو لە ئاستی ئەو حەقیقە واقعییانە نابینا دەکات کە وشەی ئیسلام لە خۆی دەگرێ. لەبەرئەوە دەبێ بە هەموو ئالۆزییەکییەوە چاودێری "دیاردەکە" بکەین و لێی بکۆڵینەوە، بە چاوپۆشین لەو وێناکردنە "ڕوون" و سادەیەی لە بارەی ئەو دیاردەیەوە دەیخەنە ڕوو.

ئەوەی لێرەدا لە بارەی جەزائیرەوە دەیڵێم، دەکرێ فراوان و گشتی بکرێ و هەموو فەزای مەغریبی بگرێتەوە، تەنانەت لیبیا و مۆریتانیا و بیابانەکان تا دەگاتە کەنارەکانی ئەفریقیای ڕەش. ئەم کۆبوونەوە فراوانەی کۆمەڵگاکان دەخوازێت لە ڕووی زانستییەوە پێداچوونەوەیەکی کۆمەڵایەتی- مێژوویی بۆ ئەنجام بدرێت کە تا ئەمڕۆش زۆر دوورە لەوەی کاری بۆ کرابێت. بگرە هەندێ لایەنی ئەم پێداچوونەوەیە بە شێوەیەکی دروست دەرکی پێنەکراوە.

لە واقیعدا هیچ کۆمەڵگایەکی بەشەری نییە هەوڵی ئەوە نەدات واقیعە تایبەتییەکەی خۆی نەشارێتەوە و پەردەپۆشی نەکات، سا ئەو کۆمەڵگایە پێشکەوتوو بێت یان پاشکەوتوو. هەموو هەڵبژاردنەکانی ئەو دەوڵەتانەی بە "دیموکراسی"[19] ناوزەد دەکرێن لەسەر پرۆسەی ئەو پەردەپۆشکردنە دامەزراوە، مەبەستم پەردەپۆشکردن و شاردنەوەی واقیع. ئێمە لە میانی ئەزموونەکانەوە ئەم شتە دەزانین و درکی پێدەکەین. پاشان متمانەکردن بە گوتارەکانی بارەی ڕزگاریی نیشتمانیی جەزائیری بۆ خستنەڕووی وێنەیەك لە بارەی بونیادی کۆمەڵگای جەزائیری و میکانیزمی ئیشکردنی هەنووکەیی، یان بۆئەوەی بڵێین ئەم کۆمەڵگایە تایفەگەرایی یاخود عەلمانییە، ئەمە لە ڕاستیدا کەم یان زۆر لە خشتەبردن و فریودانە، ئەمە واتە ملکەچکردنێکی ڕاستەوخۆیە بۆ گوتارێك کە دەبێ بەر لەهەر شتێك دەست بە هەڵوەشاندنەوەی بکەین، دەبێ ئەو گوتارە ڕووت بکەینەوە بۆئەوەی ئەو پرۆسە و میکانیزمانە ئاشکرا بکەین کە لەپێناوی شاردنەوە و پەردەپۆشکردنی حەقیقەتە قووڵەکانی کۆمەڵگای جەزائیری بەکاریاندەهێنێت، سا هەر چەندێ ئایاتی قورئانی و فەرموودەکانی پێغەمبەر و وتەی گەورە پیاوانی ئاینی بهێننەوە لە خشتەم نابات و ئەمەش هیچ لە مەسەلەکە ناگۆڕێت. ئەمە سەبارەت بە کەسێکی وەك من کە لە ئامێزی میللەتێکی زۆر ساکاردا ژیاوە و گەورە بووە و پاشان جەنگە ڕزگاریخوازەکانی بینیوە، جۆرێك لە گەمەکردن بە واقیع دەنوێنێ. ئەوانەی ئەم گەمەیە دەکەن ئەو بکەرە کۆمەڵایەتییانەن کە لە پێناوی دەستبەسەرداگرتن و کۆنترۆڵکردنی سەرجەمی گۆڕەپانە سیاسییەکەدا بەربەرەکانی و ململانێ دەکەن.

ئەمە ڕێك ئەو حیزبە سیاسییانەی وڵاتانی ئەورووپای خۆرئاوایی دەیکەن کە دەیانەوێ ببن بە

حـــــیزبی دیموکراســــی، هـــــەروەها هـــیژە کۆمەڵایەتییـــەکانی جـــەزائیریش ئـــەم پرۆســـەیە ئەنجام دەدەن تا ئەگەر یەك تاکە حیزبیش هەبێت و بێدەنگی بەسەر ئەوانی دیکەدا بسەپێنێ، ئـەم حیزبە تاك و تاقانەیە لە هەموو شوێنەکانی دیکە ڕاشکاوانەتر سەرانسەری گۆڕەپانـە سیاسـییەکە مۆنۆپۆل دەکات، بەڵام گەمەکە هەر هەمان گەمەیە، تەنها گرەوێك کۆنترۆڵکردنی دەسەڵاتە، بۆئـەوەی بـەو ئامانجـەش بگـەن ئـەوا دەبـێ هـەموو ئـەو وەسیلانە بەکاربهێنن کە گرەوەکانی سیاسـەتیان بۆ دەخاتە سەرپشت و گرەوەکانی سیاسەتیان بۆ شی دەکاتـەوە، ئـەو "شیکردنەوە"یـەی کـە حزبـی فەرمانڕەوا پێشکەشی دەکات، یاخود ئەو حیزبەی دەخوازێ شـوێنی حـیزبی فـەرمانڕەوا بگرێتـەوە، ئـەوا بـە زەرورەت پرۆسـەیەك لـە پرۆسـەکانی شاردنەوە و پەردەپۆشکردن پێکدەهێنێ و دەمامك بەسەر حەقیقەتی شتەکاندا دەکات.

لە هەموو ئەو شتانەی لە سەرەوە ئاماژەمان پێ دان، پێدەچێ پێویست بەوە بکات بە تـەواوی تەرکیز بکەینە سەر شیکردنەوەیەکی وردبینانـەی سـەرجەم کایـەکانی ئـەو واقیعـەی کۆمەڵگایـەکی بەشەری پێکدەهێنێ، ئەمە بەرلەوەی بچینـە نێـو گوتارێك لە بارەی پەیوەندییەکانی نێوان کارکردی ئاینی و کارکردی سیاسی.

**چوارەم: ئایین لە فەزای کۆمەڵایەتیی مێژوویی:**

لێرەدا پێنج گۆڕەپـان یـان پێنـج کایـە هەیـە دەبێ هـەوڵ بدەیـن بـە دیقـەتێکی زۆرەوە باسـیان بکـەین و لێیـان بکۆڵینـەوە لـە پێنـاوی ئـەوەی بـە هێمنی و لەسەرخۆیی درێژە بە شیکردنەوەکەمان بدەین. ئێستا ئەو پێنج کایەیە دەژمێرم بێئـەوەی پلەدارییـەکی هـەرەمییان لـە نێواندا بکـەم، چونکـە ئەگـەر هـەر لـە سـەرەتاوە ئەمـەم کـرد ئـەوا ئێمـە لـە ڕووی ئایدیۆلۆژییـەوە خۆمـان لـەناو یـەکێکیاندا دیل دەکـەین. کەواتـە ئێسـتا هـەرچۆنێك هـات بـە هەرەمـەکی دەیـانژمێرم: (گۆڕەپـانی فیکـری)، (گۆڕەپـانی ئـاینی)، (گۆڕەپـانی سیاسـی)، (گۆڕەپـانی ئـابووری)، (گۆڕەپـانی کولتـووری)[20].

ئەم پێنج بوارە یان ئەم پێنج گۆڕەپانە سەرانسەری فەزای کۆمەڵایەتی مێژوویی پێکدەهێنن کە ئەمانە ئـەرکی خوێندنـەوەی ئـەو فـەزا کۆمەڵایـەتی مێژووییەیان دەکەوێتە سەرشان. مومکین نییە ئەم خوێندنەوەیەش بە باشترین شێوە ئەنجام بدرێت تەنـها ئەگـەر زانسـتی تـەئویل بـۆ تێگەشـتن لـە کۆمـەڵگاکانی کتێب پراکتـیزە بکـەین: واتـە ئـەو کۆمەڵگایانـەی لـە کتێبـی سرووشبەخشـەوە بەرهەمـهێنراون، هـۆی ئەمـەش دەگەڕێتـەوە بـۆ ئەوەی کە ڕێگەی ئێمە لە ئاوێزانبوون بە جیهان و کـارلێککردن لەگـەڵیدا پەیوەسـتە بـە تۆڕێکـی دەگمەن لە هەستپێکردن و دەرککردن، ئەو تۆڕە لە لایـەن زمـانی دایکـەوە گەڵاڵـە بـووە و چەسـپیوە. هـەموو زمـانێکیش بریتییـە لـە پارچـەکردن یـان برینـی ئەو واقیعەی تیایدا دەژین[21]. ئەم برین و پارچەکردنـە -بـەبێ خواسـتی خۆمـان- کۆمـەڵێ سـنوور و کۆمـەڵێ دەلالات دەخاتـە سـەر واقیـع، سـنوور و دەلالاتێـك کـە لـە لایـەن زمانـەوە سەپێنراون. لەبەرئەوە دەبینین زانستە مرۆڤایەتی

و کۆمەڵایەتییەکان تا ئاستێك لەوە دەچێ یەقینی نەبن. هەر لەبەرئەوەش خەباتی ئێمە لە پێناوی عەلمانییەت یان عەلمانیکردن لە هەموو شوێنێ زیاتر خۆی دەسەپێنێ، دیسان لەبەر ئەم هۆیە دەبینین زۆر زەحمەتە قسە لەسەر ئاین بکەین.

ئاین، یان ئاینەکان، لەهەر کۆمەڵگایەك، بریتییە لە چەندین ڕەگوڕیشەی درێژ. لێرەدا پێویست ناکات ئاینە پەیگانی (وەسەنی) و ئاینە تەوحیدییەکان (سرووش) جیابکەینەوە[22]، ئەم جیاکردنەوەیە کاتیگۆرییەکی تیۆلۆژی بەزۆر سەپێنراوە و هەمیشە بە شێوەیەکی دوانەیی (دیواڵتی) تۆڕە ئیدراکییەکەی یاخود ڕوانینەکەی خۆیمان بەسەردا دەسەپێنێ. تێڕوانینی عەلمانی ڕایدەگەیەنێ کە بەرەو قووڵایی شتەکان و بەرەو ڕەگەکان شۆڕدەبێتەوە لە پێناوی ئەوەی ڕوانینێکی دروست و ورد و دادپەروەرانە پێك بهێنێ. بێگومان ئێمە نامانەوێ هەموو شتەکان ئاوەژوو بکەینەوە، بەڵکو دەمانەوێ لە میانی تێڕوانینێکی دیکەی تازەدا بە هەموو شتەکاندا بچینەوە و سەرلەنوێ هەڵیانسەنگێنین. لە پشتی سنوورە تیۆلۆژییەکانەوە[23] دەبینین هەموو ئاینەکان نەك تەنها ڕوونکردنەوە و تەفسیرەکانیان پێشکەش بە ئینسان کردووە، بەڵکو ئەو وەڵامە عەمەلییانەشیان پێشکەش کردووە کە ڕاستەوخۆ قابیلی پراکتیك کردن و بەکارهێنانن بە تایبەتی لە پەیوەندیماندا بە بوون و بە کەسانی دی و بەو ژینگە فیزیاییەی دەوری داوین، بگرە تەنانەت بە هەموو گەردوونیشەوە، هەروەها بەو شتانەی کە بە "سەرووی سرووشت" ناودەبرێ، وتە ئەو شتانەی سرووشتی هەستپێکراو تێدەپەڕێنێ. ئاینەکان زۆر لەوە دوورتر دەڕۆن تا دەگەنە جیهانی سەروو سرووشت یان ئەودیوی سرووشت. ئەم وەڵامە وەکو بڵندگەراییەك و وەکو ڕاستییەك چاوی لێکراوە کە قابیلی گفتوگۆ نییە و هەروەها ئەمە مادەیەك نییە بۆ شیکردنەوەی زانستی لە لایەن عەقڵی بەشەریمانەوە، بەڵکو ئەمە لە بازنەی هەیبەت و هەژموونی عەقڵی بەشەری دەردەچێ، لەبەر ئەم هۆیە ئێمە تێکەڵ بە هەستیاریی زۆر قووڵی خۆمانی دەکەین نەك تەنها لە ڕێگەی زمانەوە بەڵکو لە ڕێگەی سرووت و پەرستنەکانیشەوە، واتە لە ڕێگەی ڕاهێنانێکی دیاریکراوی جەستەمانەوە (وەك ئەوەی، بۆ نموونە، لە نوێژکردندا هەیە).

ئێمە دەزانین کاتێك حەقیقەتەکان لەناو خۆماندا بەرجەستەتە دەکەین -بە مانای حەرفیی وشەی بەرجەستە-، واتە کاتێك لە جەستەماندا دەیتوێنینەوە، ئەوسا ئەو حەقیقەتانە بە شێوەیەکی کوللی و کۆتایی پەیوەست دەبێت بە کەینونەی قووڵی ئێمەوە و پاشان پەیوەست دەبێت بەو تۆڕە ئیدراکییەی دواجار تەحەکوم بە هەموو بوون و سلوکی ئێمەوە دەکات. کەواتە دەبێ لەم ئاستە قووڵ و ڕیشەدارەدا هەوڵبدەین لە بونیادی گۆڕەپانی ئاینی تێبگەین، هەروەها ئەو ڕێگەیەی کە ئەم گۆڕەپانە ئاینییە لە کۆمەڵگا بەشەرییە جیاجیاکاندا ڕۆڵی خۆی پرۆسە دەکات. بەم مانایە هەموو ئەو شتەی کە بە ئاینەکان ناوی دەبەین (واتە هەموو ئاینەکان بەبێ دەرهاویشتە) تەنها بریتییە لە چەشنگەلێك (انماط) بۆ ئەو

فۆرمیولا سرووتئامێز و پەرستنانەی کە یارمەتیی ئاوێتەکردنی حەقیقەتە بنچینەییەکان دەدات لە جەستەی ئێمەدا، واتە تێکەڵاوکردنی "حەقیقەتە" ئاینییەکان لە جەستەی مرۆڤدا. ئەو حەقیقەتانەی دواتر تەحەکوم بە سەرجەمی بوونی ئێمەوە دەکەن. بەمجۆرە دەبینین، بۆ نموونە، موسڵمان هەندێ جووڵانەوەی جەستەیی ئەنجام دەدات بۆ جێبەجێکردنی نوێژەکەی. مەسیحییەکیش هەندێ جووڵانەوەی تر جێبەجێ دەکات و بوزییەکیش جووڵانەوەی دیکە.. هتد. بیناسازییە ئاینییەکانیش لەسەر ئەم پەرستن و سرووتانە دادەمەزرێن. پاشان سیستەمە تیۆلۆژییە لاهوتییەکان شکڵیان گرت کە دواتر ئەرکی ئەو سیستمانە بریتی بوو لە تەفسیر و ڕوونکردنەوەی چەشنەکانی پەرستن. بەڵام لێرەدا زۆر گرنگە کە: ئەو چەشنە پەرستنانەی کە لە واقیعدا شتگەلی کولتووریی ئیحتیمالی یان ڕێکەوتئامێزی[24] دروست دەکات (واتە ئەو کولتوورەی لە بنەڕەتدا ملکەچی ئەگەر و ڕێکەوتەکانە) جیابکەینەوە لە: ئەو بونیادە ڕێساییە قووڵەی بە فیعلی کارمان تێدەکات. مەبەستم ئەمانە حەقیقەتی ئێمە پێکدەهێنن، ئێمە وەکو کۆمەڵێ بوونەوەری مرۆیی پەیوەست بە زمان و بەو تۆڕە هەستیاری و دەرککردنەی زمان لە خۆی دەگرێ.

دەشێت قسەکردنمان لەسەر گۆڕەپانی ئاینی زۆر درێژتر بێتەوە، بەڵام لێرە بەوەندە دەوەستین و دەڵێین: ئەگەر ئێستا هەوڵ بدەین ڕووبەڕووکردنەوەیەك یان بەراوردکارییەك لە نێوان گۆڕەپانی ئایینی و گۆڕەپانی فکریی عەقڵی بکەین، دەبینین ئەمەی دوایان چەند فۆرمێك یاخود چەند پێکهاتێکی زۆر جیاواز وەردەگرێ بەپێی هەمەجۆریی کولتوورییە بەشەرییەکان و هەروەها بەپێی چرکەساتە مێژووییە جیاوازەکانی خودی ئەو کولتوورە. با بۆ نموونە لێرەدا بیر لە گۆڕەپانی کولتووریی ئیسلام بکەینەوە. ئەگەر کەسێکی ئەورووپی خۆرئاوایی بیر لەم مەسەلەیە بکاتەوە، ئەوا دەبێ بەر لەهەر شتێك خاوەنی بیرێکی ورد بێت لە بارەی پێکهاتی عەقڵی کولتووری تایبەتییەکەی خۆی، چونکە مومکین نییە مرۆڤ بتوانێت لە پێکهاتەی عەقڵیی کولتوورێك تێبگات ئەگەر خاوەنی مەعریفەیەکی پێشوەخت نەبێ لە بارەی کولتوورەکەی خۆی. ئەمەش شتێکی زۆر پێویستە، چونکە ئەگەر ڕووناکبیر خاوەنی ئەو مەعریفەیە نەبێت ئەوا هەمیشە هەست بە شپرزەیی و هەڵەکردن دەکات.

لە سەرەتادا ئەم تێبینییە بنچینەییە دەخەمە ڕوو: ئەوەی کە بە "عەقڵ" ناوی دەبەین بە هیچ جۆرێ بە شێوەیەکی سەربەخۆ پرۆسەی کردارەکەی خۆی ناکات، بە پێچەوانەی ئەوەی لە مێژوویەکی دوورودرێژی فەلسەفەو لاهوت لە خۆرئاوای ئەورووپی و هەروەها لە ئیسلامیشدا ئەو وەهمەیان پێداوین. عەقڵ هەمیشە لە پەیوەندیدا بە خەیاڵ و خەیاڵکراو (متخیل *Limaginaire*) ڕۆڵی خۆی پرۆسە دەکات. ماوەیەکی کورتە تێبینی ئەوەمان کردووە کە مێژوونووسە نوێگەرەکان (بۆ نموونە جۆرج دۆبی) و سۆسیۆلۆژیستەکان دەستیان کردووە بە لێکۆڵینەوە لە "خەیاڵکراوی کۆمەڵایەتی" کە یەکێك لە ڕەهەندە

یەکلاکەرەوەکانی هەموو بوونێکی کۆمەڵایەتی پێکدەهێنێ. بەڵام هێشتا ئەم فزولە مەعریفییە شتێکی تازەیە و ئەم تێڕوانینە مەعریفییە لە سەیرکردنی شتەکاندا نەچۆتە ناو گۆڕەپانی عەقڵی و فکریی کۆمەڵگای فەرەنسی و ئەڵمانی و ئەمەریکی. ئێمە لە خۆرئاوادا هەر لە پاش سەدەکانی ناوەڕاستەوە لە ئامێزی "پەرستنی عەقڵانییەت"[25] پەروەردە بووین.

بەمجۆرە دەبینین کاتێ زانایەکی تیۆلۆژی قسە دەکات وامان نیشان دەدات کە بە ناوی عەقڵی باڵاوە قسە دەکات و هەر خۆی کەرەستە و مەنهەجەکانە، پاشان پێمان دەڵێ بە چ جۆرێ کتێبە پیرۆزەکان بە شێوەیەکی گونجاو بخوێنینەوە، ئەمەش لە زمانی لاتینیدا پێی دەوترێ: ئیمانێك بە دوای عەقڵبووندا دەگەڕێ. بەڵام کاتێ دیکارت سەری هەڵدا و فەلسەفە سەربەخۆیی خۆی بەدەستهێنا یان لەژێر چنگی عەقڵی تیۆلۆژی ڕزگاری بوو، کەچی سەروەریی عەقڵ زۆر بە توندی بنجی بەست. پێشتر عەقڵی تیۆلۆژی -لاهوتی لانی کەم دانی دەنا بە زەلیلی عەقڵ یان خاکەڕایی عەقڵ لە بەردەم پێدراوی سرووش و لە ڕاستیدا عەقڵ لە بەردەم سرووشدا دەچەمییەوە. بەڵام عەقڵی دیکارتی کە زۆر شانازیی پێدەکەین، سەروەریی خود جێگیر دەکات، تەنها سەروەریی خود و جگە لەو شتێکی تر سەروەر نییە. پاشان جۆرێك لە جیاکاری یان جیاکردنەوە دەچێتە ناو ئەو خودەوە؛ جیاکردنەوەی نێوان ئەو بەشە عەقڵانییەی تەرخان کراوە بۆ فکرێکی دادپەروەر و مەعریفەیەکی ڕاست و دروست و نێوان بەشی سۆزداری و خەیاڵی (بەپێی گوزارشتی کانت). لە سەدەی نۆزدەهەمدا -و بگرە تا ئەمڕۆش- ژمارەیەك کتێب لەو بوارەدا چاپکران. ئەو کتێبانەی جەخت لەوە دەکەن کە ئێستا لە خۆرئاوادا چیدی خورافە و سیحر و نوشتە نەماوە، ئەوەی کە لە ئەفریقیای ڕەش و هەندێ شوێنی تری دنیادا تا ئەمڕۆش وەکو خۆی ماوەتەوە. ئێستا لە خۆرئاوادا تەنها عەقڵانییەتی زانستی باڵادەستە و هەژموونی هەیە، لە هەموو کاتێکیش زیاتر لە سەردەمی عەلمانییەتدا ئەو عەقڵانییەتە زانستییە هەیمەنەی هەیە. لەم کەشوهەوایەدا و لەم گۆڕەپانە فکریی عەقڵانییەدا ئەو عەلمانییانە سەرهەڵدەدەن کە تەماحی ئەوەیان هەیە حەقیقەت بزانن و بیگەیەننە ئەوانی دی[26].

لە دوای ئەو هەموو شتەی باسم کردن، بارستایی ئەو ئاستەنگ و زەحمەتییانەمان بۆ دەردەکەوێ لە گەیشتن بە چرکەساتی ئاخاوتنی مەسیح کە بە زمانی ئارامی قسەی کردووە نەك بە زمانی گریکی، هەروەکو قەبەیی ئەو کێشەو زەحمەتییانەمان لە گەیشتن بە چرکەساتی یەکەمی گوتاری قورئانی بۆ دەردەکەوێ: واتە ئەو ئایەتە قورئانیانەی بۆ یەکەمجار و بە گوزارشتێکی زارەکی وتراون لە کۆمەڵگایەکدا نووسینی تێدا نەبووە یان زۆر بە کەمی هەبووە. مەبەستم کۆمەڵگایەك لە بنەڕەتدا پشتی بە نەقڵکردنی زارەکی دەبەست**. پاشان دەبێ کۆششێکی گەورەی دەرککردنی مێژوویی و هەستیاریی مێژوویی ئەنجام بدەین بۆئەوەی کاتیگۆری و

بابەتەکانی ئەو مەعریفەیە جێبهێڵین کە پۆزەتیڤیزمی سەدەی نۆزدە و جۆرێکی دیاریکراو لە جۆرەکانی مارکسیزم*** بە میرات بۆی بەجێهێشتووین. هەموو ئەمەش لە پێناوی گەیشتن بە شکڵگرتنی وێنەیەك یان بیرۆکەیەك لە بارەی چەشنی ئەو مەعریفەیەی لە کۆمەڵگا بەشەرییەکاندا باوبووە، ئەو کۆمەڵگایانەی (سرووش)یان تیادا سەری هەڵداوە. "کۆمەڵگاکانی کتێب" لە خۆرئاوای ئەورووپی و هەروەکو لەلای یەهودی و ئیسلامیشدا لەسەر رێسای "خوێندنەوەکان" (یان تەفسیرەکان بە کۆ) بۆ دیاردەی سرووش، ژیاون و کاریان کردووە.

ئەم دیاردەیەش (دیاردەی سرووش) هەندێ جار ئەوەندە بە سادەیی باسی دەکەین وەك بڵێی ئاسان و لەبەردەست بێت، بەڵام لە راستیدا ئەمە واقیعێکمان لە هەموو لایەنەکانیەوە لەژێر دەست دەردەهێنێ. لەگەڵ ئەوەشدا دەزانین کە مرۆڤ لە رەهەندە ئاینییەکەیەوە پەنا بۆ سرووش دەبات و لەوێوە بۆ شوێنێك دەگەڕی تا چارەسەرەکانی چنگ بکەوێت، ئەو چارەسەرانەی چیدی کولتوورە هاوچەرخەکانمان پێشکەشی ناکەن، بەڵام ئەوسا خۆمان بە تەنیا دەبینین و لە بەرامبەر دیاردەی سرووشدا لە هەموو چەکێ داماڵراوین؛ لە بەرامبەر دنیا و گەردوون: گەردوونی سرووش[27]. ئەو توانایانەی ئەمرۆ لەبەردەستمانە بۆ چوونە ناو سرووش و تێگەیشتن لێی، زۆر کەمترە لەو توانایانەی کەسانی پێشووی ئێمە -ئەوانەی لە سەدەکانی ناوەڕاستدا ژیاون- هەیانبووە. کەسانی پێش ئێمە لە زەمەنێکدا ژیاون سیستمێکی مەعریفیی وای تیادا باو بووە کە بۆ ئاتاج و پێداویستییەکانی خۆیان گونجاو بووە. هەروەها رەهەندی خوداوەندیی ئیعجازی و سروشت بڕ، بە هیچ جۆرێ نە لە لایەنی سیاسی و نە لە لایەنی عەقڵی ڕووبەڕووی گومان و ناڕەزایی نەبووەتەوە وەك ئەوەی لە سەدەی شانزەهەمەوە تا ئەمرۆ لە ئەورووپای خۆرئاوادا ڕووبەڕووی دەبێتەوە.

دەبینین لێرەدا گۆڕەپانی سیاسی ڕۆڵێکی یەکلاکەرەوە دەبینێ بە بەراورد لەگەڵ گۆڕەپانی فکری و عەقڵی و هەروەها بە بەراورد لەگەڵ گۆڕەپانی ئاینی. هەروەکو هیچ وەسیلەیەکمان نییە بۆ دانانی پلەدارییەکی هەرەمی نێوان ئەو گۆڕەپانە جیاجیانە. بە چ جۆرێ دەشێت ئەوە دیاری بکەین کە ئاخۆ هێزی سیاسیی دەوڵەتی خەلیفە پێکهاتێکی دیاریکراوی گۆڕەپانی فکری و گۆڕەپانی ئاینی ئیسلامی سەپاندووە، یان بە پێچەوانەوە دوو گۆڕەپانەکەی دی (فکری و ئاینی) دەوریان لە شکڵگرتن و سەپاندنی هێزی سیاسیدا هەبووە. لێرەدا دەبینین گرفتی پەیوەندییەکانی نێوان ئاین و سیاسەت بە سەرجەمگیری خۆی دەخاتە ڕوو و ئێمە ناتوانین بە ئاسانی یەکێکیان بەسەر ئەوی تریاندا زاڵ بکەین وەك هەندێ کەس ئەمە دەکەن. ئەگەر ئێمە پێشوەختە مەسەلەکەمان یەکلاکردەوە ئەوسا لە زەمینەی شیکاری دوور دەکەوینەوە و ڕاستەوخۆ دەکەوینە ناو ڕووبەری خەیاڵ یان خەیاڵکراو یان ئایدیۆلۆژیاوە[28].

شتەکان لە خەیاڵدا یان لە خەیاڵکراودا زۆر بە ئاسوودەیی مومارەسەی ڕۆڵی خۆیان دەکەن.

ئەگەر بڵێم -وەك زۆرجار موسڵمانەکان دەڵێن- لە دنیادا دەسەڵاتێکی سیاسی نییە کە بە دەسەڵاتی خوداوەندییەوە نەبەستراییتەوە و ملکەچی دەسەڵاتی خودایی نەبێت، ئەوا دەکەومە ئامێزی خەیاڵکراوێکی (متخیل) بەرین و گەورەوە[29] (واتە من بە تەواوی لە زەمینەی واقیع دوور دەکەومەوە). مرۆڤ هەر ئەوەندەی کەمێك چاوەکانی بکاتەوە یەکسەر بۆی دەردەکەوێ پێچەوانەی ئەمە ڕاستە، لە ڕاستیدا ڕژێمە سیاسییە گرژ و ستەمکارەکان کە پشت بە هێزێکی سیستماتیزەکراوی مۆدێرن دەبەستن (وەك دەزگای پۆلیس و سوپا و ڕاگەیاندن) لە ڕێگەی ئاینەوە مومارەسەی دەسەڵاتی زۆردارییانەی خۆیان دەکەن. لە واقیعدا ئاین بە فیعلی هەژموونی هەیە بەڵام لە هیچ شوێنێکدا حوکم ناکات****. لەگەڵ ئەوەشدا گوتاری کۆمەڵایەتی[30] دەڵێ خودا یان ئاینی سرووشبەخش حوکم دەکات یان دەبێ حوکم بکات. بەڵام واقیعی حاڵ ئەو گوتەیە یان ئەو گوتارە بە درۆ دەخاتەوە و دەڵێ حاکمە فعلییەکان بە هیچ جۆرێ ملکەچی ئاخاوتنی خودا نین و تەنانەت لە سەدەکانی ناوەڕاستیشدا ملکەچی نەبوون.

لێرەوە و ڕێك لەم خاڵەوە دەگەینە بەنێویەکداچوونی بەردەوامی نێوان خەیاڵی و/ عەقڵانی. ئەوەی بە ئاخاوتنی خودا ناوی دەبەین له واقیعدا بریتییە لە کۆمەڵە دەقێك (لە تەورات و ئینجیلەکان و قورئان) و ئەو دەقانەش بۆ تەفسیرەکانی پیاوانی ئاین و ئەو فوقەهایانە جێهێڵراوە کە مانا و دەلالەتەکانی دیاری دەکەن. بەڵام ئایا ئەو فوقەهایانە کێن و نوێنەرایەتیی چی دەکەن؟ لە قۆناغی کلاسیکیی مێژووی فیکری ئیسلامیدا لایەنگرانی زانستە ئاینییەکان لە بەرامبەر لایەنگرانی زانستە عەقڵییەکان (واتە ئەو فەیلەسووف و کەلامبێژانەی کەوتبوونە ژێر



فێرنان برۆدیل

کاریگەریی فەلسەفەی ئەرستۆتالیسەوە) ڕادەوەستان. ململانێی نێوان ئەو دوو ئاراستەیەش بارستایی و سنووری ئەو شتەی دیاری دەکرد کە من بە (عەقڵی ئیسلامی)[31] ناوم بردووە و هەروەها دیاریکردنی شێوەی پێکهات و میکانیزمی ئیشکردنەکەی. ئەمەش دەمانگەڕێنێتەوە بۆ زمان و کولتوور و تێکڕای ئەو شتانەی پێشتر لە بارەی ڕێگەی ئیشکردن و میکانیزمی گۆڕەپانی فیکریی کۆمەڵگایەکی بەشەریی دیاریکراودا وتمان. بە مانایەکی تر، ئەمە دەمانگەڕێنێتەوە بۆ دەسەڵاتی زمان و ئەو تەئویل و تەفسیرانەی هێزە کۆمەڵایەتییەکان دروستیان کردووە، ئەو هێزە کۆمەڵایەتییانەی لە ململانێدان لە پێناوی کۆنترۆڵکردنی گۆڕەپانی سیاسی و پاشان دەستگرتن بەسەر گۆڕەپانی فیکریشدا. لەبەر ئەم هۆیە دەبینین وتنی ئەوەی کە "ئەم یان

ئەو حكوومەتە لە كۆنتێكستی (سیاقی) مەسیحی یان ئیسلامی یان هەر سیاقێكی تر، پشتی بە ئیرادەی خودا بەستووە" واتە كەوتنە نێو جۆرێك لە خەیاڵ یان خەیاڵكراو. بەڵام بێگومان ئەمە خەیاڵكراوێكی پێویستە لە پێناوی ڕێكردنی كۆمەڵگا و میكانیزمی ئیشكردن. هیچ كۆمەڵگایەكی بەشەری نییە ڕۆڵی خۆی -بەبێ پێكهێنانی خەیاڵكراوێك- بە شێوەیەكی جیاواز پرۆسە بكات. تەنانەت ڕژێمی كۆماریش[32] پێویستی بە "خەیاڵكراو" هەیە بۆئەوەی كارەكانی بە ڕێكوپێكی بڕوات. بەڵام دەبێ ئاگاداری ئەم ڕاستییە بین و بیهێنینە نێو بازنەی ڕووناكییەوە بە تایبەتی ئەوكاتەی ڕووبەڕووی لێكۆڵینەوەی پەیوەندییەكانی نێوان ئاین و سیاسەت و كۆمەڵگا و هەڵسەنگاندنی ئەو پەیوەندییە دەبینەوە.

لەژێر ڕۆشنایی ئەو تێبینییانەی سەرەوەدا پێدەچێ كارێكی بێهودە بێت هەموو جارێ وەكو تووتی ئەوە دووپات بكەینەوە كە ئیسلام كاركردی سیاسی و كاركردی ڕۆحی لەگەڵ یەكدی تێكەڵ دەكات، سەرباری ئەمە، دەبینین ئەم چەشنە وتەیە زۆر باوە و وەك بڵێی عەقیدەیەكی ڕەها بێت[33]، و بگرە پێیان وایە ئەمە وتەیەكی عەقڵانییە! تەنانەت ئەو زانا ئیسلامیناسە خۆرئاواییانەی هاوچەرخی ئێمەن هەمان ئەو وتەیە دەڵێنەوە. بێگومان ئەم جۆرە تێكەڵكردنەی نێوان فاكتەری سیاسی و فاكتەری ئاینی بوونی هەیە، بەڵام ئەمە بەرهەمی ئیسلامێكی خەیاڵییە لە لایەن فوقەها موسڵمانەكانەوە، كە پاشان خۆرهەڵاتناسەكان دێن و ئەو بیرۆكەیە وەردەگرن و وەكو خۆی دەیڵێنەوە.

ئەم تێكەڵكردنە لە ڕاستیدا -بە شێوەیەكی واقعی و هەستپێكراو- بەرهەمی ئەو بەنێویەكداچوونەی گۆڕەپانی ئاینی و گۆڕەپانی فیكری و گۆڕەپانی سیاسییە كە كۆنترۆڵ نەكراوە. لە واقیعدا كۆنترۆڵكردنی ئەو گۆڕەپانانەی كۆمەڵگا پێكدەهێنن پشت بە سرووشی یەكەم نابەستێ، هەروەكو ناشچێتە سەر جەوهەری هیچ ئاینێك، بەڵكو پشت بەو ڕێگەیە یان بەو شێوازە دەبەستێ كە تیایدا تێگەیشتن لە پەیامێك شكڵ دەگرێ، سا ئەو پەیامە ئاینی بێت یان سیاسی، هەروەها پشت بە شێوەی پراكتیزەكردن و ئاوێزانبوونی لە كۆمەڵگادا دەبەستێ. كەواتە شتی گرنگ لێرەدا ئەمەیە: دەبێ تەماشای جۆری ئەو مەرجە مێژووییە هەستپێكراوە بكەین كە زەمینەی بۆ ئیسلام خۆش كرد لە كۆمەڵگا بەشەرییە جۆراوجۆرەكاندا ئاوێزان بێت و گەشە بكات. بۆ ئەوەی بە چاكی لەم خاڵەش تێبگەین دەبێ فاكتەرێكی تر بهێنینە نێو شیكردنەوەوە و نهێنییەكانی ڕەگەزێكی تر بكەینەوە كە تا ئێستا ناومان نەهێناوە، ئەویش: فاكتەری ئابووری یان گۆڕەپانی ئابوورییە.

لەم ئاستەدا من بە جۆرێك لە ڕێزگرتن و هاوكات جۆرێك لە وریایی سەیری ڕۆڵی ماركسیزم لە بواری فیكردا دەكەم. لە ڕاستیدا شتێكی پێویستە كە تەركیز بكەینە سەر فاكتەری ئابووری، دەشتوانین بڵێین كە گۆڕەپانی ئابووری گرنگییەكی گەورەی هەیە بێئەوەی مەبەستمان ئەوە بێت فاكتەری ئابووری بكەین بە كلیلی كردنەوەی هەموو شتێك. سەبارەت بەم بوارە -واتە

بواری ئابووری– دەبێ بە مسۆگەری ئاماژە بۆ بایەخی ئەو دەورە گرنگە بکەین کە بورژوازی بینیویەتی، کە لەناو چینەکانی دیکەدا چینێکی کۆمەڵایەتییە. ئەم چینە –واتە بورژوازی– دەورێکی یەکلاکەرەوەی بینیوە لە جێلەقکردنی سنوورەکانی نێوان گۆڕەپانی ئاینی و گۆڕەپانی فیکری و گۆڕەپانی سیاسی لە خۆرئاوای ئەورووپیدا. بەڵام شیکردنەوەکانی ئێمە لێرەدا شیکردنەوەیەکی لاواز و ناتەواوە چونکە ئەو چارەنووسە جیاوازە لەبەرچاو ناگرێت کە بورژوازی لە کۆمەڵگا ئیسلامییەکاندا دووچاری بوو، کەواتە دەبێ لەناو تێڕوانینی شیکردنەوەیەکی بەراوردکاریدا بین و کۆمەڵگا بەشەرییەکان لەگەڵ یەکدی بەراورد بکەین نەك تەنها تەرکیز بکەینە سەر نموونەی خۆرئاوای ئەورووپی[34].

دەبێ خوێنەر ئەوە بزانێت کە ئیسلام قۆناغی لەدایکبوونی چینێکی بورژوازیی دیاریکراوی بینیوە و هەقی ئەوەمان هەیە باسی ئەم چینە بکەین و دەوری لە پێشکەوتنی کۆمەڵگا ئیسلامییەکاندا پیشان بدەین. ئەو چینە بورژوازییەکی بازرگانیی ناسەرمایەداری بوو –بە مانا خۆرئاواییەکەی– و لە دەوری بازرگانیکردنی شتومەکدا دەجووڵایەوە. ئەم بازرگانییە لە ئۆقیانووسی هیندییەوە تا خوارووی فەرەنسا درێژ دەبووەوە و لە ڕێگای بیابانەکانەوە بە ئیسپانیادا تێدەپەڕی، لە سەدەی سێیەمی کۆچییەوە تا سەدەی پێنجەمی کۆچی (واتە لە نێوان سەدەی نۆیەم و سەدەی یانزەیەمی زاینی) بەردەوام بووە و بووەتە مایەی دەوڵەمەندیی ئابووریی پایتەختە گەورەکانی دنیای ئیسلامی؛ بۆ نموونە: تاران و ئەسفەهان و شیراز لە ئێران، بەغدا و بەسرە لە عێراق، دیمەشق لە سوریە.. هتد.

ئەو بورژوازییەی لە خۆرئاوادا دیمەنی شانۆی فیکری و کولتووریی سەپاند، ئەویش بەروبوومی پێشکەوتنێکی مێژوویی دیاریکراوە. ئەو دیاردە گرنگەی کە شایستەی ئەوەیە لێرەدا تۆماری بکەین ئەوەیە کە: بوۆژوازی لە ئەورووپای خۆرئاوادا هەر لە سەدەی شانزەهەمەوە بەردەوامییەکی بێ پسانەوەی بەخۆوە بینیوە بە پێچەوانەی دنیای ئیسلامییەوە کە تا ڕادەیەکی زۆر پچڕپچڕ بووە[35]. ئەورووپا لەو کاتەوە سەرهەڵدانی چینێکی کۆمەڵایەتیی چالاکی بەخۆوە بینیوە، لە سەرەتادا بازرگانی بوو پاشان بوو بە چینێکی سەرمایەداری و پیشەسازی و ئیدی ئەو دۆخە تا ئەمڕۆ بەردەوام بووە. بەمجۆرە بورژوازی وردە وردە بازنەیەکی سەربەخۆی بۆ چالاکیی ئابوری کردەوە. ئەم ڕووداوە تا ئاستێك دیاردەیەکی لۆکاڵی و درەنگوەخت پێکدەهێنێ و دەتوانین وەك ڕووداوێکی لابەلای ناو ڕووداوەکانی مێژوو لێی بکۆڵینەوە، بەڵام مارکس تێکڕای تیۆرییەکەی خۆی لەسەر ئەم ڕووداوە بنیات نا: بەمجۆرە ئەورووپا توانی بازنەیەکی سەربەخۆ (یان گۆڕەپانێکی سەربەخۆ) بۆ ئابووری بکاتەوە و هاوکات مومکین بوو بازنەیەکی سیاسی سەربەخۆ و جیاواز لە بازنەی ئاینی دابمەزرێنرێ، بە تەریبی لەگەڵ ئەم پرۆسەیەدا بازنەیەکی

ڕۆشنبیری و كولتووریی زۆر گەورەتر لە بازنەی ئاینی پێكهێنرا. هەموو ئەو بازنە جیاواز و سەربەخۆیانە شتێكیان پێكهێنا كە ئەمڕۆ پێی دەڵێین: خۆرئاوا[36]. ئەم جیاوازی و ئەم جیاكارییە ئەوەندە بەهێز و ڕوون بوو كە ئیدی نەماندەتوانی ئەم بەشەی دنیا بە دنیای مەسیحی وەسف بكەین و ئەم بەشە پێشكەوتووەی دنیا بە جیهانی مەسیحییەت ناوببەین.

ئەمڕۆ ئەو پرۆسە مێژووییە و ئەو پێشكەوتنە بنچینەییە زۆر بە باشی ناسراوە بە تایبەتی بە هۆی لێكۆڵینەوەكانی مێژوونووسانی گەورەی وەكو، بۆ نموونە، فیرنان برۆدێل. بەمجۆرە شتێك شكڵی گرت كە ئەم مێژوونووسە گەورەیە (واتە فیرنان برۆدێل) پێی دەڵێ: "شارستانییەتی ماتریالی خۆرئاوا"[37]. لە ئاكامی ئەم پرۆسە مێژووییە گرنگەشدا گۆڕەپانی ئاینی ناچار بوو فۆرمێكی تر و پێكهاتێكی تر وەربگرێ[38]. هەروەها ناچار بوو بە شێوەیەكی جیاواز شوێنگەی خۆی بگرێ بە بەراورد بەو گۆڕەپانانەی پێشتر ناومان هێنان و ئەوانەی كە بورژوازی ئازادی كردن و كردنی بە گۆڕەپانی سەربەخۆ، بە تایبەتی گۆڕەپانی ئابووری و ئەو گۆڕەپانە ئایدیۆلۆژییەی یاوەریی دەكرد.

## پەراوێزەكانی ئاركۆن:

*لە بارەی ئەم مەسەلەیە بڕوانە ئەو دۆسییەیەی كە هێنری سانسۆن لەسەر جەزائیر خستیەڕوو بە ناونیشانی: (جەزائیر: كۆمەڵگایەكی تائیفی، لەگەڵ ئەوەشدا عەلمانی).

**لێرەدا بە ئەنقەست دەستەواژەی زارەكی یان "دەستەواژەی تێكستە زارەكییەكان" بەكاردەهێنم بۆئەوەی خوێنەر لە بایەخ و گرنگی لایەنی زمانەوانی كتێبە پیرۆزەكان ئاگادار بكەمەوە، هەروەها بۆئەوەی خوێنەر بگەڕێنمەوە بۆ حەقیقەتی كولتووری و زمانەوانیی ئەو هەلومەرجە مێژووییانەی بۆ یەكەمین جار ئایەتە قورئانییەكانی تیادا وتراوە (–هۆیەكانی دابەزین– اسباب النزول) و ئەوەندە بەس نییە ئاماژە بۆ نوسخەی قورئان بكرێ وەك ئەمڕۆ ئەوە دەكەن. ئەو نوسخەیەی بە (مصحف) ناودەبرێ بریتییە لە دەقی نووسراو نەك ئاخاوتنێكی زارەكی ئازاد كە لە سەرەتادا هەبووە. ئەمەش بە تەواوی مەرجەكانی تێگەیشتنی قسەی خودا و تەفسیر و بەكارهێنانی دەگۆڕێت. چونكە پرۆسەی گواستنەوە لە قۆناغی تێكستی زارەكییەوە بۆ قۆناغی تێكستی نووسرا و بە مسۆگەری دەبێتە مایەی ونبوونی بەشێك لە مانا.

***من لێرەدا هێرش ناكەمە سەر هەڵوێستێكی مەعریفی و فەلسەفەیەكی سەنگین لە خۆیدا، بەڵكو هێرش دەكەمە سەر ئایدیۆلۆژیای كۆمۆنیزم كە بەشداربووە لە بڵاوكردنەوەی ئەو حوكمە پێشوەختانەی عەقڵانییەت، ئەمەش لەمیانی ئەو گوتارە ناودارەیەوە كە لە ناواخنیدا لە هەموو گوتارێكی دیكە زیاتر چەندێتییەكی زۆری خەیاڵ و خەیاڵكراو هەڵدەگرێ.

****هێنری سانسۆن لەو لێكۆڵینەوەیەدا ئەم مەسەلەیەی ڕوونكردۆتەوە كە لە بارەی حاڵەتی جەزائیرەوە نووسیویەتی.

## پەراوێزەكانی هاشم سالّح:

*1*–ئاشكرایە ئەو جەماوەرەی محەمەد ئاركۆن قسەیان بۆ دەكات جەماوەرێكی فەرەنسییە، یان جەماوەری توێژەران و ئەو كەسانەی بایەخ بەم مەسەلانە دەدەن و موتابەعەی ئەو سیمینارانە دەكەن كە سێنتەری تۆماس مۆر لە نزیك شاری لیۆن رێكی دەخات. عادەتی ئاركۆن ئەوەیە كاتێ قسە بۆ جەماوەرێك دەكات زیاتر رەخنە لە كەموكورتییەكانیان دەگرێت نەك موجامەلەیان بكات و كارە باشەكانیان بژمێرێ. بۆ نموونە كاتێ قسە بۆ موسڵمانان و عەرەبەكان دەكات، رەخنەیان لێ دەگرێ و ئەو وێنە هەڵەیەیان نیشان دەدات كە لە بارەی خۆیان و لە بارەی ئەوروپییەكانەوە هەڵیان گرتووە. كاتێكیش قسە بۆ جەماوەرێكی ئەوروپی یان فەرەنسی دەكات، رەخنە لەو وێنە سەلبییە دەگرێ كە ئەوان لەسەر موسڵمانان و عەرەب هەیانە. لێرەدا خەوشی فەرەنسییەكان دەردەخات كە لە ماوەی ئەزموونی دووردرێژیان لە داگیركردنی جەزائیردا پەند و عیبرەتیان وەرنەگرتووە، واتە (دیالۆگی كولتوورەكان)یان دروست نەكردووە كە دەبوایە دیالۆگی رۆشنبیریان لەگەڵ عەرەب و ئیسلامدا دابمەزراندایە، لەوانەیە هۆی ئەمە بگەرێتەوە بۆ ئەو هەستەی كە كەسی پێشكەوتوو و بڵند و سەركەتوو پێی وایە لە پێش كەسێكەوەیە كە كەمتر پێشكەوتنی بەخۆوە بینیوە. بەڵام ئەمەش پاساو نییە بۆ هۆی دواكەوتنی ئەو دیالۆگە چاوەڕوانكراوەی: عەرەبی–ئەوروپی، یان بە گشتی دیالۆگی ئیسلامی–ئەوروپی.

*2*–لێرەدا مەبەست لە ئیپستیمۆلۆژیا (*Epstemologie*) زانستی تیۆری مەعریفە، یان فەلسەفەی مەعریفەیە، نەك مەعریفە لە خۆیدا، بەڵكو ئەو مەرجە سەرەتاییانەی وا لە مەعریفە دەكات شیاوی هەبوون بێت. لێرەدا ئاركۆن بانگەشەی ئیپستیمۆلۆژیایەكی نوێ دەكات كە دژی ئیپستیمۆلۆژیای رابردووگەرایی یان كلاسیكییە. ئەم ئیپستیمۆلۆژیا نوێیە ئەمڕۆ لەسەر دەستی ژمارەیەك لە توێژەرە پێشەنگەكان لە سەرانسەری دنیادا گەلاڵە دەبێت و زۆر لە جاران فراوانتر و قبوڵكراوترە، چونكە دەیەوێ ئەو سنوورە چەسپیوانە بسڕێتەوە كە كولتوور و میللەتە جیاواز جیاوازەكان لە یەكتر دەترازێنێ. هەروەها ئەمە ئیپستیمۆلۆژیایەكی رەخنەگرانەیە، واتە ئامادەیە بەردەوام بگەڕێتەوە بۆ هەنگاوەكانی پێشووی لە پێناوی راستكردنەوەی هەڵەكانی. دیسان ئەمە ئیپستیمۆلۆژیایەكی كراوە و دینامیكییە نەك داخراو و ستاتیك.

*3*–واتە بە هۆی ئەوەی كە ئاركۆن لە خێزانێكی ئیسلامی و لەنێو كەلەپوورێكی ئیسلامی (لە جەزائیر) لەدایك بووە و گەورە بووە. بیرۆكەی باوی جەماوەری گشتیی خۆرئاواش ئەوەیە كە:" مومكین نییە موسڵمان ببێت بە كەسێكی عەلمانی كەچی مەسیحییەك یان جولەكەیەك بە ئاسانی دەبێت بە كەسێكی عەلمانی". هەموو هەوڵی ئاركۆنیش ئەوەیە تا پێچەوانەی ئەمە بسەلمێنێت: واتە موسڵمانیش هەروەكو جولەكە و مەسیحی دەتوانێت ببێت بە عەلمانی، موسڵمان لە رابردوودا –ئەوكاتەی خاوەنی شارستانییەت بووە– ئەم مەسەلەیەی سەلماندووە.

*4*–ئەمە مانای وایە چەمکی عەلمانییەت، بەپێی ئارکۆن، هاوواتای چەمکی ئازادییە. بەڵام ئازادی و هەروەها عەلمانییەتیش هەمیشە مەرجدارن، ئەگەرچی ئەو مەرجدارییە لە کۆمەڵگایەکەوە بۆ کۆمەڵگایەکی تر و لە سەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی تر جیاوازە. بۆ نموونە دەتوانین بڵێین عەلمانییەت لە ڕۆژگاری مەئمون و موعتەزیلەدا بوونی هەبووە، زۆر زیاتر لەوەی ئەمڕۆکە لە زۆربەی وڵاتە عەرەبی و ئیسلامییەکاندا هەیە. ئەو پرسیارانەی موعتەزیلەکان لەو سەروبەندەدا ڕووبەڕووی قورئانیان کردەوە، مومکین نییە ئەمڕۆ پرسیارگەلێکی لەوجۆرە لە هیچ ناوەندێکی کولتووریی عەرەبی یان ئیسلامی بخرێتەڕوو. پاشان عەلمانییەت، بە دیاریکراوی، بریتییە لە هەڵوێست لە بەرامبەر مەعریفەدا. ئەمە هەڵوێستێکە دەیەوێت تا ئەندازەیەکی گەورە ئازاد و کراوە بێت، یان تا ئەو ئەندازەیەی نەك تەنها مەرجە سیاسی و کۆمەڵایەتییەکان ڕێگەی پێدەدەن، بەڵکو ئەو پێشکەوتنە مەنهەجیی و مەعریفی و تەکنیکییەش کە لە زەمەنێك لە زەمەنەکان یان لە شوێنێکدا باو و بڵاوە. لە بەرامبەردا دەتوانین بڵێین زەحمەتە –ئەگەر نەڵێین مەحاڵە– بە شێوەیەکی بابەتی و ماقووڵ باسی ئیسلام و شارستانییەتەکەی بکەین لە بەردەم جەماوەرێکی ڕاسترەوی پەرگیری فەرەنسیدا. هەروەکو مەحاڵیشە بە شێوەیەکی مێژوویی باسی فیرقە ئیسلامییە جیاوازەکان بکەین لە بەردەم جەماوەرێکدا کە پێکهاتبن لە کەسانی ناو ئیخوان موسلمین یان فەندەمینتالیستە شیعەکان یان ئەو فیرقە ئیسلامییانەی تر کە لەسەر یەقینیاتی دۆگمایی و ئەرتۆدۆکسی خۆیاندا نووستوون.

*5*–ئەمە ناگەڕێتەوە بۆ ئەو حوکمە پێشوەختەی گوایە ڕەگەزی ئەورووپی مەسیحی بە شێوەیەکی جەوهەری و ئەزەلی لە سەرووی ڕەگەزی عەرەبی ئیسلامییەوەیە.

*6*–لێرەدا ئارکۆن مەبەستی لە دابەشکردنی یاسایی: جیاکردنەوەی کەنیسەیە لە دەوڵەت. ئارکۆن پێی وایە عەلمانییەت شتێکە زۆر لەمە گەورەتر و قووڵتر و فراوانترە. ڕاستە جیاکردنەوەی ئاین لە دەوڵەت زۆر پێویستە بۆئەوەی یەکسانی لە نێوان هاووڵاتیاندا بێتە دی و چینێکی پتەوی کۆمەڵگای مەدەنی پێکبهێنرێ، بەڵام عەلمانییەت هەموو ئەمانە دەگرێتەوە و هاوکات دوورتریش دەڕوا وەك دواتر ڕون دەبێتەوە. بەهەرحاڵ، فەڕەنسە ماوەیەکی زۆرە ئەو ئەرکانەی جێبەجێ کردووە، بەڵام ئێستا ئیتر دەبێ قۆناغی دووەمی عەلمانییەت جێبەجێ بکات، کەچی کۆمەڵگا ئیسلامییەکان تا ئەمڕۆش نەیانتوانیوە نە قۆناغی یەکەم و نە قۆناغی دووەم جێبەجێ بکەن.

*7*–ئەمە مانای وایە ئەوەندە بەس نییە مەعریفە بەرهەم بهێنین و ڕاستییەکان کەشف بکەین، بەڵکو دەبێ ئەوەش بزانین کە چۆن بیانگەیەنینە جەماوەر. لێرەدا سەرجەمی گرفتی پەیوەستکاری (یان کۆمیونیکەیشن) لە کۆمەڵگا مۆدێرنەکاندا خۆی دەخاتەڕوو. بەشێکی زۆری توێژەران لە پەراوێزدا دەمێننەوە ئەگەر نەزانن چۆن دەرەنجامی توێژینەوەکانیان بگەیەننە جەماوەری پان و بەرین.

*8*–ئارکۆن لێرەدا ئاماژە بەو ململانێیە دەدا کە لە ساڵی (*1984*)دا و لە سەردەمی سۆشیالیستەکاندا لە نێوان لایەنگرانی قوتابخانەی تایبەتی (کاتۆلیکی بە شێوەیەکی بنچینەیی) و قوتابخانەی گشتیدابەرپا بوو.

ئاركۆن وای دەبینێ پێویستە سەرلەنوێ گرفتی عەلمانییەت بە شێوەیەكی جیاواز بخرێتە ڕوو. ئێستا ئەمڕۆ هەندێ لە توێژەران و بەرپرسە گەورەكانی فەرەنسە باسی پێویستبوونی گەڵاڵەكردنی "عەلمانییەتی نوێ" دەكەن.

*9*–ڕەنگە ئاركۆن لێرەدا لە بەرامبەر فەڕەنسییەكان دڵڕەق بووبێ. ئەزموونی عەلمانییانەی فەڕەنسە یەكێكە لە هەرە ئەزموونە كۆنەكانی مێژوو وەك دواتر ڕوون دەبێتەوە. بەڵام لێرەدا هەمیشە جیاوازییەك لە نێوان نموونە و واقیعدا هەیە، یان لە نێوان تیۆر و / پراكتیك. ئەمڕۆ فەڕەنسییەكان هەوڵدەدەن عەلمانییەتێكی نوێ گەڵاڵە بكەن كە زۆر فراوانتر بێ لە عەلمانییەتی سەدەی نۆزدە، بەڵام بەبێ هیچ تەنازولێك لەو دەستكەوتە ئیجابیانەی عەلمانییەتی سەدەی نۆزدەهەم بە دەستی هێناون كە بوارێكی گەورەی بۆ پێكهێنانی فەڕەنسای نوێ ڕەخساند و جەنگە ئاینی و مەزهەبییەكانی لەناوبرد (بە تایبەتی جەنگی نێوان كاتۆلیك و پرۆتستانت). بەڵام سروشتی ئاركۆن ئاوایە، كاتێ قسە بۆ جەماوەرێكی دیاریكراو دەكات لە بەردەمی خۆیاندا بە توندی ڕەخنەیان لێ دەگرێ.

*10*–مەبەستی ئاركۆن لە عەلمانییە پەڕگیرەكان ئەو كەسە پەڕگیرانەن كە خوێندن و توێژینەوەی هەر ئاینێك ڕەت دەكەنەوە تەنانەت ئەگەر لە گۆشەنیگای كولتووری و مێژوویشەوە بێت. ئاینەكان –بە بۆچوونی ئەو كەسانە– دەبێ بە تەواوی ڕەت بكرێنەوە نەك تەنها وەك سرووت و پەرستن (بێگومان لە قوتابخانە گشتییەكاندا) بەڵكو وەك بابەتیش بۆ لێكۆڵینەوەی زانستی. بەڵام ئەمڕۆ فەرەنسییەكان باسی ئەوە دەكەن كە پێویستە "بابەتی مێژووی ئاینەكان" لە قوتابخانە گشتییەكاندا بخوێنرێت لەگەڵ دوورخستنەوەی فێركردنی سرووت و پەرستنی هەر ئاینێك. بێگومان سرووتەكان لە شوێنی تایبەتی خۆیاندا مومارەسە دەكرێن (واتە لە كەنیسە و پەرستگا و كنێست و مزگەوت) نەك لە فەزای گشتی كۆمەڵگا یان لە قوتابخانەدا. نابێ بە هیچ جۆرێ مندالآن لەسەر تەفریقەی ئاینی و تایەفی و مەزهەبی ڕابهێنرێن، دەنا جەنگی ناوخۆیی دەبێ بە شتێكی حەتمی، فەڕەنساش لە ڕابردوودا نرخێكی زۆری بۆ تەفریقەی ئاینی و مەزهەبی داوە.

*11*–موسڵمانەكان گاڵتە بە بیری عەلمانییەت دەكەن و پێیان وایە ئەمە شتێكە تایبەتە بە مەسیحییەكان و ئەمان پێویستیان پێ نییە. بۆچی؟ لەبەرئەوەی ئیسلام –وەك ئەوان دەڵێن– بریتییە لە (دین و دونیا). سەیر ئەوەیە خۆرهەڵاتناسەكانیش هەر هەمان شت دووپات دەكەنەوە، وەك بڵێی مەسیحییەت بە درێژایی سەدەكانی ناوەڕاست و تا سەدەكانی مۆدێرنە بریتی نەبووبێت لە (دین و دونیا). پاشان موسڵمانەكان دەڵێن عەلمانییەت لە بنەڕەتدا لە دژی كەهەنوت (پیاوانی كەنیسە) هاتۆتە ئاراوە و جا لەبەرئەوە ی ئەم چینە لە ئیسلامدا بەو شێوە هەرەمی و پلەدارییە بوونی نییە، لەبەرئەوە عەلمانییەت هیچ پەیوەندییەكی بە ئیسلامەوە نییە. خۆ ئەگەر بشڵێیت پرۆتستانت ئەو پێكهاتە هەرەمییەیان نییە كە لەلای پیاوانی ئاینی كاتۆلیكیدا هەیە و لەگەڵ ئەوەشدا دان بە عەلمانییەتدا دەنێن، ئەوا لەم كاتەدا نازانن وەڵام بدەنەوە. ئەمە جگە لەوەی ڕاست نییە بڵێیت چینی كەهنوت (یان شێخ و مشایخ) لە ئیسلامدا بوونی نییە.

ئەمە لە ئیسلامیشدا هەیە بەڵام بە شێوەیەکی جیاواز لەوەی لەلای کاتۆلیکدا هەیە. هەموو مەشایخەکان هەمان پلە و گرنگییان نییە. بۆ نموونە فەتوای شێخی ئەزهەر زۆر گرنگترە لە فەتوای شێخێکی ئاسایی، سەرباری ئەوەی سیستمێکی پلەداریی هەرەمی لەلای شیعەدا بوونی هەیە.

*12*–لێرەدا مەبەست لە "بێلایەن" کەسێکە گوێ بە هیچ نادات و هەموو ئاینەکان ڕەت دەکاتەوە و نایەوێ لە ئاینەکان بکۆڵرێتەوە و هەروەها بەرگەی هیچ بەرپرسیارییەکی مەعریفی ناگرێت. ئەمەش هەڵوێستێکی زۆر ئاسانە و هیچ لەسەر خاوەنەکەی ناکەوێت.

*13*–لە ڕاستیدا ئەو شتەی ئارکۆن دەیەوێ، بریتییە لە لێکۆڵینەوەی بەراوردکاری ئاینەکان نەك لێکۆڵینەوەیەکی دابڕاوی مێژووی هەر ئاینێك بە جیا، ئەمە تێڕوانینێکی بەرفراوانی ئەنترۆپۆلۆژییە کە ئارکۆن دەیەوێ بەسەر لێکۆڵینەوەی دیاردەی ئاینیدا بیسەپێنێ، سا هەر ئاینێك بێت و لەهەر کۆمەڵگایەك بێت. بەڵام ئەم تێڕوانینە ئەنترۆپۆلۆژییە بەرفراوانەی کە دیوارەکانی تایبەتمەندی و دەمارگیریی ڕیشەداکوتاوی ناو دەروون دەڕمێنێ، لە لایەن زۆر کەسەوە ڕووبەڕووی بەرگرییەکی توندوتیژ دەبێتەوە بە هۆی حەنینیان بۆ ڕابردوو و ئولفەتی دێرینەیان بۆ ئەو گوتەزا دەمارگیری و ئاینییانەی لەگەڵ شیری دایکدا خواردوویانەتەوە، ئیدی ئەوانە هەمیشە دەبنە دیلی قاڵبە تیۆلۆژی و لاهوتییە کلاسیکییەکان و ناتوانن لە بەرامبەر تێڕوانینی ئەنترۆپۆلۆژیای نوێدا بکرێنەوە.

*14*–بەپێی ئەو تێڕوانینەی ئارکۆن کاری لەسەر دەکات، دیاردەی ئاینی تەنها بەسەر هەرسێ ئاینە یەکتاپەرستییەکانی ئیسلام و مەسیحی و یەهودیدا (واتە ئاینەکانی سرووش) پراکتیك نابێت، بەڵکو ئاینەکانی دیکەی وەکو بودی و کۆنفۆشیوسی و تێکڕای تەجەلیاتی پیرۆزگەرایی کۆمەڵگا بەشەرییەکانیش دەگرێتەوە. چونکە مومکین نییە کۆمەڵگایەکی بەشەری بەبێ پیرۆزگەرایی یان حەرام بوونی هەبێت. ئاینە پلورالیستی و پەیگانیەکانیش وەك سەرجەمی ئاینەکانی دی نوێنەری پیرۆزگەراییین لە کۆمەڵگاکانی خۆیاندا. بەمجۆرە تێڕوانینی ئەنترۆپۆلۆژیای نوێ (واتە زانستی مرۆڤ و زانستی بەراوردکاری) ئاینە پلورالیستی و پەیگانییەکانیش دەهێنێتە ناو گۆڕەپانی لێکۆڵینەوە و بایەخپێدانەوە بە پێچەوانەی ئەو تێڕوانینە تەقلیدییەی پێشوەخت ئەو ئاینانە ڕەت دەکاتەوە.

*15*–زانستی ئیتنۆلۆژیا (*Ethnologie*) زانستێکە لە سەدەی نۆزدەهەمدا سەری هەڵداوە و گەشەی کردووە بە تایبەتی لەو سەروبەندەی کە میللەتانی ئەورووپی لە ڕێگای هەڵمەتی داگیرکاریدا میللەتانی دیکەیان ناسی. ئەم زانستە لە ڕابردوودا تایبەت بوو بە لێکۆڵینەوەی ئەو میللەتانەی بە "سەرەتایی" و "دڕندە" و "سارد" ناودەبران بۆ جیاکردنەوەیان لە میللەتانی خاوەن "شارستانییەت" و "مێژوو" و "گەرم". ئێمە ئەو وشانەمان خستە ناو دوو جووت کەوانەوە چونکە شتەکان پتر ڕێژەیین. بەڵام سۆسیۆلۆژیا (زانستی کۆمەڵناسی) تایبەت بوو بە لێکۆڵینەوە لە کۆمەڵگا ئەوروپییەکان. ئەمڕۆ سنوور و دیوارەکانی نێوان ئەو دوو زانستە ڕووخێنراون، بە تایبەتی لەسەر دەستی چەند بیریارێکی ئازادی وەکو، بۆ نموونە؛ پییێر بۆردیۆ.

*16*–لەوانەیە هۆی ئەم دوورخستنەوەیە بگەڕێتەوە بۆئەوەی کە ئەوروپا مەسەلەی ئاینی وەك کێشەیەکی توندی کۆمەڵایەتی و سیاسی (واتە جەنگە ئاینی و مەزهەبییەکان هەر لە سەدەی شانزهەمەوە) تێپەڕاندووە.. و ئێستا سەرقاڵی کێشەی دیکەیە. ئەمە لە کاتێکدا تا ئێستاش دنیای ئیسلامی و عەرەبی تێکچڕژاوەتە نێو "جەنگە ئاینی و مەزهەبییەکان". پاشان ئاین لە هەموو شوێنێکدا گرفتێکی هەنووکەیی و ئامادە و سووتێنەر و ترسناك پێکناهێنێ. نابێ ئەوەمان لەبیر بچێ کە لێرەدا جوداییەکی مێژوویی هەیە لە نێوان ئەوروپا و دنیای ئیسلامی. هەندێ کەس ئەو جوداییە مێژووییە لە رووی زەمەنییەوە بە (*150*–*200*) ساڵ دەپێون، واتە ماوەی نێوان شۆڕشی فەرەنسی و ڕۆژگاری ئەمڕۆ (وەك دەزانرێ شۆڕشی فەرەنسی لە ساڵی *1789*دا هەڵگیرساوە).

*17*–کۆمەڵگاش هەروەکو تاکەکەس، دان بە حەقیقەتی خۆی و بە ڕاستیی پاڵنەرەکانی خۆیدا نانێت، بەڵکو بەردەوام دەیشارێتەوە بۆئەوەی وێنەیەکی تری ڕەونەقدارتر لە بارەی خۆی بخاتەڕوو. بەڵام زانستە کۆمەڵایەتی و مرۆڤایەتییەکان قودرەتی ئەوەیان هەیە ئەم پرۆسەی خۆشاردنەوەیە ئاشکرا بکەن و رووتیان بکەنەوە و دەمامکەکانی سەر ڕوخساری کۆمەڵگا هەڵدەنەوە بۆئەوەی حەقیقەتی ڕاستەقینەی خۆی بە تێکڕای پێکهات و بونیاد و وەزیفەکانی دەربکەوێت. هەموو کۆمەڵگایەك و هەموو تاکەکەسێك دەمامك دەپۆشێت بۆئەوەی حەقیقەتی خۆی بشارێتەوە و بەو جۆرە خۆی پیشان بدات کە خۆی دەیەوێت.

*18*–ئامانجی هەموو ئەم قسانەی ئارکۆن یەك شتە: دەرخستنی جیاوازیی ئابڕووبەری نێوان گوتاری ئایدیۆلۆژیی باوی جەزائیر و وڵاتە عەرەبییەکانی تر لە سەرێك، وە لە نێوان ڕاستیی واقیع و هێزە زیندوو و مێژووییەکانی لە سەرێکی تر. لە ڕاستیدا ئەو گوتارە ئایدیۆلۆژییەی بە درێژایی چل ساڵ و بگرە تا ئەمڕۆش باو بووە، گوتارێکە وێنەی ڕاستەقینەی هەموو کۆمەڵگا عەرەبییەکان دەشارێتەوە یان دەیشێوێنێ.

*19*–بێگومان ئارکۆن نکوڵی لە دیموکراسیبوونی وڵاتانی وەکو فەرەنسە و ئەڵمانیا و بەریتانیا و.. هتد ناکات. بەڵام دەیەوێت بڵێ دیموکراسی هەمیشە بە ناتەواوی دەمێنێتەوە و بەردەوامیش پێویستیی بە دیموکراسییەتێکی زیاترە. کەچی لە وڵاتانی ئێمەدا لانی کەمی دیموکراسیەتیش بوونی نییە. ڕەخنەگرتنی ئارکۆن لە کەموکورتییەکانی سیستمی دیموکراسی بە هیچ جۆرێ بەو مانایە نییە کە لە دژی پرەنسیپی دیموکراسییە.

*20*–لێرەدا ئارکۆن گۆڕەپانی فیکری لە گۆڕەپانی کولتووری جیادەکاتەوە، ئەگەرچی زۆریش لە یەکدی نزیکن، لە ڕاستیدا گۆڕەپانی فیکری لە فەلسەفە و توێژینەوەی زانستییەوە نزیکترە، بەڵام گۆڕەپانی کولتووری چەند چالاکییەکی هونەری دەگرێتەوە، وەك: چالاکیی شیعری و ئەدەبی و سینەمایی و شانۆیی و سەماو.. هتد.

*21*–مەبەست لەوەیە هەر زمانێك گوزارشت لە واقیع بکات، بە تەبیعەتی حاڵ ناچارە تەرکیز بکاتە سەر هەندێ لایەنی ئەو واقیعە یاخود هەندێ دیاردەی ئەو واقیعە و هەندێکی تری فەرامۆش بکات. چونکە واقیع زۆر چڕ و زۆر ئاڵۆزترە لەهەر زمان و لەهەر

گوتارێك. زمان وەك هێڵێكی ڕاست وایە بەڵام واقیع هەڵدەكشێ و دادەكشێ و لە هەموو ئاڕاستەیەكیدا لقی لێدەبێتەوە.

*22*–ئەمە واتە ڕیشەی هەموو ئاینەكان یەك ڕیشەیە، یان بە دەربڕینێكی تر ئاتاجی ئاینی دواجار هەر یەك شتە و سەبارەت بە قووڵایی ناخی هەر فەردێك و هەر كۆمەڵگایەكی بەشەری هەمان پێداویستییە.

*23*–مەبەست لەو قاڵبە تیۆلۆژییە بە میرات بۆماوانەیە كە تایبەتمەندیی هەر ئاینێك جێگیر دەكات و ڕێگە نادات لەگەڵ ئاینێكی دیكە پەیوەندیی هەبێت بۆئەوەی وەكو ئاینێكی دەگمەن دەربكەوێت كە لە هەموو ئاینەكانی تر لە پێشتر بێت. بەڵام لە پشتی هەموو ئەو تایبەتمەندییانەی لە ڕووی تیۆلۆژییەوە ئاوێتە بووە، یەك ڕەگوڕیشەی قووڵ هەیە كە ئاركۆن لەو ڕیشەیە دەدوێ. هەر ئەو ڕەگوڕیشەیەیە كە مەنهەجی ئەنترۆپۆلۆژیی بەراوردكاری ئاشكرای دەكات و دەست بەسەر ئەو ڕەگەزە هاوبەشانەدا دەگرێت كە لە هەموو بەشەرێكدا هەیە.

*24*–واتە وابەستەی ئەو بارودۆخەیە كە تیایدا سەری هەڵداوە و لە ساتەوەختێكی زەمەنی دیاریكراوی ساتەكانی مێژوودا كەوتۆتە ژێر كاریگەریی ئەو دۆخەوە. بەڵام ئیمانداریكی تەقلیدی پێی وایە كە ئەمە هەر لە سەرەتاوە و بگرە هەر لە ئەزەلەوە هەبووە و بەسەر مێژوو و مێژووگەرایشدا بڵند دەبێتەوە. بەڵام میتۆدی نوێی مێژوو بە ئاسانی چركەساتی سەرهەڵدانی هەموو سرووتەكانمان بۆ دەردەخات (لە نوێژكردن و ڕۆژووگرتن و حەجكردن و.. هتد) هەروەها پەیوەندیی ئەمانە بە سرووتەكانی پێش خۆی سا لە كۆمەڵگای كۆنی عەرەبیدا بێت یان لە ئاینە تەوحیدییەكانی تر و تەنانەت لە ئاینە دێرینەكانی خۆرهەڵاتی ناوەڕاستیش. ئەوەی كە زۆر لە سرووتە دەرەكی و ناوەكییەكانی هەموو ئاینێك قووڵتره بریتییە لەو سۆزە قووڵەی كە لە پشتی یان لەژێر سرووتەكانەوە پەنهانە، دیسان بریتییە لەو ئاتاجە ئاینییە یان ئەو بونیادە بنەڕەتییەی كە بۆ ماوەی چەندین سەدە تێڕوانینی مرۆڤیان بۆ دنیا و دەوروبەرەكەی دیاری كردووە، ئەوەی كە بووە مایەی داهێنانی ئەو پەرستن و سرووتانە.

*25*–بێگومان نابێت خوێنەر وا تێبگات كە ئاركۆن لێرەدا لە دژی عەقڵ و عەقڵانییەتە. ئەم پیاوە لە مەوقعێكی زۆر پێشكەوتووی ئیپیستیمۆلۆژی و عەقڵانیی ئەم چەرخەوە قسە دەكات. باوەڕی ئاركۆن بە عەقڵ و عەقڵانییەت سنووری نییە. چەمكی عەقڵیش بە بەراورد بە چەرخی كلاسیكی گۆڕانی بەسەردا هاتووە. میشێل فۆكۆ لە تێزە ناودارەكەیدا لە بارەی "مێژووی شێتی لە چەرخی كلاسیكیدا" مەودای ئەو بەنێویەكداچوونەی دەرخستووە كە لە نێوان عەقڵ/ و ناعەقڵدا هەیە، یان لە نێوان خەیاڵ و شەتەحات لە زەینی هەموو مرۆڤێكدا و تەنانەت لە زەینی عەقڵمەندە گەورەكانیش. واتە عەقڵێكی پەتی و تەمام عەیار و بێگەرد كە تێكەڵ نەبووبێ بە هیچ شتێ، بوونی نییە، ئەمە سەبارەت بە تێڕوانینی ئیپیستیمۆلۆژیای نوێ بووە بە چەمكێكی كۆن و بەسەرچوو. عەقڵ پێویستیی بە تەڕایی خەیاڵ و شیرینیی وەهم هەیە بۆئەوەی بجووڵێتەوە و كاربكات و لە گەیشتن بە دەرەنجامێك سەركەوتوو بێت. بەڵام عەقڵێكی ئەدەواتی و بیركارییانەی سارد كە چەرخی تێكنۆلۆژیا هێناویەتی بەو پێیەی ئەمە لوتكەی عەقڵ و عەقڵانییەتە، ئەمڕۆ

دووچاری ڕەخنەگرتنێکی توند بۆتەوە لەسەر دەستی گەورە بیریارانی وەکو یۆرگن هابرماس و قوتابخانەی فرانکفۆرت و بەر لەمانیش ئادورنۆ. لێرەدا عەقڵ هەیەو عەقڵیش هەیە، واتە هەموو عەقڵەکان یەکسان نین. بۆ نموونە کاتێ ئارکۆن لە شوێنێکی تردا چەمکی عەقڵی ئیسلامیی کلاسیکی گەڵاڵە دەکات، ئەوە لەوێدا لە عەقڵێکی تایبەتی دەدوێ کە مەرجدارە بە کات و شوێن و بە تواناکانی ئەو عەقڵە.

*26*–لێرەشدا دەبێ لەگەڵ ئارکۆندا بین و هەندێ لە بۆچوونەکانی ڕوونتر بکەینەوە بۆئەوەی خوێنەر لە بەدحاڵیبوون و تێگەیشتنی هەڵە دووربخەینەوە، چونکە مەسەلەکە ورد و ئاڵۆز و ترسناکیشە. یەکەم، سەبارەت بە عەقڵی لاهوتیی کە بۆ ماوەی چەندین سەدە دەسەڵاتی بەسەر خۆرئاوادا بەهێز بوو، لەوێدا زانای ئاینی (تیۆلۆژیست) ماهیەتی عەقڵێکی کامڵ و بێ هەڵەی لە ڕێگەی مۆنۆپۆلیزەکردنی تەفسیری دەقەکان، دیاری دەکرد. بەڵام ئێمە ئەوە دەزانین کە تێکستە پیرۆزەکان لە بەرامبەر چەندین مانادا کراوەن و مانای جیاواز هەڵدەگرن، قەتیسکردنی تێکستی پیرۆز لە یەك مانادا جگە لە مومارەسەکردنی ستەمکاری شتێکی تر نییە. کەسی ڕاڤەکار (یان زانای لاهوت) ئەویش مرۆڤە و لە هەڵە بێبەری نییە، بەڵام ئەو وا لە خەڵکی دەگەیەنێت کە بێ هەڵەیە. پاشان مۆنۆپۆلکردنی یەك مانای شەرعی لە گۆشەنیگای مەعریفی و تەنانەت لە گۆشەنیگای ئاینیشەوە مەقبول نییە. چونکە لێرەدا چەندین هێڵ یان چەندین تەوژمی تیۆلۆژی لەناو یەك ئاینیشدا هەیە نەك تەنها یەك هێڵ. بۆ نموونە لە ئاینی مەسیحیدا ئەم هێڵ و تەوژمانە هەن: کاتۆلیکی، پرۆتستانتی، ئەرتۆدۆکسی، لەناو ئیسلامیشدا: سوننی، شیعە، خارجی.. هتد. لە دواییدا دیکارت و عەقڵی زانستیی نوێ هاتن و مرۆڤی ئەوروپییان لە دیلی دۆگمایی و مەیلی سکولاستیکی ڕزگار کرد و پاشان دەسەڵاتی خود یان سەروەریی خودیان سەپاند، واتە دەسەڵاتی عەقڵی بەشەری کە بە نێو پشکنین و ئەزموون و پێوانەی بیرکاریی وردا تێدەپەڕێ. ئەو شتەی لێرەدا ئارکۆن ڕەخنەی لێدەگرێ بریتی نییە لەو ڕزگارکردنە گەورەیەی عەقڵ، بەڵکو بریتییە لە گواستنەوەی عەقڵی دیکارتی کە بە تێپەڕبوونی زەمەن بوو بە عەقڵێکی وشك و ڕەق و دۆگما، هەروەکو ئەمە بەسەر هەموو ئەو عەقڵە گەورانەدا دێت کە بزاوتە مێژووییە گەورەکان دادەمەزرێنن. ئەو ڕەخنەیەی ئارکۆن ئاراستەی عەقڵی دیکارتی دەکات، ئەمڕۆ لە نێوەندی ژینگە زانستییە فەرەنسی و ئەوروپییەکاندا بووە بە شتێکی مەقبول بە تایبەتی لە دوای بڵاوبوونەوەی توێژینەوەکانی میشێل فۆکۆ و یۆرگن هابرماز و ڕەخنەگرتنی ئەم دوو بیریارە لە سەرجەمگیری یان توتالیتاری عەقڵی کلاسیکی ئەوروپی. کاتێ دیکارت عەقڵی بەتاڵ کردەوە لەهەر عاتیفە و لەهەر خەیاڵێك و پێی وابوو خەیاڵ شتێکە لە دەرەوەی عەقڵدایە، بەمە شارستانییەتی ئەوروپی – واتە شارستانییەتی زانستی و پیشەسازی نوێ–ی دامەزراند. بەڵام هاوکات کاریگەریی خەیاڵ و تەڕایی خەیاڵی لەناوبرد و دەوری خەیاڵی لە بنیاتنانی شارستانییەت و کارکردندا پووچ کردەوە.

پاشان ئەم عەقڵە لە چەرخی ئەمڕۆماندا –واتە چەرخی ئەمریکی و تێکنۆلۆژی و ئیستهلاکی– گۆڕا و بوو بە عەقڵێکی ئامێری و تەکنیکی بەرتەسك و ژمێریارییەکی سارد.. تەنها ئەم لایەنەیە کە ئارکۆن

ڕەخنەی دەکات نەوەکو عەقڵ بە شێوەیەکی گشتی یان عەقڵانییەتی ڕینیە دیکارت لە چرکەساتی یەکەمی سەرهەڵدانیدا بەر لەوەی ببێت بە ئەرتۆدۆکسییەکی وشک.

*27*–واتە لێکۆڵینەوەی زانستیی بەراوردکاریی بۆ دیاردەی سرووش هێشتاکە بە شێوەیەکی پێویست دەستی پێ نەکراوە. هەموو تایەفەیەك و هەموو ئاینێکی گەورە لەناو سرووشە تایبەتییەکەی خۆیدا خۆی داخستووە و پێی وایە تەنها سرووشی خۆی سرووشێکی ڕاست و درووستە، سرووشێك لە سەرووی کات و شوێن و مێژووەوە ڕاوەستاوە، هاوکات سرووشی ئاینەکانی تر ڕەت دەکاتەوە و بە سرووشێکی ساختەی دەژمێرێت. ئەم سرووشە لەلای ئەوان ڕەهای حەقیقەتە یان حەقیقەتێکی ڕەهایە. باشە چۆن لەم ئاستەنگە بێینە دەرێ؟ بێگومان لە ڕێگەی کرانەوە لە بەرامبەر ئەوانی دی و ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەی بەراوردکاری و ئیعتراف کردن بە ئەزموونی ڕۆحی ئایینیەکانی تر و پاشان بە شێوەیەکی تایبەتی تەرکیزکردنە سەر مەسەلەی پەیوەندی نێوان سرووش و مێژوو. ئەو شتەی کە چەرخی پۆزەتیڤیزم لە سەدەی نۆزدەهەمەوە کردوویەتی بریتییە لە فەرامۆشکردن و لابردنی سرووش بێئەوەی لێکۆڵینەوە و پشکنینێکی جیدی بۆ ئەنجام بدرێت و گوایە ئەمە سەر بە زەمەنێکە تەواو بووە و بەسەرچووە و ئیتر پێویست ناکات گرنگی پێ بدرێت. بەڵام ئەمڕۆ دەبینین بایەخدانێکی مەعریفی نوێ بە دیاردەی ئاینی و بە تایبەتیش بە دیاردەی سرووش سەری هەڵداوە. ئەم بایەخپێدانەش مانای گەڕانەوە بۆ ڕابردوو و شێواز و بەهاکانی ڕابردوو نییە، بەڵکو مانای ئەوەیە تیشکێکی نوێ دەخرێتە سەر دیاردەیەك بەقەدەر مێژوو کۆنە.

*28*–مارکسیزمی ئەرتۆدۆکسی کاتێ ئەوەی ڕاگەیاند کە فاکتەری ئابووری لە مێژوودا و لە هەموو دۆخێکیشدا فاکتەرێکی یەکلاکەرەوەیە، لە ڕاستیدا بە جۆرە پەلەکردنێکەوە مەسەلەکانی یەکلاکردەوە. کاتێکیش ڕایگەیاند کە فاکتەری ئاینی دەچێتە سەر بونیادی سەروو (یان: سەرخان) نەك بونیادی ژێرەوە (ژێرخان)، لێرەشدا دیسان پەلەی کردووە و لێکدانەوەیەکی خێرا و سادەگۆییانەی بۆ مەسەلەکان خستۆتە ڕوو. بەڵام ئەمڕۆ ئێمە لە میانی دۆزینەوە گرنگەکانی ئەنترۆپۆلۆژیستە هاوچەرخەکانەوە ئەوە دەزانین کە مەسەلەکان زۆر لەوە ئاڵۆزترن بەو سادەکارییە باسبکرێن. مێژوو لە ڕێگەی تاکە فاکتەرێکەوە یەکلا ناکرێتەوە، بەڵکو لە ڕێگەی چەندین کارکرد و فاکتەری دیکەوە تەماشا دەکرێت. هەندێ جاریش -بەپێی بارودۆخ و هەلومەرجەکانی ژیان- فاکتەرێك لە فاکتەرەکانی تر گرنگتر و بایەخدارتر دەبێت. ئەمە جگە لەوەی جاری وا هەیە فاکتەری خەیاڵ یان ئەفسانە یان "سەرخان"دەشێت ببێت بە هێزێکی مادی فشارهێن بۆ سەر چارەنووسی مێژوو و کۆمەڵگا بەشەرییەکان. ئەوسا بونیادی سەرەوە "سەرخان" دەگۆڕدرێ و دەبێ بە بونیادی ژێرەوە، یان "ژێرخان"ێکی ڕاستەقینە.

*29* –مەبەستی ئارکۆن لە (خەیاڵکراوی گەورە) ئەو وەهمە گەورەیەیە کە دەسەڵاتی بەسەر ئاگایی ملیۆنان کەسدا هەیە، ئەوانەی پێیان وایە مومکین نیە دەسەڵاتێك هەبێت وابەستەی دەسەڵاتی ئاینی نەبێت. سەیر ئەوەیە ئەم وهمە تا ئەمڕۆش بوونی هەیە و

بەردەوامە سەرباری سروشتی ستەمکاری و توندوتیژی دەسەڵاتەکان و ڕژێمە سیاسییەکان. بەڵام وردە وردە ئەو وەهمە نامێنێت ئەگەر زانیمان ئەمە لە سەردەمی ئومەوییەکانەوە شکڵی گرتووە کاتێك فەقیهەکان ڕازی بوون بەوەی بەرگی شەرعیەت بکەن بەبەر دەسەڵاتی نوێدا کە لە ڕێگەی هێزی چەکدارییەوە گەیشتە دەسەڵات نەك لە ڕێگەی شەرعیەتی ئاینی.

پاشان ئەم وەهمە زۆر کۆنە و ڕیشەیەکی دێرینی هەیە. کاتێکیش وەهمێکی لەو جۆرە لەو سەردەمەوە تا ئەمڕۆ بەردەوام دەبێت و بە قۆناغی عەباسییەکان و فاتمییەکان و تورکەکاندا تێدەپەڕێ و دەگاتە ڕۆژگاری ئەمڕۆمان، ئەوە دەبێتە یەکێ لە پێدراوە گەورەکانی مێژوو. بەمجۆرە وەهم دەبێت بە حەقیقەتێکی ماتریالی و ڕووی مێژوو دەگۆڕێت.

*30*–مەبەست لە (گوتاری کۆمەلایەتی) گوتاری ژمارەیەکی گەورەی خەڵکییە لە کۆمەڵگادا، کەواتە ئەمە گوتاری بە کۆمەڵە نەك گوتارێکی تاکەکەسی، ئەمە گوتاری سەرانسەری کۆمەڵگایە.

*31*–واتە عەقڵی ئیسلامیی کلاسیکی بەرهەمی کێشمەکێشی نێوان دوو ڕەوت یان دوو تەوژمی ململانێکاری ئەو سەردەمە بوو: تەوژمی ئەهلی حەدیس و نەقڵ/ تەوژمی ئەهلی ڕەئی و عەقڵ (یان: تەوژمی فیقهی/ و تەوژمی فەلسەفی). هەریەکە لەم دوو تەوژمە ناچار بوون هەندێ تەنازول بۆ یەکتری بکەن.

*32*–لێرەدا مەبەست لە خەیاڵکراوی جەماوەرییە کە لە دوای شۆڕشی فەڕەنسەوە شکڵی گرت و شوێنی خەیاڵکراوی کاتۆلیکی و پاشایی گرتەوە. ئەم جۆرە خەیاڵکراوەیە ئەمڕۆکە ئاگایی ئەو فەڕەنسییە دەجووڵێنێ کە لە قوتابخانەی عەلمانییەتدا خوێندوویەتی و لەناو ئەو کۆمارەدا ژیاوە کە جیل فیری لە سەدەی نۆزدەهەمەوە دایمەزراندووە. کاتێك دەڵێین "بەهای کۆماری" لە فەڕەنسەدا وەك ئەوە وایە بڵێین "بەهای عەلمانی".

*33*–ئەم چەشنە باوەڕە لەناو موسڵمانەکان و لە ناوەندی خۆرهەلاتناسانیشدا بلاوە، بە جۆرێ بلاوە کە لەلای ئەوان قابیلی گفتوگۆ نییە! ئەمە سەبارەت بە ئاگایی ژمارەیەکی ئێجگار گەورەی موسڵمانان شتێکی نەگۆڕ و بەڵگەنەویستە. بەلام واقیعەکە تەواو پێچەوانەی ئەمەیە. ئیسلام (ڕۆحی) و (زەمەنی) لەگەڵ یەکدی تێکەڵ ناکات و لە یەکتریشیان جیاناکاتەوە. لە ڕاستیدا دروستکردنی کۆمەڵگا و پلەی پێشکەوتنەکەیەتی کە تێکەڵکردن یان جیاکردنەوە دەسەپێنێ. ئەوکاتەی کۆمەڵگا ئەوروپییەکان لە قۆناغی سەدە ناوەندییەکانی مەسیحییەتدا دەژیان، ئەوانیش لایەنی ڕۆحی و لایەنی زەمەنییان تێکەڵ دەکرد، کاتێکیش لە ڕێگەی پیشەسازی و شۆڕشی زانستی و فیکریی نوێدا بونیادی ڕۆحی و زەمەنی گۆڕانکارییان بەسەردا هات یان ڕاستتر ئاوەژوو بوونەوە، ئەوسا ڕۆحی و زەمەنییان لە یەکتر جیاکردەوە. ئەمە زۆر بە سادەیی حەقیقەتی مەسەلەکانە و ئەمە پەیوەست نییە بە تایبەتمەندیی ئیسلامەوە تا لە ئاینەکانی دیکەی جیابکاتەوە وەکو خۆیان دەڵێن. کاتێ ئیسلام لە شارستانییەتی خۆیدا دەژیا، ئاستێك لە عەلمانییەتی بەخۆوە بینی.

*34*–چونکە بە تەنها تەرکیزکردنە سەر نموونەی ئەوروپی، دەیکات بە نموونەیەکی ڕەها و قەبە کە دەکەوێتە دەرەوەی کات و شوێنەوە. ئەو باوەڕەی کە گوایە ئەوروپییەکان لە هەموو کەس باشتر و لە

پێشترن، هەوڵی داوە ئەم جۆرە بیرۆکەیە بسەپێنێ کە میللەتـە ئەوروپییـەکان لـە میللـەتانی دی باشـتر و لەپێشـترن و هـەموو بـەراوردکردنێکی نێـوان خۆیـان و ئەوانی دی ڕەت دەکەنەوە چونکە پێیان وایە لە هەموو جیـهاندا هیـچ ئـەزموونێك نییـە هاوشـانی ئـەزموونی ئەوان بێت.

*35*–ئـارکۆن وای دەبینـێ دیـاردەی سـەرکەوتنی شارسـتانیەتی ئـەوروپی دەگەڕێتـەوە بـۆ فاکتـەری بـەردەوامبوون و سەرخسـتن (واتـە بـەردەوامبوونی سـەرکەوتنەکان یـان سـەرکەوتنی بـەردەوام) کـە هـەر لـە سـەدەی شـانزەهەمەوە تیـایدا دەژیـن. ئەمـە لـە کـاتێکدا پێشـکەوتن و پەرەسـەندنی عـەقڵانی و ژیـاری لـە بـواری عـەرەبی–ئیسـلامیدا پەرەسـەندنێکی پچڕپچـڕ و کورتخایـەن و کورتمـەودا بـووە (بـۆ نموونـە: سـاتەوەختی هـارون ڕەشـید، سـاتەوەختی مـەئمون، سـاتەوەختی عضـد الدولـة). شکسـتی بورژوازیـی بازرگـانیش بووەتـە مایـەی شکسـتی شارسـتانیەتی عـەرەبی–ئیسـلامی لـە چـەرخی کلاسـیکیدا. چونکـە "هـێزی ماتریـالی" لـە هەموو شوێنێکی دنیادا پایەیەکی گرنگی ڕێنیسانسی عـەقڵی و ئـازادیی بیرکردنەوەیـە (بـۆ نموونـە بڕوانە ڕێنیسانسی هۆڵـەندە لـە سـەدەی شـانزەهەم و حەڤدەهـەم کـە تیـایدا ئـازادیی بیرکردنـەوە پایـەدار بـووە بـە بـەراورد بـە وڵاتـە ئەوروپییـەکانی تـر)، بیرمـەندە ئازادەکـانی ئـەوروپا کتێبـەکانی خۆیـان لـە هۆڵـەندەدا بـڵاو دەکـردەوە نـەك لـە فەرەنسـە یـان لە ئینگلتەرە.

*36*–بەر لـە سـەرکەوتنی چـەمکی "خۆرئـاوا" بـە مانای عەلمانیی وشەی خۆرئاوا، سەرانسەری ئەوروپا بە جیهانی مەسیحی ناودەبرا، لـە دواییدا بـە خۆرئاوا ناوبرا.

*37*–فیرنـان برۆدێـل (*1902–1985*) یەکێکـە لـە گرنگـترین مێژوونووسـە هاوچەرخـەکانی فەرەنسـە. لێکۆڵینەوەیـەکی درێـژی لـە بـارەی شارسـتانیەتی ئـەوروپا ئـەنجام داوە و لـە سـاڵی (*1980*)دا لـە کتێبێکی گەورەدا بە سێ بەرگ بە چاپی گـەیاندووە. ناونیشانی کتێبەکە بەمجۆرەیە:

شارستانییەتی ماتریالی، ئابووری و کاپیتالیزم لە نێـوان سـەدەی پانزەهـەم و هەژدەیـەمدا –لـە بڵاوکراوەکانی ئارمان کولان– پاریس– *1980*.

*38*–مەبەستی ئارکۆن پاشەکشەکردنی گۆڕەپانی ئاینییە لە ژیانی گشتیدا، بۆئەوەی ئاین تەنها لە ژیانی تایبـەتیی تاکەکەسـدا بمێنێتـەوە نـەك هەیمەنەیـەکی تـەواوی هـەبێت و وەکو جاران هـەموو فـەزای گشـتیی کۆمەڵگا داگیر بکات.

## سەرچاوە

محمـد آركـون، العلمنـة و الديـن: الاسـلام–المسيحية– الغرب، ترجمة، هاشم صالح، دار الساقي، الطبعة الثالثة، *1996*.

# لەدایکبوونەوەی ڕەواقیگەری و تیۆرەکانی "مافی سروشتی" لەبارەی دەوڵەتەوە

• ئەرنست کاسیرەر
▪ لە فارسییەوە: ڕێبین هەردی

### تیۆرەی پەیمانی کۆمەڵایەتی*

سەدەکانی پانزە و شانزە سەردەمی ژانی لەدایکبوونی جیهانی مۆدێرن بوو. لە هەموو لقەکانی کلتووری مرۆڤایەتیدا وەك دین، هونەر و فەلسەفە ڕۆحێکی تازە دەرکەوت و هێزی خۆی نیشان دا. بەڵام ئەم ڕۆحە هێشتا لە حاڵەتێکی شێواودا دەژیا. فەلسەفەی ڕێنسانس دەوڵەمەند بوو بە کۆمەڵێ ئەنگێزەی پڕ بەرهەم و نوێ، بەڵام لە هەمان کاتدا پڕبوو لە ناکامڵترین ناکۆکیەکان. زیهنی مۆدێرن دەستی کردبوو بە دۆزینەوەی ڕێگەی خۆی، بەڵام ئەم ڕێگەیەی نەدەناسی. لە پاڵ ئەو ئامادەگییەدا کە بۆ چاودێریکردنی مەسەلە ئەزموونییەکان هەبوو، گەشانەوەیەکی تازە لە "زانستە غەیبییەکاندا" (*Occult sciences*) دەبینرا. گەورەترین بەهایان بە جادووگەری و کیمیاگەری و تالعبینی دەدا. جۆردانۆ برۆنۆ یەکەم قسەکەری فەلسەفی سیستەمی کۆپرنیکۆس بوو. بە گشتی ئەو لە ڕیزی پێشەنگ و شەهیدانی زانستی تازە دادەنێن، بەڵام ئەگەر بەرهەمەکەی بخوێنینەوە، وێنەیەکی جیاواز دەدۆزینەوە، باوەڕی ئەو بە جادوو، نەگۆڕ بوو. لۆژیکەکەی لاساییکردنەوەیەکی هونەریی مەزنی ڕیمۆندۆس لۆلۆسە. لەم مەسەلەیەشدا وەك مەسەلەکانی دی هەموو شتێك لە هەلومەرجێکی نادیاردا بوو، بیری فەلسەفی لەناو خۆیدا دووچاری پارچەپارچەبوون و ئاراستەی جیاوازی دەگرت.

زانایان و فەیلەسووفانی مەزنی سەدەی حەڤدەهەم یەکەم کەسانێك بوون کە کۆتاییان بەم

سەردەرگومیە هێنا. هەوڵە زانستی و فەلسەفییەکانیان لە دوو ناوی مەزندا بەرجەستە بوو، گالیلۆ و دیکارت. گالیلۆ لێکۆڵینەوەکانی خۆی لە بارەی دیاردە سرووشتییەکانەوە بە بەیانێکی گشتی لەبارەی ئەرکی زانست و فەلسەفەوە دەست پێکرد. ئەو ڕایگەیاند کە سرووشت لە نهێنیدا نەشاراوەتەوە و شتێکی ئالۆز نییە. فەلسەفە لە کتێبی مەزنی جیهاندا نووسراوە کە هەمیشە لەبەرچاوماندا کراوەتەوە. بەڵام زیهنی مرۆڤ دەبێت فێربێت چۆن نهێنییەکانی ئەم کتێبە بکاتەوە و تەفسیری بکات. ئەم کتێبە بە زمانی ماتماتیك نووسراوە. حەرفەکانی ئەم کتێبە ئیدراکی هەستی ئاسایی نین، بەڵکو سێگۆشە و بازنە و شێوە ئەندازەییەکانی ترن. ئەگەر کەموکورتی لە تێگەیشتنی ئەم زمانە ئەندازەییە بهێنین، مومکین نییە تەنانەت یەك وشە لە کتێبی سرووشت تێبگەین[1] فیزیای دیکارت هەم لە ڕوونکردنەوەیدا بۆ دیاردە تایبەتییەکان و هەم لە وێنای هەمەکیدا بۆ یاساکانی جووڵە، لە زۆر ڕووەوە لە بەرامبەر تیۆرەکانی گالیلۆدایە[2] بەڵام ئەم فیزیایەش هەر بەرهەمی هەمان ڕۆحی فەلسەفییە. فیزیا لقێکی تایبەت نییە لە زانینی مرۆیی، بەڵکو بەشێکی جیانەکراوەیە لە زانستی هەمەکی و گشتگیری ماتماتیکی گشتی (*Mathessis universalies*) کە هەر شتێك قابیلی ئەندازەکردن بێت، تاوتوێ دەکات. دیکارت بە گومانی گشتی دەستی بە لێکۆلینەوە کرد. بەڵام گومانی دیکارت، گومانی گۆمانلێکەرێك نەبوو، بەڵکو گومانێکی میتۆدۆلۆجی بوو. ئەم گومانە بوو بە "خاڵی ئیتکای ئەرشمیدسی" ناوەندی نەگۆڕ و نەبزووتی جیهانی تازەی هەقیقەتی فەلسەفی. لەگەڵ دیکارت و گالیلۆدا سەردەمێکی تازەی "بیری ڕوون و ئاشکرا" دەستی پێکرد. لەژێر تیشکی درەوشاوەی "دوو زانستی تازە"ی گالیلۆ و ئەندازەی شیکاری و شیکردنەوەی لۆژیکی دیکارتدا، "زانستە غەیبیەکان" لەناوچوون. قۆناغی جۆشوخرۆش، جێگەی خۆی دا بە قۆناغی پێگەیشتن. ڕۆحی تازەگەر (*Modern*) هوشیار بوو بە وزە داهێنەرەکانی خۆی و دەستی کرد بە فۆرمەلەکردن و تێگەیشتن لە خۆی. هێزی عەقلانی بالاٌتربوونی ئەم ئاراستە جیاواز و نەگونجاوانەی پێکەوە بەستەوە. ئەم ئاراستە چیدی پەرشوبلاو و دوورلەیەك نەبوون، بەڵکو بەرەو ناوەندێکی هاوبەش دەچوون. لە فەلسەفەی دیکارتدا زیهنی تازەگەر پێگەیشت و لەسەر پێی خۆی ڕاوەستاو و بەرگری لە مافی خۆی لە بەرامبەر هەموو تێگەیشتنە کلاسیکییەکان و مەرجەعە دەرەکییەکان /لە عەقڵ وەك نەریت و کتێبی پیرۆز و پاپا و فەرمانڕەوا/ کرد.

بەڵام ئەگەر جیهانی مادی بۆ زیهنی مرۆڤ قابیلی تێگەیشتنە، ئایا هەر ئەم مەسەلەیە لە بارەی بوارێکی تەواو جیاوازیشەوە، هەر ڕاستە؟ ئەگەر ناسین بە مانای ناسینی ماتماتیکی بێت، ئایا دەکرێت ئومێدمان بە بونیادنانی زانستی سیاسەت بێت؟ لە سەرنجی یەکەمدا پێدەچێ خودی چەمك و ئایدیالی زانستێکی وەها، یۆتۆپیایەکی ڕووت بێت. ئەو وتەیەی گالیلۆ کە

گوتوویەتی فەلسەفەیان بە شکڵی ئەندازەیی نووسیوە، دەتوانێ لە بارەی سرووشتەوە ڕاست بێت، بەڵام ئایا ئەم وتەیە لە بارەی ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و مرۆڤیشەوە هەر ڕاستە؟ ناکرێ ئەم ژیانە لە قاڵبی زاراوە ماتماتیکییەکاندا وەسف و ڕوون بکرێتەوە. ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی، ژیانی سۆز و هەستەکانە. پێدەچێت کە هەوڵی بیری موجەرەد توانای فەرمانڕەواییکردنی بەسەر ئەو هەژانانەدا نەبێت و ناتوانێ لەناو سنووری دیاریکراودا دایانبنێت و ڕێنماییان بکات بەرەو ئامانجێکی عەقڵانی.

بەڵام بیریارانی سەدەی حەڤدەهەم لە بەردەم ئەم ڕەخنە بەجێ و ئاشکرایەدا نەکشانە دواوە. هەموویان عەقڵانیخوازی سەرسەخت بوون و بە گشتی باوەڕێکی سەقامگیر و بێ قەیدوشەرتیان بە دەسەڵاتی عەقڵ هەبوو. لەم ڕووەشەوە ئەستەمە بتوانین لە نێوان قوتابخانە جیاوازە فەلسەفییەکاندا، جیاوازییەك بدۆزینەوە. هۆبز و هۆگۆ گرۆتیۆس لە ڕوانگەی بیری سیاسی سەدەی حەڤدەهەمەوە لە دوو جەمسەری بەرامبەر بە یەکدا ڕادەوەستان. ئەو دووانە لە پێشگریمان و خواستە سیاسییەکانیاندا لەگەڵ یەکدا تەبا نەبوون، بەڵام پەیڕەویان لە یەك شێوازی بیرکردنەوەو و یەك میتۆدی ئیستدلالی دەکرد. میتۆدەکەیان مێژوویی یان دەروونناسی نییە، بەڵکو شیکاری و بەراوردکارییە. ئەم دوو بیریارە بنەمای تیۆرە سیاسییەکەی خۆیان لە سرووشتی مرۆڤ و سرووشتی دەوڵەتەوە، هەڵدەهێنجا. لەم کارەشدا پەیڕەویان لە نموونەی مەزنی مێژووی گالیلۆ دەکرد. نامەیەك لە گرۆتیسەوە لەبەردەستدایە کە تیایدا ستایشێکی زۆری دەستکەوتەکانی گالیلۆ دەکات[3] هەر ئەم مەسەلەیەش لە بارەی هۆبزەوە ڕاستە. ئامانجی گەورەی فەلسەفەی هۆبز هەر لە سەرەتاوە بریتی بوو لە پێشکەشکردنی تیۆرەیەك لە بارەی چوارچێوەی سیاسییەوە کە لە ڕووی ڕوونی و میتۆدی زانستییەوە هاوتای تیۆرەکەی گالیلۆ بێت لە بارەی تەنە فیزیاییەکانەوە. هۆگۆ گرۆتیۆس لە پێشەکی کتێبەکەی خۆیدا "مافی جەنگ و ئاشتی" هەر ئەم باوەڕە دەردەبڕێ. بە بڕوای ئەو بە هیچ شێوەیەك مەحاڵ نییە "ماتماتیکی سیاسەت" پەیدا ببێت. ژیانی کۆمەڵایەتی مرۆڤ کۆمەڵێك بابەتی واقعی نەگونجاو و ڕێکەوت نییە، ژیانی کۆمەڵایەتی لەسەر کۆمەڵێ حوکم ڕاوەستاوە کە خاوەن هەمان بایەخی مەسەلە ماتماتیکییەکانی هەیە و وەك ئەوانیش قابیلی سەلماندنن. چونکە ئەو حوکمانە نەبەستراون بە بینینی ئەزموونی ڕێکەوتەوە، بەڵکو خاوەن خەسڵەتی هەقیقەتی نەمر و هەمەکین.



گالیلۆ

لەم ڕووەوە هەموو تیۆرە سیاسییەکانی سەدەی حەڤدەهەم سەرەڕای جیاوازییان لەسەر

ئامانج و شێوەی گەیشتن بەو ئامانجە، بەڵام هەموویان زەمینەیەكی میتافیزیكی هاوبەشیان هەبوو. بیری میتافیزیكی سەبارەت بە ئیلاهیات بە شێوەیەكی نەبڕاوە دەستی بەرزكردبۆوە. بەڵام خودی میتافیزیكیا بێ یارمەتی ماتماتیك بێتوانا و سنووری نێوان میتافیزیكیا و ماتماتیك بە گشتی دیارنەبوو. سپینۆزا سیستەمێكی ئەخلاقی بە میتۆدی ئەندازەیی پێشكەش كرد. لایبنیتز تەنانەت لەمە زیاتر ڕۆیشت و لە بەكارهێنانی بنەما گشتییەكانی زانستی هەمەكی "*Scientia generalis*" خۆیدا و زمانی گشتی "*Characteristica unversalis*" خۆیدا بۆ چارەسەركردنی مەسەلە تایبەتی و عەمەلییە سیاسییەكان، هیچ دوودڵییەكی لە خۆی پیشان نەدا. كاتێك لە لایبنیتزیان پرسی تا ڕای خۆی لە بارەی ئەو مەسەلەیەوە دەربڕێ كە لە نێوان داواكەرانی تاج و سەڵتەنەتی نەمسا، كامیان ڕاست دەكەن، ئەو لە وەڵامدا وتارێكی نووسی كە تیایدا هەڵبژاردنی خۆی بۆ ستانسیلائۆس لتیزینسكی بە كۆمەڵێك بەڵگەی وێنەیی (صوری) سەلماند[4]. كریستیان وڵفی موریدی لایبنیتز كە شێوازی مامۆستاكەی پەیڕەو دەكرد، یەكەم كەس بوو كە لە بارەی مافی سرووشتییەوە كتێبێكی بە شێوازێكی تەواو ماتماتیكی نووسی[5].

بەڵام لێرەدا پرسیارێكی دی دێتە پێشەوە كە لە ڕووی پێشكەوتنی دوایی بیری سیاسییەوە، گرنگییەكی چارەنووسسازی هەیە. گریمان سەلماندنی هەقیقەتێكی سیاسی یان ئەخلاقی بە هەمان شێوەی سەلماندنی هەقیقەتێكی ماتماتیكی مومكین و تەنانەت پێویست بێت. بەڵام لە كوێدا دەتوانرێ بنەمای "*Principle*" سەلماندنێكی وا بدۆزرێتەوە؟ ئەگەر میتۆدی "ئەقلیدیسی" لە سیاسەتدا هەیە، كەوابوو دەبێ گریمانەی ئەوە بكەین كە لەم بوارەشدا كۆمەڵێك بنەمای بەڵگەنەویست هەیە كە ڕاست و دروستیان چەندوچوونی ناوێت. لێرەوە یەكەم ئامانجی هەر تیۆرەیەكی سیاسی بوو بەوەی كە ئەم بنەمایانە بدۆزێتەوە و فۆرمەلەیان بكات. ڕەنگە ئەم مەسەلەیە لە ڕوانگەی ئێمەوە تەمومژاوی و ئاڵۆز بێت، بەڵام بیریارانی سەدەی حەڤدەهەم وایان نەدەزانی. زۆربەیان بڕوایان وابوو كە ئەم پرسیارە بەرلەوەی بهێنرێتە ئاراوە، وەڵامەكەی دراوەتەوە. پێویست بە گەڕان بە دوای یەكەم بنەماكانی ژیانی كۆمەڵایەتی مرۆڤ ناكات، ئەم بنەمایانە لە پێشوەختەوە دۆزراونەتەوە. تەنها ئەوەندە بەسە كە جارێكی دی بەیانیان بكەین و فۆرمەلەیان بكەین، واتە بە زمانی لۆژیكی و زمانی چەمكە ڕوون و جیاوازەكان دەریانبڕین. بە پێی بڕوای فەیلەسووفانی سەدەی حەڤدەهەم ئەم كارە پتر كارێكی سلبی بوو نەك پۆزەتیڤ. هەموو ئەو شتەی كە دەبێت ئەنجام بدرێ بریتییە لەمە: ئەو هەورانەی كە تا هەنووكە نووری ڕووناكی عەقڵیان تاریك كردووە، پەرشوبڵاو بكەینەوە. واتە دەبێت هەموو ئەو یاوەرانەی كە لە پێشەوە دروستكراون و هەموو پێشداوەرییەكان، بخەینە لاوە. چونكە وەك سپینۆزا دەڵێت عەقڵ ئەو توانا سەرسوڕهێنەرەی هەیە كە هەم خۆی و هەم

دژەکەشی ڕوون بکاتەوە، هەم هەقیقەت و هەم درۆ کەشف دەکات.

عـــەقڵخوازی سیاســـی ســـەدەی حەڤدەهـــەم تازەکردنەوەی ژیانی ئەندێشەی ڕەواقییەکان بوو. ئەم ڕەوتە سەرەتا لە ئیتالیادا دەستی پێکرد و پاش ماوەیەکی کەم کۆی کلتووری ئەورووپی گرتەوە. ڕەواقیگەری تازە بە خێرایی لە ئیتاڵیاوە بۆ فەرەنسا و لەوێوە بۆ هۆڵەندا و ئینگلتەرا و کۆڵۆنیالیکراوەکانی ئەمەریکا ڕۆیشت و بڵاوبۆوە. لە بەناوبانگترین کتێبە سیاسییەکانی ئەم قۆناغە کاریگـەری ئاشـکرا و ڕوونـی زیـهنی ڕەواقـی دەبینرێ. تەنها لێکۆڵەرەوەکان یان فەیلەسووفان ئـەم کتێبانـەیان نـەدەخوێندەوە، بەرهـەمی وەك حیکمەت نووسینی پیر شارۆن وتارەکەی دوور بە ناوی لە بارەی سەقامگیری و هەبوونی سەبووری لە بەرامبەر بەڵا گشتییەکاندا و نووسینەکانی یۆستۆس لیپسیۆس بە ناوی لە بارەی سەقامگیری یان فەلسەفە و فیزیۆلۆژی ڕەواقییەوە، بووبوون بە جۆرێـك کتێبـی دوعـا لـە بـواری حیکمـەتی ئەخلاقیدا. کاریگەریی ئەم کتێبانە ئەوەندە بەهێز بوو کە تەنانەت لە بواری مەسەلەکانی سیاسەتی پراکتیکیدا هەست بە بوونیان دەکرا. لە فێرکردنی شازادەکاندا ئەم وتارە تازانە جێگەی وتارەکانی سەدەی ناوەڕاست وەك میر و شێوازی میرێتی و لە بارەی دەزگای سەڵتەنەتەوەیان گرتەوە. بۆ نموونە لە چارەنووسی کریستینای مەلیکەی سویدەوە بـەوە دەگـەین کـە یەکـەم فێرکـەرانی بـۆ ئاشـناکردنی بـە مەسـەلە سیاسـییەکان هیـچ ڕێگەیەکیان باشتر لە خوێندنەوەی بەرهەمەکانی لیپسـیوس و نووسـەرانی کلاسـیکی ڕەواقـی، نەدەدۆزییەوە[6].

کاتێك کە لە ساڵی *1776*دا هاوڕێیانی توماس جفرسۆن داوایان لێکرد ڕەشنووسی ڕاگەیاندنی سـەربەخۆیی ئـەمریکا ئامـادە بکـات، ئـەو ڕاگەیاندنەکەی بەم دەستەواژە بەناوبانگە دەست پێکرد: "ئێمە بڕوامان وایە کە ئەم ڕاستییانە بەڵگەنەویستن: هەموو مرۆڤەکان یەکسان لەدایك دەبن و خواوەندەکەیان چەندان مافی پێبەخشیون کە قابیلی لێسەندنەوە نین، لەو مافانە کە قابیلی لێسەندنەوە نییە، مافی ژیان، مافی ئازادی و مافی بەدەستهێنانی خۆشبەختییە. حکوومەتەکان لەناو خەڵکدا بۆ دابینکردنی ئەم مافانە دروست دەبن و دەسەڵاتی دادپەروەرانەی خۆیان بە ڕەزامەندی حکوومـەتکراوەکان بەدەسـت دەهێنـن" کـاتێك جفرسۆن ئەم دەستەواژانەی دەنووسی، ڕەنگە بیزانیایە کە بە زمانی فەلسەفەی ڕەواقی قسە دەکات. بەڵام ئەم زمانە بووبوو بە زمانێکی باو، چونکە لە سەردەمی لیسپسیۆس و گرۆتیۆسەوە چەمکە ڕەواقییەکان، بووبوو بە زمانی هاوبەشی بیریارە سیاسییە مەزنەکان. ئەم چەمکانە "*ideas*" وەك بنەمایەکی بناغەیی باو دەناسران کە قابیلی شیکردنەوەی زیاتر نییە و پێویستییان بە سەلماندن نییە. چونکە ئەم چەمکانە زاتی مرۆڤ و خەسڵەتی عەقڵی ئەویان دەردەبڕی. پێش لە دەرچوونی بەیاننامەی سەربەخۆیی ئەمریکا، ڕووداوێکی زۆر گەورە ڕووی دابوو کە ڕێگەی بۆ دەرکردنی ئەو بەیاننامەیە خۆش کردبوو کە ئەویش بەیاننامەی سەربەخۆیی عەقڵە کە لە

بەرهەمی تیۆرەزەنانی سەدەی حەڤدەهەمدا دەیدۆزینەوە. هەر لێرەدا بوو عەقڵ بۆ یەکەمجار، دەسەلاّتی خۆی بۆ فەرمانڕەواییکردن بەسەر ژیانی کۆمەلاّیەتی مرۆڤدا ڕادەگەیاند. عەقڵ خۆی لە سەرپەرشتی ئیلاهییات ئازاد کردبوو، دەیتوانی لەسەر پێی خۆی بە سەقامگیری ڕابوەستێ. مێژووی ڕاپەڕینی عەقلاّنی مەزن کە لوتکەی گەیشتە دەرچوونی بەیاننامەی مافەکانی ئەمەریکا و بەیاننامەی مافەکانی مرۆڤ و هاولاّتی لە فەرانسا، بە هەموو وردەکارییەکانییەوە تاوتوێ کراوە. هەنووکە پێدەچێ هەموو بەڵگەکانی ئەم مێژووەمان لەبەردەستدا بێت، بەلاّم زانینی ئەم بەڵگانە بەس نییە، بەڵکو دەبێت هەوڵ بدەین کە تێیان بگەین. دەبێ لێکۆڵینەوە لە بارەی هۆی وجودییانەوە بکەین. ئەم هۆکارانەش بە هیچ شێوەیەك ئاشکرا نین. پێدەچێت تا ئەم کاتە ئەم پرسیارە وەلاّمێکی قانعکەری نەدۆزیبێتەوە. چۆن بوو ئەو ئەندێشانەی کە لە دوو هەزار ساڵ پێشەوە ناسرابوون و بە درێژایی ئەو ماوەیە بەردەوام لێیان کۆڵراوەتەوە، لەناکاو لەژێر ڕووناکییەکی تازەدا دەرکەوتن؟ چونکە کاریگەریی ئەندێشەی ڕەواقی بەردەوام نەپچڕاو بووە. دەکرێ کاریگەرییەکی لە مافەکانی ڕۆم و تێزەکانی باوکانی کەنیسا و لە فەلسەفەی سکولاستیکدا بدۆزرێتەوە[7]. بەلاّم لە هەموو ئەم حاڵەتانەدا بیری ڕەواقی تەنها بابەتی سەرنجدانی تیۆری بووە و کاریگەری عەمەلی ڕاستەوخۆی نەبووە. گرنگی عەمەلی ئەم ڕووداوە بەهێزەی ئەندێشە تا سەدەی حەڤدەهەم و هەژدەهەم بەدیار نەکەوت. بەلاّم لەوە

بەدواوە تیۆرەی مافی سرووشتی مرۆڤ چیدی تیۆرەیەکی ئەخلاقی موجەڕەد نەبوو، بەڵکو بوو بە یەکێك لە سەرچاوە سەرەکییەکانی کرداری سیاسی. چۆن ئەم گۆڕانکارییە ڕووی دا؟ چ شتێك تازەیی و ڕەسەنایەتی بەخشی بە ئەندێشە ڕەواقییە کۆنەکان و ئەو هێزە بێوێنە و ئەو دەورە گرنگەی پێبەخشین لە شکڵدان بە زیهنی تازەگەر و جیهانی مۆدێرن؟

ئەگەر ئەم دیاردەیە بە شێوەیەکی ڕووکەشی تەماشا بکەین، لە ڕاستیدا ناکۆکیئامێز دێتە پێشچاو و لەگەڵ کۆی ئەو باوەڕانەوە کە لە بارەی خەسڵەتی گشتی سەدەی حەڤدەهەمەوە هەمانە، دەکەوێتە ناکۆکییەوە. ئەگەر تایبەتمەندییەك هەبێت کە خەسڵەتی ئەو سەردەمە و بە نیشانەی جیاکەرەوەی هەمووی دابنرێ، تەهوری عەقلاّنی و ڕادیکالییەتی بیرکردنەوەیەتی. فەلسەفەی دیکارت بەم بنەما دانراوە گشتییە دەستی پێ کردبوو کە هەر مرۆڤێك دەبێت لە ژیانی خۆیدا بە یەکجار هەموو ئەو شتانە لەبیر خۆی بەرێتەوە کە فێری بووە. هەموو مەرجەعەکان /وەك کتێبی پیرۆز، کەنیسا و پاپ/ ڕەد بکاتەوە و دژی دەسەلاّتی نەریت ڕابوەستێ. ئەم خواستە دیکارتییە گەیشت بە لۆژیك و ئەبستمۆلۆژیایەکی تازە، ماتماتیك و میتافیزیکیایەکی تازە و فیزیا و گەردووناسییەکی تازە. بەلاّم لە سەرنجی یەکەمدا وا دێتە پێشچاو کە ئایدیالی تازەی دیکارتی کاری نەکردۆتە سەر بیری سیاسی سەدەی حەڤدەهەم و ئاراستەی تازەی پێ نەبەخشیون، بەڵکو بە پێچەوانە وەك ئەوەی بیری سیاسی سەدەی

حەڤدەهەم بەردەوامی بە ڕێگەی تەقلیدی دەدا کە تێپەڕینی زەمان کاری تێنەکردووە. دەکرێ چ هۆیەك بۆ ئەم مەسەلەیە بدۆزینەوە؟ گومانی تێدا نییە کە زەمینەی گشتی شارستانییەتی سەدەی حەڤدەهەم وەك زەمینەی کلتووری یۆنانی– ڕۆمی نەبوو. هەلومەرجی عەقڵی، دینی و کۆمەڵایەتی و ئابووری بە تەواوی گۆڕابوو. چۆن بیریارێکی جدی دەیتوانی مەسەلەکانی ئەم سەردەمە واتە مەسەلەکانی جیهانی مۆدێرن، بە قسەکردن لە قاڵبی زاراوە و بیرکردنەوە لە چوارچێوەی کۆمەڵێ چەمکدا کە دوو هەزار ساڵ لەمەوپێش دروستبووبوون، چارەسەر بکات؟ هۆیەکی دوولایەنە هەیە کە ڕەنگە ئەم مەسەلە واقعییە ڕوون بکاتەوە. ئەوەی لێرەدا گرنگە ئەوەندە ناوەڕۆکی تیۆرەی ڕەواقی نییە، بەڵکو ئەو دەورەیە کە ئەم تیۆرەیە دەبوایە لە وتوێژە سیاسی و ئەخلاقییەکانی جیهانی مۆدێرندا بیبینیایە. بۆ تێگەیشتن لەم دەورە دەبێ بگەڕێینەوە بۆ هەلومەرجێکی تازە کە ڕێنسانس و بزووتنەوەی ڕیفۆرم دەستی پێکردووە. کۆی ئەو پێشکەوتنە مەزنە و نکوڵی لێنەکراوەی کە لە ڕێنسانس و بزووتنەوەی ڕیفۆرمەوە بەدەست هات، بە هۆی زیانێکی چارەسەر هەڵنەگرەوە، خونسا بۆوە. بەو مانایەی کە یەکێتی و هاوئاهەنگی دەروونی کلتووری سەدەکانی ناوەڕاست لەناو چوو. بێگومان سەدەکانی ناوەڕاست لە ناکۆکییە قووڵەکانی دوور نەبوو. ململانێی نێوان کەنیسا و دەوڵەت هەرگیز کۆتایی نەهات و وتوێژ لە بارەی مەسەلە لۆژیکی، میتافیزیکییەکان و ئیلاهییات، دوایی نەدەهات. بەڵام ئەم وتوێژانە هەڕەشەی لە بناغەی ئەخلاقی و دینی شارستانێتی سەدەکانی ناوەڕاست نەدەکرد. وتوێژ لە نێوان واقعگەرەکان و ئیسمییەکان، عەقڵگەرەکان و عاریفەکان، فەیلەسووفان و موتەکەلیمەکان لەسەر بنەمایەکی هاوبەش ئەنجام دەدران و هەرگیز گومانیش لەم بنەمایە نەدەکرا. بەڵام پاش سەدەکانی پانزەهەم و شانزەهەم ئەم بنەمایە لەرزا و هەرگیز سەقامگیری پێشووی خۆی بەدەست نەهێنایەوە. زنجیرە پلەکانی بوون کە جێگەی شایستە و ڕاستەقینە بێچەندوچوونی بەهەر شتێك لەناو سیستەمی گشتی شتەکاندا دەبەخشی، لەناو چوو. پاش لەناوچوونی تێزی خۆر–ناوەندی، مرۆڤ ئەو جێگە گرنگەی لەدەست دا کە خاوەنی بوو، وەك ئەوەی مرۆڤ لەناو گەردوونی بێپایاندا تا پلەی مەنفییەك دابەزی بێ. ئەو درزەی کە کەوتە ناو کەنیساوە، بناغەی تێزە مەسیحییەکانی تووشی مەترسی کرد و لەرزاندنی. جیهانی دینی و جیهانی ئەخلاقی چیدی خاڵێکی پشتیوانی جێگری نەبوو. یەکێك لە گەورەترین بیریارەکانی ئەو سەدەیە واتە لایبنیتز، بێ ڕاوەستان سەرقاڵی ئەم مەسەلەیە بوو. وە جدیترین هەوڵەکانی دا بۆئەوەی فۆرمێك بۆ یەکێتی سەرلەنوێی کەنیسە مەسیحییە جیاوازەکان بدۆزێتەوە بەڵام هەموو ئەم هەوڵانە بێ ئەنجام بوون. چونکە ئەو مەسەلەیە ڕوون دەبۆوە کە لەناو دەروونی خودی کەنیسادا، چیدی "کۆگیری" پێشوو قابیلی دووبارەکردنەوە نییە. ئەگەر دەبوایە سیستەمێکی بە ڕاستی گەردوونی لە ئەخلاق یان دین درووست بووایە،

ئەوا دەبوو لەسەر بناغەی بنەمایەکی وا بێت کە نەتەوە و مەزهەب و گروپێك قبوولْ بکات. تەنهاش ڕەواقیگەری دەیتوانی خواستی وا بەدی بهێنێ. لێرەوە ڕەواقیگەری بوو بە بناغەی دینی "سرووشتی" و بناغەی سیستەمی مافی سروشتی. فەلسەفەی ڕەواقی نەیدەتوانی یارمەتی مرۆڤ بدات کە مەتەڵە میتافیزیکییەکانی جیهان چارەسەر بکات. بەڵام فەلسەفەی ڕەواقی بەڵێنێکی مەزنتر و گرنگتری دەدا: بەڵێنی گەڕانەوەی ئابڕوو و بەهای ئەخلاقی مرۆڤ، فەلسەفەی ڕەواقی دەیگوت کە ئەم بەها و ئابڕووە قابیلی لەناوچوون نییە، چونکە نەبەستراوەتەوە بە باوەڕێکی دۆگمایی یان بە وەحییەکەوە کە لە دەرەوە بۆ مرۆڤ هاتۆتە خوارەوە. ئەم بەها و ئابڕووە تەنها لەسەر بناغەی ئیرادەی ئەخلاقی ڕاوەستاوە، واتە لەسەر بناغەی بەهایەك ڕاوەستاوە کە مرۆڤ بۆ خۆی داناوە.

ئەو خزمەتە بەنرخ و مەزنەی کە تیۆرەی مافە سرووشتییەکان دەبوو پێشکەش بە جیهانی مۆدێرنی بکات، لە ڕاستیدا هەر ئەمە بوو. پێدەچوو بێ تیۆرەی مافە سرووشتییەکانی مرۆڤ، ڕێگەیەك بۆ دەربازبوون لە ئاژاوەی کاملّی ئەخلاقی بوونی نەبێت. بۆسۆئە کە یەکێك لە گەورەترین موتەکەلیمەکانی سەدەی حەڤدەهەم بوو، وە هێشتا بە نوێنەری بیرکردنەوەی نەریتی کەنیسای کاسۆلیك، بەهێزە کۆنەکەی و یەکێتییە دەروونییەکەیەوە، دەژمێررا، ناچار بوو چەندان گۆڕانکاری لە باوەڕەکانیدا بکات. چونکە گەر باوەڕە مەسیحییە دۆگماییەکان بیانەوێت لە سەردەمی تازەدا، واتە لە سەردەمی لویسی چواردەهەم بە پێوە بمێننەوە، دەبێ چەندان گۆڕانکاری تیا ئەنجام بدرێ و هیچ ڕێگەیەکی دەربازبوون لەم گۆڕانکارییانە نییە. لوی چواردەهەمیان بە پاسەوان و بەرگریکاری دینی مەسیحی دەزانی و لەم ڕووەوە ستایشیان دەکرد و ناویان نابوو "سوڵتانی پشت و پەنای مەسیحییەت". بەڵام دەربارەکەی بە زەحمەت جێگەیەك بوو بۆ بڵاوکردنەوە و هێشتنەوەی درووشمەکانی مەسیحییەت.

ململانێی شاراوەی سەدەی لویی چواردەهەم لە ناکاو لە ململانێی نێوان "یانسن نیزم" و "ژزوئیتیزم"دا ئاشکرا بوو. ئەستەمە لە یەکەم سەرنجدا بتوانین لە مانا و مەبەستی واقعی ئەم ململانێیە تێبگەین. ئەگەر خوێنەرێکی ئەمڕۆیی بەرهەمە مەزنەکەی یانسن لە بارەی قەدیس ئەگۆستینەوە بخوێنێتەوە لە تێگەیشتنی ئەو خاڵە سەری دەسوڕمێ کە چۆن کتێبێکی وا توانیویەتی جەنجاڵییەکی وا بنێتەوە. چۆن مومکینە کتێبێك کە لەبارەی ئیلاهییاتی



تۆماس هۆبز

سکۆلاستیکەوەیە، بەرهەمێك کە داخراوترین و ئاڵۆزترین پرسیارە دۆگماییەکانی تاوتوێ دەکرد، بتوانێ کۆی سیستەمی ئەخلاقی و کۆمەڵایەتی

بلەرزێنێ و كاریگەرییەكی هێندە مەزن بكاتە سەر ژیانی گشتی فەرەنسییەكان؟

وەڵامی ئەم پرسیارە لە كاتی خوێندنەوەی یەكێك لە شاكارە ئەدەبییەكانی سەدەی حەڤدەهەمی فەرەنسادا دەدۆزینەوە. باسكالیش لە بەرهەمێكی خۆیدا "نامە ویلایەتییەكان" باسەكەی خۆی لە ناسكترین مەسەلەكانی ئیلاهییاتی دۆگماییەوە دەست پێدەكات: ئەو لێكۆڵینەوە لە بارەی جیاوازی نێوان فەیزی "بەس/ *Suffcient*" و فەیزی "كاریگەر/ *efficacious*" و جیاوازی نێوان دەسەڵاتی "واقعی" و دەسەڵاتی "نزیكەیی (تەقریبی)" ئیرادەی مرۆڤ لە ئەنجامدانی ئەركە خوداییەكاندا، دەكات. بەڵام هەموو ئەم باسانە پێشەكییەكە و باسكاڵ لە ناكاو و بە شێوەیەكی چاوەڕوان نەكراو، بابەتی باسەكەی خۆی و تاكتیكەكەی دەگۆڕێت. ئەو لە لایەكەوە هێرش دەكاتە سەر نەیارەكانی كە قابیلی گرتنن. ئەو ئاڵۆزی و دەربڕینە خراپەكانی سیستەمی ئەخلاقی یەسوعی تاوانبار دەكات. باسكاڵ وەك موتەكەلمێك قسە ناكات. زیهنی باسكاڵ پتر زیهنێكی لۆژیكی و ماتماتیكی بوو تا زیهنێكی كەلامی. لێرەوە ئەو تەنها بەوەوە واز ناهێنێ كە خراپ باسی ئیلاهیاتی ئەخلاقی یەسوعی بكات. ئەو دەبوو بە دوای ئەنگێزە شاراوەكاندا بگەڕێت، هەم بە دوای ئەنگێزە لۆژیكییەكاندا و هەم بە دوای ئەنگێزە ئەخلاقییەكاندا. باسكاڵ دەپرسێت چ شتێك بۆتە هۆی ئەوەی نووسەرە یەسووعییەكان كتێبەكانی "رێگەی چارەسەركردنی كێشە ئەخلاقی و وێژدانییەكان" بنووسن و پڕوپاگەندەی بۆ بكەن؟ بە بڕوای باسكاڵ دەكرێ وەڵامی ئەم پرسیارە بە یەك وشە بدرێتەوە. یەسووعییەكان ئەندامانی خەباتگێری كەنیسا بوون. ئەوان دوا هەوڵی خۆیان دا بۆئەوەی مەرجەعییەت و دەسەڵاتی رەهای پاپ و كەنیسا بمێنێتەوە. بە بڕوای ئەمان بۆ گەیشتن بەم ئامانجە هیچ بەهایەك بە بێهودە نەدەزانرا. ئێستا لە جیهانی مۆدێرندا لە سەدەی لوی چواردەهەمدا ئیدی و زوهد و تەقوای كۆنی درووشمە مەسیحییەكان جێگەی نەدەبۆوە. كەوابوو دەبێ ئەم درووشمانە قوربانی بكرێن. پێدەچوو كە ئەخلاقی تازە واتە ئەخلاقی ئاسانگیری یەسووعییەكان، تاكە رێگەیەك بێت كە دەتوانێ كەنیسا رزگار بكات یان ئەو شتە رزگار بكات كە لە روانگەی نووسەرە یەسووعییەكانەوە لەگەڵ كەنیسادا یەك شت بوو: واتە دینی مەسیحی. شیكردنەوەی لۆژیكی و وردبینانەی باسكاڵ ئەم پێشەكییانەی سیستەمی یەسووعی ئاشكرا دەكرد. باسكاڵ دەری خست كە ئەخلاقی یەسووعی دەرئەنجامی پێویستی سیاسەتی یەسووعە، باسكاڵ رایدەگەیەنێت:

"مەبەستی یەسووعییەكان گەندەڵكردنی ئەخلاق نییە، پرۆژەكەی ئەوان ئەمە نییە، بەڵام تاكە ئامانجیشیان ریفۆرمی ئەخلاقی نییە، چونكە ئەمە سیاسەتێكی خراپ دەبێت. ئامانجی ئەوان ئەمەیە: یەسووعییەكان ئەوەندە رای باشیان لە بارەی خۆیانەوە هەیە كە بڕوایان وایە ئەم مەسەلەیە سودمەند و لە هەندێك لایەنەوە بۆ خێری دینیش پێویستە كە ناوبانگیان بە هەموو

شوێنێکدا بڵاوبێتەوە و بەسەر ویژدانەکاندا زاڵ بن. لەبەرئەوەش کە ئەرکە سەختەکانی ئەنجیل تەنها بۆ هەندێك کەسی تایبەتی قابیلی پەیڕەوکردنە، ئەوا یەسووعییەکان لەم هەلومەرجانەشدا سوود لەو ئەرکانە بۆ پێشخستنی ئامانجەکانی خۆیان وەردەگرن. لەبەرئەوەش کە هەر ئەم ئەرکانە لەگەڵ باوەڕی زۆرینەی خەڵکدا ناگونجێت، ئەوان بۆ بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خەڵکی، لەم هەلومەرجانەدا چاو لەم ئەرکانە دەپۆشن. یەسووعییەکان لە ژیاندا مامەڵە لەگەڵ کەسانی جیاوازدا دەکەن و لەگەڵ نەتەوەی جیاوازدا سەروکاریان هەیە، ئەم هەلومەرجە وا پێویست دەکات کە یەسووعییەکان خەڵکی جیاوازیان هەبێت بۆئەوەی بتوانن کێشە ئەخلاقی و ویژدانییەکانی ئەم ژمارە بەرفراوانە چارەسەر بکەن.. لە نێوانیاندا کەسانێك کە لایەنگری سەختگیریی ئەخلاقیین لە خزمەتی ژمارەیەکی کەمدا دەبن، لە کاتێکدا کۆمەڵێك تەفسیرکەری ئاسانگیر، خزمەتەکانی خۆیان پێشکەش بە خەڵکانێك دەکەن کە خوازیاری لێکبوردنی ئەخلاقین. لەم ڕووەوە یەسووعییەکان بە سەرتاسەری زەمیندا بڵاوبوونەتەوە تا ڕێبازی باوەڕە موحتەمەلەکان بڵاو بکەنەوە کە سەرچاوەی هەموو ئەم ناڕێکوپێکییەیە.. ئەوان ئەم مەسەلەیە ناشارنەوە.. بەو جیاوازییەوە کە یەسووعییەکان دووربینی مرۆیی و سیاسیی خۆیان لەژێر سەرپۆشی دوورئەندێشەی خواوەندی و مەسیحیدا دەشارنەوە. وەك ئەوەی باوەڕ و نەریتی پارێزەری باوەڕ، لە هەموو کات و شوێنەکاندا هەمیشە نەگۆڕ و یەك شت بێت. وەك ئەوەی بڕیار وابووە کە لە بری ئەوەی کەسێك مل بۆ یاسا کەچ بکات، بەشێك لە یاسا بە پێی مەیلی کەس بگۆڕێت"[8].

ئەمە درزێکی قووڵ و بەرفراوان بوو بە شێوەیەك کە موتەکەلیمەکانی بەسەر دوو ئۆردوگادا دابەش کرد. هەر ئەوەی کە ئەم درزە بە ئاشکرا بینرا، ئیدی فەرامۆشکردنی چیدی بۆیان مومکین نەبوو. پاش بڵاوبوونەوەی بەرهەمەکەی باسکاڵ، "نامە ویلایەتییەکان" ئیدی نە ئاشتی مومکین بوو نە سازشکردن. تەنها یەك ڕێگا مابۆوە. مرۆڤ دەبوو لە ڕەفتاری ئەخلاقی خۆیدا لە نێوان ئەم دوو شێوە بەرامبەر یەکەدا، یەکێکیان هەڵبژێرێت: یان فەرمانە سەختگیرانەکانی گرووپی یانسەنی قبووڵ بکات یان ئەخلاقی ئاسانگیرانەی یەسووعییەکان. بەڵام ئایا فەلسەفە لەم نێوەدا چ هەڵوێستێکی هەبوو؟ ئایا دەکرێ چاوەڕێی ئەوە لە هاوچەرخانی گالیلۆ و دیکارت بکرێت کە بگەڕێنەوە بۆ تێزەکانی ئەگۆستینی قەدیس لە بارەی فەیزی ئیلاهی و ئیرادەی ئازادەوە؟ ئایا فەلسەفەی سەدەی حەڤدەهەم، فەلسەفەی "چەمکە ڕوون و دیارەکان" دەیتوانی بگەڕێتەوە بۆ جیاوازی سکۆلاستیکانەی فەیزی "بەس" و فەیزی "کاریگەر" و فەیزی "پەیوەست" و فەیزی "موجبە"؟ ئایا هیومانیستێك و فەیلەسووفی ئەخلاق و زیهنێکی مەزن و گەورەی وەك هۆگۆ گروتیۆس دەیتوانی مل بۆ ئەخلاقی ئاسانگیرانەی یەسووعییەکان بدات؟ هەم گەڕانەوە بۆ ئەگۆستین

و هەم پەیڕەوکردنی یەسووعییەکان، شتێکی ناشیاو بوو. بەڵام بیریارانی فەلسەفی سەدەی حەڤدەهەم پێویستییەکیان بە ئەخلاقێك نەبوو کە پشت بە ئیلاهییات ببەستێ، ئەوان تەنانەت لەسەر ئەو باوەڕە بوون کە هەر چەمکێکی ئەمجۆرە ئیلاهییاتە /=ئیلاهییاتێك کە بنەمای ئەخلاق بۆ مرۆڤ دادەنێ/ بە مانایەك هەڵگری ناکۆکییە. چونکە ئەوان بنەمای ڕەواقی "خودموختاری" عەقڵی مرۆڤیان قبوڵ کردبوو. عەقڵی مرۆڤ سەربەخۆیە و پێویستی بە هیچ یارمەتییەکی دەرەکی (لە دەرەوەی خۆی) نییە. تەنانەت گەر پێشنیارێکی وا بۆ عەقڵ بکرێت، ئەوا قبووڵی نەدەکرد. عەقڵ دەبێ ڕێگەی خۆی بدۆزێتەوە و بڕوای بە هێزی خۆی هەبێت.

ئەم بنەمایە بوو بە بناغەی هەموو ئەو سیستەمانەی کە باسی مافە سروشتییەکان دەکەن. هۆگۆ گرۆتیۆس لە پێشەکی مافەکانی جەنگ و ئاشتیدا ئەم بنەمایەی بە شێوەیەکی کلاسیکی دەربڕیووە. ئەو دەڵێت تەنانەت ئیرادەی بوونێکی بە توانای ڕەها، ناتوانێ بنەماکانی ئەخلاق بگۆڕێت یان ئەو مافە سەرەکییانە بسڕێتەوە کە یاسا سرووشتییەکان زامنیان دەکات. تەنانەت گەر گریمانەی ئەوە بکەین —دیارە گریمانەیەکی مەحاڵ— کە خودایەك نییە یان ئەو گوێ بە مەسەلەکانی مرۆڤ نادات، ئەوا ئەم یاسایانە هەر بەهای بابەتی خۆیان دەپارێزن[9].

خەسڵەتی عەقڵانی فەلسەفەی سیاسی سەدەی حەڤدەهەم تەنانەت لەمەش ڕوونتر دەبێت گەر لە بری شیکردنەوەی بنەما سەرەتاییەکانی، سەرنج لە شێوازە گشتییەکەی بدەین. لە بارەی پرسیاری پەیوەندیدار بە ڕێکخستنی کۆمەڵایەتییەوە ناکۆکییەکی توند لە نێوان ڕژێمە ڕەهاکانی بۆدن و هۆبز لە لایەك و بەرگریکەرانی مافەکانی خەڵکی و دەسەڵاتدارێتی جەماوەر لە لایەکی دیەوە، دەدۆزینەوە. هەرچەندە هەردوو گرووپ دژی یەك دەجەنگن، بەڵام لەسەر خاڵێك پێکەوە تەبان. ئەو خاڵەش ئەوەیە کە هەردوو گرووپ هەوڵدەدەن تا دیدی خۆیان بە پشتبەستن بە گریمانەیەك بسەلمێنن. تیۆرەی دەوڵەت لەسەر بناغەی پەیمان لە بیری سیاسی سەدەی حەڤدەهەمدا دەبێت بە بنەمایەکی باوی بەڵگەنەویست.

لەو مێژووەدا کە جێی لێکۆڵینەوەی ئێمەیە، ئەم مەسەلەیە ئاماژەیە بۆ هەڵهێنانی هەنگاوێکی مەزن و بڕاوە. چونکە گەر تیۆرەی پەیمان قبوڵ بکەین، واتە گەر ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی و یاسایی کورت بکەینەوە بۆ کاری ئازادی تاکەکان یان بۆ فەرمانبەرداری ئیرادییانەی حکوومەتکراوەکان، ئەوا چیدی نهێنییەك /لە بارەی سەرچاوەی کۆمەڵگە، دەوڵەت و یاسا/ نامێنێتەوە. چونکە پەیمان نهێنی و شتی شاراوەی نییە.

پەیمانێك دەبێت بە هوشیاربوون لە ناوەڕۆك و دەرئەنجامەکانی ببەسترێ. بەستنی پەیمانیش لەسەر ئەو پێشگرمانەیە دامەزراوە کە هەموو ئەنجامدەرانی بە هەڵبژاردن و ڕازیبوونی خۆیان ئەم کارەیان ئەنجام داوە. ئەگەر بکرێ دروستبوونی دەوڵەت بگەڕێنرێتەوە بۆ سەرچاوەیەکی لەم چەشنە، ئەوا لەم حاڵەتەدا

دەوڵـەت دەبـێ بـە شـتێکی زۆر ڕوون کـە قـابیلی تێگەیشتنە.

دیارە ئەم ڕێبازە عەقڵانییە بە هیچ شێوەیەك بە مانای ڕێبازی مێژوویی دانانرێت. تەنها هـەندێك بیریـاری سـاویلکە هـەبوون کـە وایـان دەزانـی "سـەرچاوەی" دەوڵـەت بـەو شـێوەیەی کـە لـە تیۆرەی پـەیمانی کۆمەڵایـەتیدا ڕوون دەکرێتـەوە، ڕووناکییـەك لـە بـارەی پـەیدابوونی مێـژووی دەوڵەتەوە دەدات بە دەستەوە. ئاشکرایە ناتوانرێ ساتەوەختێکی دیاریکراو لە مێژوودا دەستنیشـان بکرێت و بگوترێت ئەو لەو ساتەوەختەدا دەوڵـەت بۆ یەکەم جار دەرکەوتووە. بەڵام نەبوونی زانیاری مێژوویـی لـەم بارەیـەوە، پـەیوەندی بـە کـاری تیۆریزەکـانی دەوڵـەت لەسـەر بناغـەی پـەیمانی کۆمەڵایەتی نییە. مەسەلەکەی ئەمان مەسەلەیەکی شیکارییە، نـەك مێژوویـی. ئـەوان مەبەسـتیان لـە "سـەرچاوە" مانـا لۆژیکییەکەیـەتی، نـەك مانـا ڕۆژمێرییانەکەی. ئەوەی ئەوان بە دوایدا دەگەڕێن سەرەتایەکی زەمەنی نییە، بەڵکو بنەمای دەوڵـەت یان هۆی ئەنتۆلۆجییەتی.

ئـەم مەسـەلەیە ئەوکاتـە ڕوونـتر دەبێتـەوە کـە فەلسـەفەی سیاسـی هۆبـز بخوێنینـەوە. هۆبـز نموونـەی ئـەو جـۆرە ڕۆحـە (*Spirit*) گشـتیەیە کـە بـووە هـۆی چـەندان تیـۆرەی جیـاواز لـە بـارەی پەیمانی کۆمەڵایەتییەوە. ئـەو دەرەنجامانـەی کـە ئـەو لـە تیـۆرەی کۆمەڵایەتییـەوە وەریگـرت، بـە شـێوەیەکی گشـتی قبوڵنـەکرا و دژی ڕاوەسـتان. بـەڵام شـێوازەکەی هۆبـز کاریگەرییـەکی زۆری هـەبووە. ئەم شێوازە تازەیـە دەرەنجـامی لۆژیکـی هۆبز بوو. نرخی فەلسەفی بەرهەمە سیاسییەکانی هۆبـز ئـەوەندە لـەو بابەتانـەدا نییـە کـە لێـی دەکۆڵێتـەوە، بـەڵکو پـتر لـە فۆرمـی بەڵگاندنەکانیایـەتی. هۆبـز لـە فەسـڵە سـەرەتاییەکانی کتێبەکـەی خۆیـدا لـەبارەی چوارچێوەی کۆمەڵایەتییەوە، تیۆرەی گشتی خۆی لـە بـارەی ناسـینەوە پێشـکەش دەکـات. ناسـین، لێکۆڵینەوەیە لە بارەی سـەرەتاترین بنەماکانـەوە یـان بـە وتـەی خـۆی لێکۆڵینەوەیـە لـە بـارەی "سەرەتاترین هۆکانەوە" بۆ ئەوەی لە شتێك یان بابەتێك تێبگەین دەبێت خەسڵەت و خودی خۆی پێناسـە بکـەین. هـەر ئـەوەندەی ئـەو پێناسـەیە دەرکەوت ئیدی دەکرێ هـەموو خەسـڵەتەکانی بـە شێوەیەکی تەواو قیاسی، بەدەست بهێنین، بەڵام تا ئەو کاتەی پێناسەکە لە چوارچێوەی دیاریکردنی چۆنایەتییەکی تایبەتی بابەتەکەدا سنووردار بێت، ئـەوا ناسـینی ئێمـە بـۆ بابەتەکـە کـەموکوڕ و نابەجێیە. پێناسە ڕاستەکان، پێناسی "پێکهاتەیی (تکوینـی)" و پێناسـی "هۆکـایی". ئـەم جـۆرە پێناسانە نەك تەنها دەبێت وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەنەوە کە شتێك چییە، بەڵکو دەبێت بڵێن کە ئەو شتە بۆچی هەیە. تەنها لەم ڕێگەیەوە دەتوانین بە ڕوانینێکی درووست بگەین. هۆبز دەڵێت لەوێدا کە "دروسـتکردنێك" نییـە، ناسـینی فەلسـەفی ڕاستەقینەش نییە[10]. بەڵام ئەم "دروستبوونە" بە هیچ شێوەیەك پرۆسەیەکی فیزیایی یان مێژوویی نییـە. هۆبـز تەنانـەت لـە بـواری ئەندازیاریشـدا خوازیاری پێناسی "درووستکەر" یان "هۆیییـە". شکڵ و بابەتە ئەندازەیەکان بۆ ئەوەی بە تـەواوی دەرك بکرێن، دەبێ دروست بکرێن. ئاشکرایە کـە ئەم کارە دروستکردنی پرۆسەیەکی زیهنییە نـەك پرۆسـەیەکی زەمـەنی. ئـەوەی بە دوایدا دەگـەڕێین سـەرچاوەیەکە لـە عـەقڵدا، نـەك سـەرچاوەیەك لـە

زەمەندا. ئێمە هەوڵ دەدەین کە شکڵە ئەندازەییەکان ورد بکەینەوە بۆ ڕەگەزە سەرەتاییەکانی و جارێکی دی بە هۆی پرۆسەیەکی دروستکردنەوە ئەندێشەکانی بونیاد دەنێینەوە. /بۆ نموونە بارستە بۆ ڕووبەر و ڕووبەر بۆ هێڵ و هێڵیش بۆ خاڵ ورد دەکەینەوە/ هەر ئەمە لە بارەی مەسەلە سیاسییەکانیشەوە ڕاستە. کاتێك هۆبز گواستنەوە لە دۆخی سرووشتییەوە بۆ دۆخی کۆمەڵایەتی وەسف دەکات، مەبەستی ئەو سەرچاوەی ئەزموونی دەوڵەت نییە. ئەو بابەتەی لێرەدا باس دەکرێت، مێژووی ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی و سیاسی نییە، بەڵکو بەهای ئەمجۆرە ڕێکخستنەیە. ئەوەی جێگەی گرنگیپێدانە بنەمای مێژوویی دەوڵەت نییە، بەڵکو بناغەی یاسایی دەوڵەتە، هەر ئەم پرسیارە بناغەی یاسایی دەوڵەتە کە تیۆرەی پەیمانی کۆمەڵایەتی وەڵامی دەداتەوە.

تیۆرەی هۆبز لەم دەربڕینەدا کە ناکۆك دێتە پێشچاو بە لوتکەی خۆی دەگات کە هەر ئەوەندەی پەیوەندیی یاسایی نێوان فەرمانڕەوا و فەرمانبەران بەسترا، ئیدی قابیلی هەڵوەشاندنەوە نییە. پەیمانی ملکەچی کە بەپێی ئەم پەیمانە تاکەکان دەستبەرداری ماف و ئازادییەکانی خۆیان دەبن، پێشگریمانەیەکی پێویستە یان یەکەم هەنگاوە کە دەبێتە هۆی بەرپابوونی ڕێکخستنی کۆمەڵایەتی. بەڵام ئەم هەنگاوە سەرەتاییە لە هەمان کاتدا بە مانای دوا هەنگاویشە. چونکە لێرە بەدواوە چیدی تاکەکان وەك تاکی سەربەخۆ بوونیان نییە و ئیرادەیەکیشیان بۆ خۆیان نابێت. ئیرادەی کۆمەڵگا لە ئیرادەی فەرمانڕەوای دەوڵەتدا تواوەتەوە. هیچ سنوورێك بۆ ئیرادەی فەرمانڕەوا نییە و هیچ دەسەڵاتێکی دی لە تەنیشت یان سەر و ئەم دەسەڵاتە ڕەهایەوە نییە[11]. ئاشکرایە ئەمە گریمانەیەکی بێبناغە بوو وە چەمکی گشتی پەیمانی کۆمەڵایەتی نەیدەتوانی بیسەلمێنێ یان ئاڕاستەی بکات. چونکە کاتێك ئەم گریمانەیە تێکەڵ بە باوەڕی ڕەواقی مافی سرووشتی مرۆڤ دەکرا، چەمکی پەیمانی کۆمەڵایەتی دەگەیشتە دەرەنجامێکی پێچەوانە. ئەو بابەتە ڕوون بوو کە کاتێك تاکەکان دەگەیشتن بە ڕێکەوتنێك لە نێوان خۆیاندا و لەگەڵ فەرمانڕەوادا، تەنها دەیانتوانی بریار بۆ خۆیان بدەن و ناتوانن ڕێکخستنێکی پۆڵایین و نەگۆڕ دروست بکەن، چونکە ئەوان ناتوانن نەوەکانی ئایندە ناچار بەم ڕێکخستنە بکەن. تەنانەت لە دیدی نەوەی هەنووکەیشەوە مەحاڵە کە بکرێت واز لە هەموو مافەکان بهێنرێت و هەر هەمووی بە بێ مەرج و بە شێوەیەکی ڕەها تەسلیمی فەرمانڕەوا بکرێت. لایەنی کەم مافێك هەیە کە ناکرێت بە یەکێکی دی بسپێرێت یان چاوپۆشی لێ بکرێت. ئەم مافەش مافی کەسایەتییە. بە نفوزترین نووسەرانی سیاسی سەدەی حەڤدەهەم لەسەر بناغەی ئەم بنەمایە بەڵگەیان دەهێنایەوە و ئەو دەرەنجامانەیان ڕەد دەکردەوە کە هۆبز پێی گەیشتبوو. ئەوان لۆژیکزانی مەزنیان /واتە هۆبزیان/ تاوانبار دەکرد کە سەرنجی لە ناکۆکی نێوان وەسفکراو و سیفەت نەداوە چونکە گەر مرۆڤ کەسایەتی خۆی بەجێ بهێڵێ، چیدی بوونەوەرێکی ئەخلاقی نابێت و دەبێت بە شتێکی بێگیان. کەوابوو چۆن بوونەوەرێکی وا خۆی ناچار دەکات و چۆن دەتوانێ بەڵێن بدات و پەیمانی کۆمەڵایەتی

ببەستێ؟ ئەم مافە سەرەکییە واتە کەسایەتی، بە مانایەك مافەکانی دیش دەگرێتەوە. پاراستن و گەشەپێدانی کەسایەتی خود، مافێکی گەردوونییە. ئەم مافە ملکەچی هەوەس و وەهمی تاکەکان نییە. لێرەوە ناکرێت ئەم مافە لە یەکێك وەربگیرێت و بە یەکێکی دی بسپێرێت. لێرەوە پەیمانی دەسەلاتدارێتی کە بناغەی یاسایی دەسەلاتی مەدەنییە، خاوەن کۆمەڵێ سنووردارێتی دەروونییە. پەیمانی دیسپلینکردن و کۆیلەیەتی، بوونی نییە، پرۆسەی سپاردن /ی ماف یان مافەکان/ کە بە پێی ئەم پرۆسەیە کەسێك بتوانێ واز لە هەلومەرجی بکەرێکی ئازاد بهێنێ و خۆی بکاتە کۆیلە، بوونی نییە. چونکە کەس بە چاوپۆشین لە /مافەکانی خۆی/ هەمان خەسڵەت لەدەست دەدات کە درووستکەری ماهییەت و خودێتی مرۆییەتی، ئەو، مرۆڤ بوونی خۆی لەدەست دەدات.

## پەراوێزەکان

1-Galileo, n Saggiatare, "Opere nazinale, Tipografia di G. Barbera, Florence, 1890. 1909) Vl, 332-20 Vols. بۆ زانیاری زیاتر لە بارەی تێگەیشتنی گالیلۆ بۆ سرووشت بگەڕێنەوە بۆ: E. Cassirer, Individuurn und Komos in der philosphie der reqissnce, op. cit, pp. 165. Ff,. 177 ff.

2-ئەلکساندەر کویرە لێکدانەوەیەکی جوانی لە بارەی پەیوەندیی نێوان فیزیایی گالیلۆ و فیزیای دیکارتی لە کتێبەکەی خۆیدا چەند لێکۆڵینەوەیەك لە بارەی گالیلۆوە، بەدەستەوە داوە: A Koyre, Etudes Galileennes, III, "Galilee et laloi dinetie" (paris, Himann, 1940).

3-Hugo Grotius, Epistolae, No. 654 (Amsterdem, 1687), p. 266. بۆ زانیاری زیاتر لەم بارەیەوە بگەڕێوە بۆ ئەم وتارەی نووسەر: E. Cassirer, 'Wahraheitsproblem bei Galilei'. Scientia, (Milano October, 1937), p. 188.

4-leibnniz. historicsh politische und staatswissn chaftliche, schriften, ed Onno Klopp (hanover, 1864) II 100 ff.

5-Christsan wolff, jus gentium methodo scientifica pertacthum, (Halle, 1749, ne ed. oxford, Clarendon prsdd, london, humphrey Milford, 1934).

6-بگەڕێنەوە بۆ ئەو وتارەی نووسەر: E. Cassirer, Descartes und kunigin von Schweden. کە دواتر بوو بە یەکێك لە فەسڵەکانی ئەم کتێبەی خوارەوە: E. Cassirer, Descartes (Stocjkholm, Bermann- Ficher, 1939), pp. 177- 278.

7-بگەڕێنەوە بۆ فەسڵی هەشتەمی ئەم کتێبە، ل 187.

8-pascal, Lettres provinciales, V. English trans, (New York, j. Leavit, boston, Crocker and Brewster, 1828). pp. 69-71.

9-Grotius, De jure balli at pacis, Prolegomena, sec 11.

10-Hobbes, De copore, Pars l, sec. 3 ad 8, "Opera Philsophica quae Latine scripsit", ed. W.Molesorth (London, Bohn, 1839) l.g 9.

11-Hobbes, de cive, cap. 5- 7, cap. 17-19.

## سەرچاوە

ئەم نووسینە وەرگێڕانی فەسڵی 13ی ئەم کتێبەیە (ارنست کاسیرر. اسطورەی دولت. ت: یدالله موقن. تهران. هرمس، 1377).

# خۆپەرستی و خۆشویستنی خود

• ئەریك فرۆم
▪ لە ئینگلیزییەوە: عەبدوڵلا سیوەیلی



ئەریك فرۆم

کلتووری مۆدێرن بە قەدەغەکردنی خۆپەرستی سیواخ دراوە. ئەم کلتوورە وا ڕادەگەیەنێت خۆپەرستی تاوانە و خۆشویستنی ئەوانی دی کارێکی باشە. بە دڵنیاییەوە ئەم ڕێبازە تەنها بریتی نییە لە دژایەتیکردنێکی ئاشکرای پیادەکردنەکانی کۆمەڵگای مۆدێرن بەڵکو نەیارە لەگەڵ کۆمەڵە ڕێبازێکی تردا کە وا گریمانە دەکەن کە پاڵنەری هەرە بەهێز و ڕەوا لە مرۆڤدا بریتییە لە خۆپەرستی و، هەر تاکێك لە پەیڕەویکردنی ئەم پاڵنەرە گرنگەدا کارێکی باش ئەنجام دەدا لە پێناو باشەی گشتی یان بەرژەوەندی گشتیدا. بوونی ئەم جۆرە ئایدیۆلۆجیایە کار ناکاتە سەر قوورسایی ئەو ڕێبازانەی وا ڕەدەگەیەنن کە خۆپەرستی بریتییە لە تاوان و خۆشویستنی ئەوانی دی کاری خێر و باشەیە.

خۆپەرستی، بە شێوەیەکی بەربڵاو لەم ئایدیۆلۆجیایانەدا بەکارهاتووە، زیاتر یان کەمتر هاو واتایە لەگەڵ (خۆشویستنی خود)دا. ئەڵتەرناتیڤەکە ئەوەیە کە یان کەسانی ترت خۆش بوێت کە کارێکی باشە (خێرە) یان خۆتت خۆش بوێت کە تاوانە.

ئەم بنەمایە دەربڕینە کلاسیکییەکەی خۆی لە سیۆلۆژیای کاڵڤندا دۆزییەوە. مرۆڤ بە شێوەیەکی جەوهەری خراپ و بێهێزە. مرۆڤ بە

شێوەیەکی ڕەها ناتوانێت هیچ شتێکی باش ئەنجام بدات کە لەسەر بنەڕەتی هێز و شایستەییەکانی خۆیەوە بێت. کالڤن لە کتێبی پەیمانگاکانی ئاینی مەسیحی *Institutes of the Christian Religion* (*1928*– بەرگی سێهەم، بەشی حەوتەم. لا *619*)دا دەڵێت "ئێمە خاوەنی خۆمان نین، لەبەرئەوە نە عەقڵمان و نە ئیرادەمان ناتوانێت باڵ بکێشێت بەسەر گفتار و کردارەکانماندا. ئێمە خۆمان نین، لەبەرئەوە با وەك کۆتایی خۆمان پێشنیاری نەکەین، بەڵکو بە دوای ئەوەدا بگەڕێین کە گونجاو و لەبارە لە ڕووی جەستەوە. ئێمە خۆمان نین، لەبەرئەوە هەتا ئەوپەڕی ڕادەی گونجاوی خۆمان و ئەو شتانەی هی خۆمانن لەبیر خۆمانی بەرینەوە. بە پێچەوانەوە ئێمە موڵکی خوداین، کەواتە با بۆ ئەو بژین و بمرین. لەبەرئەوەی کە ئەمە وێرانکەرترین پەتایە کە خەڵك لەناودەبات گەر بێت و پەیڕەوی لە خۆیان بکەن، ئەوە تەنیا پەناگەیەکە بۆ ڕزگاربوون نەك بۆ زانین یان بۆ ویستنی هەر شتێك لە لایەن کەسێکەوە بەڵکو ئەبێ لە لایەن خواوە ڕێبەری بکرێیت، ئەو خوایەی کە لە پێشمانەوە دەڕوات. مرۆڤ پێویستە تەنیا ئەو قەناعەتەی نەبێت کە ئەو بە شێوەیەکی ڕەها هیچ نییە. مرۆڤ پێویستە خۆی خاکی بکات. کالڤن (لە بەشی *12*. لا *681*دا) دەنووسێت: "لەبەرئەوە من ئەمە ناونانێم خۆ خاکی کردن، ئەگەر تۆ وا گریمانە دەکەیت کە ئێمە شتێکمان بەجێ هێشتووە.. ئەوا ئێمە ناتوانین بیر لە خودی خۆمان بکەینەوە چونکە دەبێت بەبێ وتنی زارەکی قێزەوندکردنی هەموو شتێك کە لەوانەیە بە شتێکی باش دانرابێت لای ئێمە. ئەم سادەییە ملکەچکردنێکی سەرنجڕانەکێشی عەقڵێکە کە لە لایەن هەستێکی قورسی نەهامەتی و هەژاری خۆیەوە کۆنترۆڵ کرابێت؛ ئەمەش وەسفێکی یەکلایەنەیە لە وشەی خوادا".

ئەم جەختکردنەوەیە دەربارەی هیچێتی و دڕدۆنگی تاك ئەو واتایە دەگەیەنێت کە هیچ شتێك لە ئارادا نییە کە تاك دەربارەی خودی خۆی حەزی لێبکات. ئەم ڕێبازە لە سووککردن و قێزەوەندکردنی کەسەوە سەرچاوەی گرتووە. کالڤن ئەم خاڵە زۆر باش ئاشکرا دەکات، ئەو کە دەربارەی (خۆشویستنی خود) قسە دەکات وەك ئەوە وایە دەربارەی (بێزارکەرێك) قسە بکات (بەشی حەوتەم. لا *622*).

ئەگەر تاك شتێکی لە خۆیدا دۆزییەوە "کە بە هۆی ئەو شتەوە چێژ لە خۆیدا دەدۆزێتەوە"، ئەوا خیانەت لەم (خۆشویستنی خود)ە پڕ تاوانە دەکات. ئەم خۆشی بینینە بۆ خۆی وای لێدەکات دابنیشێت و هەڵسەنگاندن یان حوکمدان بەسەر ئەوانی دیدا بکا و ڕقی لەوان بێت. لەبەرئەوە حەزکردن لە هەر شتێك دەربارەی خۆت یەکێکە لە گەورەترین تاوانەکان.

ئەم حاڵەتە کە خۆشەویستی* بۆ ئەوانی تر دەخاتە دەرەوە، هاوشێوەی خۆپەرستییە. لە نێوان سیۆلۆژیای کالڤن و فەلسەفەی کانت دا جیاوازی بنەڕەتی هەیە، هێشتا ئاراستەی سەرەکی بەرەو گرفتی خۆشەویستی بۆ خۆت هەروەك هەمان شت ماوەتەوە. بە بڕوای کانت، ئەوە چاکەیە کە خۆشبەختی بۆ کەسانی تر

دەویێت، لە کاتێکدا ویستنی خۆشبەختی و شادیی کەسێك لە ڕووی ئاکارییەوە بریتییە لە "بێباکی"، لێرەشەوە ئەمە شتێکە کە سروشتی مرۆڤ خەباتی بۆ دەکات وە خەباتێکی سروشتیش ناتوانێت خاوەنی هەستێکی ئاکاری پۆزەتیڤانە بێت *(f. I. Kant. 1909, er p. part. Book L, chapter I, BVIII, Remark II, p 126)*

کانت دان بەوەدا دەنێت کە پێویستە کەسێك داواکاری خۆی بۆ شادی و خۆشبەختی وەلا نەنێت، لەژێر بارودۆخە دیاریکراوەکاندا ئەمە ئەبێتە ئەرکێك بۆ ئەوەی لەگەڵ خۆشبەختی کەسێکدا لەبەرچاو بگیرێت، بە شێوەیەکی کەرتی ئەمە لەبەرئەوەی تەندروستی، سامان، و شتەکانی تریش، ئەتوانن ببنە هۆکاری بەجێهێنانی ئەرکەکانی *(Cf, ibid, Part I, Book I, Chap III, p. 186)* بەڵام خۆشەویستی بۆ خۆت، هەوڵدان بۆ خۆشبەختی خودی خۆت، هەرگیز نابێتە چاکەیەك. وەك بنەمایەکی ئاکاری، خەباتکردن و هەوڵدانی کەسێك بۆ بەدەستهێنانی خۆشی و شادی (بریتییە لە پڕ نەیاریترین بنەما، نەك تەنها لەبەرئەوەی کە هەڵەیە.. چونکە ئەو سەرچاوانەی کە بۆ مۆڕاڵیێتی دابینی دەکات دەبنە هۆی لاوازکردنی و دارمانی بەرزێتی و بەهایەتییەکەی.." (هـ. س. پ بە تایبەت بنەما بنەڕەتییەکانی میتافیزیکای ئاکار، چاپی دووەم. لا *61*). کانت جیاوازی دەکات لە نێوان ئیگۆتیزم (خۆ بە گرنگتر و باشتر زانین لە خەڵکانی تر)، خۆشویستنی خود، فیلاوتیا (*Philautia*)، بەزەیی بەخۆدا هاتنەوە، و لووت بەرزی –چێژ لەخۆ

وەرگرتن دا. "خود خۆشویستنی عەقڵانی" دەبێت لە لایەن بنەما ئاکارییەکانەوە چێوەبەند بکرێن و چێژوەرگرتن لە خود هەرەسی پێبهێنرێت و دەبێت تاك لە بەراوردکردنی خۆی لەگەڵ پیرۆزییەکانی یاسا ئاکارییەکاندا خۆی قێزەوند بکات (هـ. س. پ. بە تایبەت بەشی یەکەم، بەرگی یەکەم، بەشی سێیەم. لا *165*). پێویستە تاك شادی و خۆشی باڵا لە جێبەجێکردنی ئەرکەکانیدا بدۆزێتەوە. هاتنەدی بنەما ئاکارییەکان و بە هەمان شێوە شادی و خۆشی و تاکیش لە گشتێکی هەمەکیدا شیاوە وەك نەتەوە یان دەوڵەت. هێشتا خۆشگوزەرانی (رفاهیە)ی دەوڵەت هاوشێوە نییە لەگەڵ خۆشگوزەرانی هاووڵاتییان و شادییەکانیاندا. سەرەڕای ئەو ڕاستییەی کە کانت بایەخی زۆرتر دەدات بە پایە و ڕێزی تاك وەك لە کاڵڤن یان لۆسەر، کانت ئەوە دەخاتە ڕوو کە تەنانەت لەژێر قەڵەمڕەوی دیکتاتۆرترین حکوومەتدا تاك مافی یاخیبوونی نییە و پێویستە ئەگەر تاك هەڕەشەی لە سەروەرییەکان کرد لە سزای مەرگ کەمتری بەسەرا نەسەپێنرێت.

(*Cf. I. Kant. 1907. p. 126*). کانت جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە ئارەزووی هاونیشتمانی بۆ خراپە لە سروشتی مرۆڤدا بۆ ئەو سەرکوتکردنە یاسای ئاکاری و پاڵنەری چەشنی *impekcal Category*، پێویستە تا ئەو ڕادەیەی کە مرۆڤ ئەبێتە درندەیەك و کۆمەڵگای مرۆڤی دەگاتە ئاستی دامەزراوەیەکی کێوی. لە گفتوگۆکردنی سیستەمەکەی کاڵڤن و کانت دا، سووربوونیان لەسەر هیچێتی مرۆڤ جەختی

لەسەر کراوەتەوە. هێشتا هەروەك لەمەوپێش باسکرا، ئەوان جەخت لەسەر سەربەخۆیی و کەرامەتی تاك دەکەنەوە، وە ئەم دژوارییەش لە نووسینەکانیاندا ئامادەیی هەیە. لە فەلسەفەی سەردەمی ڕۆشنگەریدا، نەهامەتی و خۆشییەکانی تاك زۆر زیاتر و توندتر جەختی کراوەتە سەر زیاتر لە کەسانی تری وەك کانت، بۆ بەڵگە لای هێلڤیتەس. ئەم ئاراستەیە لە فەلسەفەی مۆدێرندا دەربڕینێکی توندی تیا دامەزرا لە لایەن ستێرنەر و نیچەوە. لەو شێوازەدا کە ئەوان زۆرجار گرفتەکەی پێ دەردەبڕن –هەرچەندە وەك پێویست بە مانا ڕاستەقینەکانیان بەکاریان ناهێنن– لە ئایدیای کاڵڤن و کانتدا خاوەنی یەك لۆژیکن: ئەویش ئەوەیە کە خۆشەویستی کەسانی دی و خۆشویستنی خود بریتین لە ئەڵتەرناتیڤەکان. بەڵام بە پێچەوانەی ئەو نووسەرانەوە، ئەمان خۆشەویستی بۆ کەسانی تر بە لاوازی دەخەنە ڕوو و، قوربانیدان بە خود و ئیگۆتیزم و خۆپەرستی و خۆشویستنی خود بە چاکە دەدەنە قەڵەم –ئەمە لە کاتێکدا ئەم مەسەلەیە زۆر دەئاڵۆزێنن ئەویش بە جیانەکردنەوە و جیاوازیی نەکردن لە نێوان ئەم دیاردانەدا. بەمجۆرە ستێرنەر دەڵێت "لێرەدا دەبێت، ئیگۆتیزم و، خۆپەرستی بڕیار بدەن، نەك بنەمای خۆشەویستی، نەك پاڵنەرەکانی خۆشەویستی وەك بەزەیی، نیانی، سروشتی باش، یان تەنانەت دادپەروەری و یەکسانیش – چونکە ئایۆسیتیا *iusitia* بریتییە لە دیاردەی خۆشەویستی، لە بەرهەمێکی خۆشەویستی، خۆشەویستی تەنها قوربانیدان دەزانێت و قوربانیدان بە خود دەخوازێت". (*M. Stirne, 1912. p. 339*).

ئەو جۆرە خۆشەویستییەی کە لە لایەن ستێرنەرەوە خراوەتە ڕوو بریتییە لە پشت بەستنێکی ماسۆشیستانە کە تاك دەکاتە هۆکارێك بۆ هێنانەدی مەبەستەکانی خۆی یان شتێك لە دەرەوەی خۆی. بەم چەمکەی خۆشەویستی ئەو دەتوانێت بە دەگمەن لەو فۆرمەلەیە دووربکەوێتەوە کە ئیگۆتیزمی بێبەزەیی وەك ئامانجێك وەرگرتووە. لەبەرئەوە فۆرمەلەکە زۆر وتوێژ هەڵگرە و خاڵەکەش بە بایەختر دەکات. ئەو بنەما پۆزەتیڤەی کە جێگەی بایەخی ستێرنەرە لە دژی هەڵوێستێك ئاراستە کرابوو کە بۆ چەندین سەدە لە سیۆلۆژیای مەسیحیدا بەڕێوە چوو و لە ئایدیالیزمی ئەڵمانیشدا چالاك بووە، مەبەست ئەوەیە کە تاك پابەند بکرێت بە ملکەچکردن و دۆزینەوەی سەنتەری خۆی لە هێزێکدا یان لە بنەمایەکدا کە لە دەرەوەی خۆیدا بێت. ئەبێت دڵنیا بین لەوەی کە ستێرنەر فەیلەسووفێك نییە کە لە ئاستی کانت یان هیگڵدا بێت، بەڵام ئەو جورئەتی ئەوەی هەبووە کە هەڵگەڕانەوەیەکی ڕیشەیی لە دژی ئەو لایەنەی فەلسەفەی ئایدیالی بەرپا بکات کە نەفی تاکی کۆنکریتی دەکات و بەم شێوەیەش ئەو یارمەتی دەوڵەتی ڕەهای دا کە هێزی سەرکوتکەرانەی خۆی


کانت

بەدەست بهێنێتەوە بەسەر تاکدا. هەرچەندە هیچ بەراوردێك لە نێوان قووڵی و بواری ئەم دوو فەیلەسووفەدا نییە، کەچی ئاراستەکەی نیچە لە زۆر ڕووەوە هاوشێوەی ئەوەکەی ستێرنەرە. نیچە خۆشەویستی و بەتەنگەوەهاتن وەك دەربڕینی لاوازی و نەفیکردنی خود دەداتە قەڵەم. بەلای نیچەوە گەڕان بە دوای خۆشەویستیدا بۆ ئەو کۆیلانەی کە ناتوانن بۆ ئەو شتەی کە دەیانەوێت بجەنگن شتێکی نموونەییە، لەبەرئەوە ئەوان هەوڵ دەدەن لە ڕێگەی "خۆشەویستی"یەوە بە دەستی بهێنن.

"بە تەنگەوەهاتن و خۆشویستنی مرۆڤایەتی نیشانەیەکە بۆ لەبەریەك هەڵوەشان" (*Cf. F. Nietzsche, 1910, in Paricular stanza 246, 362, 369, 373, 728*) بەلای نیچەوە ناوەرۆکی ئەرستۆکراسییەکی باش و تەندروست ئامادەیە کە قوربانی بە خەڵکێکی بێشومار بدات لە پێناوی بەرژەوەندییەکانیدا بەبێ ئەوەی هەستێکی تاوانبارانە بەدی بکات. پێویستە کۆمەڵگە بریتی بێت لە "بناغەیەك یان چوارچێوەیەك کە بە هۆیانەوە چینی هەڵبژاردە بتوانێت تا بەرزترین ئاستەکان یان ئەرکەکان خۆی بەرزبکاتەوە و بە گشتی بگاتە بەرزترین ئاستی بوون". (*F. Nietzsche, 1907, stanza 258. p. 225*) چەندین پەرەگرافی تر ئەتوانرێت زیاد بکرێت بۆ ئەوەی ئەم ڕوحیەتە سادیزمی و ئیگۆتیزمی دڕندانەیە بکاتە بەڵگەنامە. ئەم لایەنەی نیچە زۆرجار وەك فەلسەفەی نیچە خەڵك لێی تێگەیشتووە. ئایا ئەمە ڕاستە؛ ئایا ئەمە نیچەی "ڕاستەقینە"یە؟

وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە شیکارێکی وردی فەلسەفەکەی نیچە دەخوازێت کە لێرەدا جێگەی نابێتەوە. چەندین هۆکاری جۆراوجۆر هەن کە وایان لە نیچە کردووە بەو ڕوحیەتەوە کە لە سەرەوە باسمان کرد خۆی دەرببڕێت. بەر لە هەموو شتێك، هەروەك لە حاڵەتەکەی ستێرنەردا وابوو، فەلسەفەکەی نیچە پەرچەکردارێك بوو – هەڵگەڕانەوەیەك بوو– لە دژی ترادیسیۆنی فەلسەفی بێبایەخ کردنی تاکی ئەزموونگەرایی بۆ هێزێك یان بنەمایەك لە دەرەوەی خۆی. ئارەزووی نیچە بۆ وتە زیادەڕەوەکانی ئەم سیفەتە پەرچەکردارییە پیشان دەدات. دووەمیش چەند جیاکەرەوەیەك هەبووە لە کەسێتی نیچەدا، دوودڵی، بێ ئارامییەکی زۆر، کە دەرخەری ئەو حاڵەتەیە کە بۆچی ئەو پاڵنەری سادیستانەی هەیە کە بەرەو ئەو فۆرمەلانەی دەبات. هێشتا ئەم ئارەزووانە لە نیچەدا بەلای منەوە بریتی نین نە لە "جەوهەر"ی کەسێتی ئەو نە لە تێڕوانینە ناودارەکان کە بریتین لە جەوهەری فەلسەفەکەی. لە کۆتاییدا نیچە هەندێ لە ئایدیا سروشتگەراییەکانی سەردەمەکەی خۆی وەرگرت چونکە ئەو ئایدیایانە لە فەلسەفەیەکی ماتەریالیستی –بایۆلۆژیستیدا دەربڕاون، کە تیایدا چەمکەکانی ویستە فسیۆلۆژیەکانی دیاردەکانی دەروون و "مانەوەی باشترین" بریتی بوون لە تایبەمەندێتی. ئەم لێکدانەوەیە دوورەپەرێز نابێت لەو ڕاستییەی کە نیچە هاوبەش بوو لەو تێڕوانینەدا کە پێچەوانەییەك هەیە لە نێوان خۆشویستنی کەسانی تر و

خۆشویستنی خوددا. هێشتا کارێکی گرنگە کە تێبینی ئەوە بکرێت کە تێڕوانینەکانی نیچە هەوێن دەگرێتە خۆی لەو گۆڕانکارییەوە کە ئەم جیاوازیکردنە هەڵەیە و دەتوانرێت ڕێگەی لێ بگیرێت. "خۆشەویستی" کە ئەو هێرشی دەکاتە سەر شتێکە نەك تەنها لە توانا و بەهێزی خودەوە سەرچاوەی گرتووە، بەڵکو لە لاوازییەکانیشەوە. "خۆشەویستی دراوسێکەت، بریتییە لە خۆشەویستی خراپ بۆ خودی خۆت" تۆ هەستت بە دراوسێکەت لە خودی خۆتەوەیە و دواتر ڕاتدەکێشێت بۆ کردنی چاکەیەك. بەڵام من لە "ناخۆپەرستێتی" تۆ تێدەگەم. ئەو بە ئاشکرا دەڵێت: "تۆ ناتوانیت خۆت ڕابگریت و تۆ بە تەواوەتی خۆتت خۆش ناوێت" *(F. Nietzshe s.a.g p. 75)* بەلای نیچەوە تاك "گرنگییەکی زۆر و پڕبایەخی هەیە" *(F. Nietzsche, 1910 storza 785)*. تاکی (بەهێز) ئەو کەسەیە کە خاوەنی "بەزەیی ڕاستەقینە، هەست بەرزی، ڕۆح بەرزییەکە کە بە مەبەستی بردن نایبەخشێت، کە نایەوێت بە بەزەیی بوون ببێتە کارا و "بە فیڕۆدان" وەك جۆرێکی بەبەزەیی بوون سەیر بکات و، نایەوێت سامانی کەسێك بکاتە هی خۆی". *(L. C., stanza 435)*. هەروەها نیچە هەمان ئایدیا لە کتێبی "زرادەشت وەهای گوت"دا دەردەبڕێت: "کەسێك ئەچێت بۆ لای دراوسێکەی چونکە بۆ خۆی دەگەڕێت و، ئەوەی تر لەبەرئەوەی حەزدەکات خۆی ون بکات یان بدۆڕێنێت" .*(F.Nietzsche, S. a., p 76)*

ناوەڕۆکی هەموو ئەم تێڕوانینانە ئەوەیە کە: خۆشەویستی دیاردەیەکی بڕئاسایە. ئایدیای خۆشەویستی بریتییە لە ئازایەتی یان هێزی ئەو تاکەی کە دەتوانێت ببەخشێت. خۆشەویستی بەهێزکردنی هەستە "خۆشەویستی ئەگەڕێت بۆ ئەوەی ئەو شتە دروست بکات کە خۆش ئەویسترێت" *(L. c, p., 102)* خۆشویستنی کەسێکی تر تەنها چاکەیەکە، ئەمە ئەگەر لەم هێزە ناوەکیەوە هەڵبقوڵێت. بەڵام شتێکی بێزراوە ئەگەر بریتی بێت لە دەربڕینی نەتواناییەکی سەرەکی بۆ ئەوەی ببیتە خۆت

*(CF.Nietzsche 1910 stanza 820. F.Nietzsche, 1411, starza 35. F.Nietzschza, all a. stanza 2, F Nietzsche, Nacha B, PP. 63- 64).*

بەهەر حاڵ، ئەو ڕاستییەی کە دەمێنێتەوە ئەوەیە کە نیچە گرفتی پەیوەندی نێوان خۆشویستنی خود و خۆشەویستی بۆ کەسانی تر وەك ئانتینیۆمی *antinomy* بێ چارەسەر بەجێهێشت، تەنانەت ئەگەر کەسێك نیچە لێك بداتەوە ڕەنگە ئەوە بسەلمێنێت کە چارەسەرەکەی لە چ ئاراستەیەکدا دامەزراوە یان جێگیر بووە. (بەراوردی لێکۆڵینەوەیەکی گرنگی ماکست دۆرکهایمەر بکە *1936*، کە لە گرفتی ئیگوتیزم لە مێژووی مۆدێرن ئەکۆڵێتەوە).

ئەو ڕێبازەی کە خۆپەرستی بە خراپە دەداتە قەڵەم و دەبێت مرۆڤ خۆی لێ بەدوور بگرێت و ئەوەی کە خۆشویستنی خود دەبێتە هۆی دوورکەوتنەوە لە خۆشویستنی کەسانی تر بێگومان بابەتی سۆسیۆلۆژیا و فەلسەفەن. ئەمە

یەکێکە لە وتە ستۆکەکان کە هەنووکە لە ناومالّ، قوتابخانــە، کلێســا، ســینەما، ئــەدەب، هــەموو شــوێنەکان و کایــەکانی تــری کۆمەڵایــەتیدا بەکاردێت. "خۆپەرست مەبە" ئەو ڕستەیەیە کـە بەســەر ملیۆنــەها منداڵــدا نــەوە دوای نــەوە سـەپێنراوە. کـارێکی قورسـە کـە ئەمـە کوتومـت مانای چی دەگەیەنێت. بە شێوەیەکی هۆشیارانە، زۆربەی باوك و دایکەکان لەگەڵ ئەمەدا مانای خۆ بـە گرنـگ زانـین، بـە تەنگـەوەهاتن، گـوێ نەدانـە ئـەوانی تـر گـرێ دەدەن. لـە ڕاسـتیدا ئەوانـە بـە گشـتی زۆر لـەوە زیـاتر دەگەیـەنن. "خۆپەرسـت مەبـە" واتـای ئـەوە دەگەیـەنێت ئـەوە مەکـە کـە ئاواتەخوازی بۆی و مانای وازهێنان لە ئاواتەکانە لەبـەر خـاتری ئەوانـەی لـە دەسـەڵاتدان (دایـك و بــاوك) و دواتــر دەســتەڵاتەکانی کۆمەڵگــە. "خۆپەرست مەبە" لە دوا شیکاردا خاوەنی هەمان تـەمومژ و نادیارییەکـە لـە کـاڵڤنیزمدا بینیمـان. سـەرەڕای ئاماژە ئاشکراکانی، ئەمە واتا "خۆتـت خۆش نەوێت" "خودی خۆت مەبە" بەڵکو ژیانی خـۆت بخـەرە ژێـر ڕکێفـی شـتێکەوە کـە لـە خـۆت گرنگتر بێت. وەك "ئەرك" ببە بە هـێزێکی دەرەکی یـان دیـوی دەرەوەی هـێزێك. "خۆپەرسـت مەبـە" ئەبێتــە یــەکێك لــە هــەرە بــەهێزترین چەکــە ئایدیۆلۆژیـەکانی سەرکوتکردنی هەڕەمەکیگـەرایی و گۆڕانی ئازادی کەسێتی. لە ژێر پەستانی ئـەم دروشمــەدا کەســێك داوای لێکــراوە بــۆ هــەر قوربانییــەك و ملکــەچی تــەواوەتی: تەنــها ئــەو مەبەسـتانە "ناخۆپەرسـتانەن" کـە خزمـەتی تـاك ناکـەن لەبـەر خـاتری خـۆی بـەڵکو لەبـەر خـاتری کەسێکی تـر یـان شـتێك لـە دەرەوەی خـۆی. ئـەم وێنەیـە، دەبێـت ئەمـە دووبـارە بکەینـەوە، کـە لـە ڕوویەکی دیاریکراوی یـەك لایەنەدایـە. سـەرەڕای ئـەو ڕێبازەی کە نـابێت مـرۆڤ خۆپەرسـت بێـت، ڕێبــازی پێچەوانــە لــە کۆمــەڵگای مۆدێرنـــدا پڕوپاگەندەی بۆ دەکرێـت: تـۆ سـوود و قـازانجی خۆتـت لـە مێشـکدایە، بـە باشـترین شـێوە کـە سودمەند دەبیت ڕەفتار بکە، بە کردنی ئەمەش تۆ زۆرترین سوود دەگەیـەنیت بە هـەموو ئـەوانی تـر (کەسـانی تـر). لـە ڕاسـتیدا ئـەو ئایدیایـەی کـە بەدەستهێنانی ئیگۆتیزمی تاك بریتییە لە بناغە بۆ گەشەسـەندنی خۆشـگوزەرانی گشـتی، بنەمایەکـە کە سەرمایەداری کێبڕکێکار لـە سـەری دامـەزراوە. ڕەنگە نـامۆ بێت کە دوو بنـەمای وەهـا پێچەوانـە ئەتوانرێت لە یەك کلتووردا شانبەشانی یەکتر فێر بکرێـن. لـە ڕاسـتیدا ئەمـە گومـانی تێـدا نییـە. ئاکــامێکی ئــەم پێچەوانــە بوونــەی ڕێســا ئایدیۆلۆژییەکان بە دڵنیاییەوە شلەژاوین لە تاکدا. خۆبینینەوە لە نێوان ئەم یەکە و ڕێبازەکەی تردا ڕێگرێکــە لــە بــەردەم پرۆســەی یەکگرتنــەوەی کەسـێتی و زۆر جـار بۆتــە هــۆی پێکــهێنانی کاراکتـەری عوصـابی (ئـەم خاڵـە لـە لایـەن کـارین هۆرنـی *1937*، و ڕ. س. لینــدەوە، *1939* جــەختی لەسەر کراوەتەوە).

دەبێت تێبینی ئەوە بکرێت کە ئەم دوو ڕێبازە پێچەوانەیە فەرمانێکی کۆمەڵایەتی گرنگیان هەیە. ئەو ڕێبازەی کە هـەموو کەسـێك پێویسـتە سـودە تاکگەراییـەکانی خـۆی لەسـەر بنیـاد بنێـت بـە ئاشـکرا بریتـی بـووە لـە پاڵنـەرێکی پێویسـت بـۆ

دەستپێشخەری تایبەتی کە سترەکتوری ئابووری مۆدێرنی لەسەر بوونیادنراوە. فەرمانی کۆمەڵایەتی ڕێبازی "خۆپەرست مەبە" ڕێبازێکی تەمومژاوی بووە. بە لای ئەو جەماوەرە بەرفراوانەی کە دەبوو تەنها لە ئاستی مەمرە و مەژیدا بژین، ئەمە یارمەتییەکی گرنگ بوو بۆ ئارام گرتن بەوەی کە ئاواتیان هەبێت کە هاتنە دی لە سیستمی دراوی کۆمەڵایەتی ئابووری وەهادا مەحاڵ بوو. کارێکی گرنگ بوو کە ئەم ئارام گرتنە پێویستە ئارام گرتنێك بێت کە وەك ئاکامی فشارە دەرەکیەکان بیری لێ نەکرابێتەوە، لەبەرئەوەی ئاکامی حەتمی هەستی لەم جۆرە دەبێت زیاتر یان کەمتر ناحەزی هۆشیارانە و مەیدانخوازی بن لە دژی کۆمەڵگە. بە پەیڕەوکردنی ئەم ئارامگرتنە چاکەیەکی ئاکاری، وەك پەرچەکردارێك ئەتوانرێت تا ڕادەیەکی بەرچاو لێی دوورەپەرێز بین، لە کاتێکدا ئەم لایەنەی ئەرکی کۆمەڵایەتی قەدەغەکردنی خۆپەرستی ئاشکرایە، لایەنێکی تر کە کاریگەریەکەی لەسەر کەمینەی خاوەن ئیمتیاز ئاڵۆزترە. ئەمە کاتێك ڕوون دەبێتەوە ئەگەر ئێمە مانای "خۆپەرستی" زیاتر لەبەرچاو بگرین. ئەگەر خۆپەرستی مانای بە تەنگەوەهاتنی سودی ئابووری کەسێك بگەیەنێت، ئەوا قەدەغەکردنی خۆپەرستی ئەبێتە مایەی ڕێگری و ناسوودمەندبوونی دەستپێشخەری ئابووری


مارکس

کەسی سەرمایەدار. بەڵام ئەوەی کە ئەمە بە ڕاستی گەیاندوویەتی، بە تایبەت لە سەردەمە سەرەتاییەکانی کلتووری ئینگلیزی و ئەمریکیدا، بریتی بووە لە: ئەوە ئەنجام مەدە کە دەتەوێت بیکەیت، خۆشی لە خۆت مەبینە، پارە و وزە لە پێناو چێژدا سەرف مەکە، بەڵکو کارکردن بۆ ئەوەی سەرکەوتوو بیت بکە بە ئەرکی سەرشانی خۆت. ئەوە کارە باش و گرنگەکەی ماکس فیبەرە کە ئەوەی پیشان دا کە ئەم بنەمایە کە ئەو ناوی لێناوە (لە ناخەوە خۆشی لە خۆ حەرام کردن *(innerwordlly asceticism* مەرجێکی گرنگ بووە بۆ دروستکردنی ئاراستەیەك کە تیایدا هەموو وزەیەك بتوانرێت ئاڕاستەی کارکردن و بەجێهێنانی ئەرك بکرێتەوە. (*Cf. m weber, 1930*). ئەو دەسکەوتە ئابوورییە زۆر و زەوەندانەی کۆمەڵگای مۆدێرن نەشیاو دەبوو یان مەحاڵ دەبوو ئەگەر لەم جۆرە (خۆشی لە خۆ حەرام کردنە) هەموو ئەو وزانەی هەڵنەلووشیایە کە بە مەبەستی دەستپێوەگرتن (ئیقتیصادی کردن) و کاری ناپابەند لە ئارادا بووە. ئەمە بواری ئەم لێکۆڵینەوەیە بەرەو چوونە ناو شیکردنەوەی سترەکتوری کاراکتەری مرۆڤی مۆدێرن دەبات کە لە سەدەی شانزەهەمدا سەری هەڵدا. لێرەدا ئەوەندە بەسە بڵێین کە گۆڕانکارییە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکانی سەدەی پانزدە و شانزدە

هەستکردن بە ئاسایشی وێرانکرد و "هەوادارێتی belonging) لەناوبرد کە بەهایەکی نموونەیی ئەندامانی کۆمەڵگاکانی چاخەکانی ناوەڕاست بوو. پایەداربوونی ئابووری -کۆمەڵایەتی چینی ناوەندی شارنشین لە بنەڕەتەوە جووتیارگەرایی و خانەدانگەرایی لەرزاند. (Cf. R Pascal, 1933; J. B. Kras 1930, R. H. Tawhey 1926) هەژاری، هەڕەشە بۆ سەر پایەکانی ئابووری تەقلیدی هەروەها هەلی نوێ بۆ سەرکەوتنی ئابووری سەریان هەڵدا. پەیوەندییە ئاینی و ڕوحییەکان کە جیهانێکی تەواو پڕ ئاسایشی بۆ تاك دامەزراندبوو تێکوپێك شکێنران. تاك خۆی بە دابڕاوی تەواوەتی لە جیهاندا بینییەوە، بەهەشت لە بەرامبەر کاڵاو شمەکدا لەدەست چوو، سەرکەوتن و شکستی تاك لە لایەن یاساکانی بازاڕەوە بڕیاری لەسەر دەدرا؛ پەیوەندی سەرەکی بۆ هەر یەکێکی تر بووە پێشبڕکێیەکی بێبەزەییانە. ئاکامی هەموو ئەمانە بریتی بوو لە هەستێکی نوێ بە سەربەستی، هەرچۆنێکیش بێت دوودڵییەکی زیاتری بەدوادا هات. ئەم دوودڵییە بەش بە حاڵی خۆی ئامادەگییەکی نوێی بۆ ملکەچکردن بۆ دەسەڵاتە ئاینی و عەلمانییەکان دروست کرد بە جۆرێك کە زۆر پابەندئامێزتر بوو لەوەکانی پێشووتر. تاکگەرایی نوێ لە لایەکەوە و دوودڵی و ملکەچی بۆ دەسەڵات لە لایەکی ترەوە دەربڕینە ئایدیۆلۆژییەکانی خۆیان لە پرۆتستانتیزم و کالڤینیزمدا دامەزراند. لە هەمان کاتدا، ئەم ڕێبازە ئاینییانە کارێکی زۆریان ئەنجام دا لە هاندان و زیادکردنی ئەم ئاڕاستە نوێیانەدا. بەڵام ئەوەی کە زیاتر گرنگتر بوو لە ملکەچی بۆ دەسەڵاتە دەرەکییەکان ئەو ڕاستییە بوو کە دەسەڵاتەکان بە (ناوەکی کرابوون *internalized*) بەوەی کە مرۆڤ بووە کۆیلەی فەرمانڕەوایەك لە ناخی خۆیدا لە جیاتی فەرمانڕەوایەك لە دەرەوەی خۆی. ئەم فەرمانڕەوا ناوەکییە پاڵی نا بە تاکەوە بەرەو کاری بێکۆتا و خەبات بۆ سەرکەوتن و هەرگیز ڕێگەی بە مرۆڤ نەدەدا کە بریتی بێت لە خودی خۆی و خۆشی لە خۆی وەربگرێت. ڕوحییەتێك لە بێ متمانەیی و دوژمنکاری هەبوو کە نەك تەنها لە دژی جیهانەکەی دەرەوە ئاراستە دەکرا بەڵکو بەرەو خودی ئەو کەسە خۆشی.

ئەم جۆرە مۆدێرنەی مرۆڤ لە دوو ڕووەوە خۆپەرست بوو: ئەو بەتەنگەوەهاتنی کەمتری هەبوو بۆ ئەوانی دی و بە پەرۆشیشەوە بەتەنگ سوودەکانی خۆیەوە دەهات. بەڵام ئایا ئەم خۆپەرستییە بە ڕاستی بەتەنگەوەهاتنی خود بووە وەك تاکێك، بە هەموو ئەگەرە ڕووناکبیری و هەستەوەرییەکانییەوە؟ ئایا "ئەو" نەبۆتە پاشکۆیەکی ڕۆڵی ئابوری - کۆمەڵایەتییەکانی خۆی، کەسێکی کەم بایەخ لە ماشێنی ئابووریدا، تەنانەت ئەگەر هەندێ جار بایەخداریش بێت؟ ئایا ئەو نەبۆتە کۆیلەی ئەم ماشێنە تەنانەت ئەگەر بە شێوەیەکی تاکگەرایانە وەك ئەوەی کە دوای فەرمانەکانی خۆی کەوتبێت؟ ئایا خۆپەرستییەکەی هاوشێوەیە لەگەڵ خۆشویستنی خوددا یان لەجیاتی ئەمە لە نەبوونی ئەمەدا ڕیشەی داکوتاوە؟

دەبێت ئێمە وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە دوابخەین، لەبەرئەوەی هێشتا پێویستە کە ئێمە لێکۆڵینەوە کورتەکەمان لەسەر ڕێبازی خۆپەرستی لە کۆمەڵگای مۆدێرندا تەواو بکەین. قەدەغەکردنی خۆپەرستی لە سیستەمە دەسەڵاتگەراییەکاندا بەهێزکراوە. یەکێك لە بەردە بناغەی ئایدیۆلۆژییەکانی سۆشیالیزمی نەتەوەیی بریتییە لە پرەنسیپی "باشەی گشتی لە پێش باشەی تایبەتەوەیە" (*Gemeinutz geht vor Ergnuuatz*) بە پێی تەکنیکی پروپاگەندەی بنەڕەتی سۆشیالیزمی نەتەوەیی، هزر لە فۆرمێکدا دەربڕاوە کە مەبەستی ئەوە بووە کە ڕێگە بدات بە کرێکارەکان کە بروا بە بەشی "سۆشیالیستی"ی پرۆگرامی نازی بکەن. هەرچۆنێك بێت، ئەگەر مانای ئەمە لە هەموو چوارچێوەی فەلسەفەی نازیدا لە بەرچاو بگرین، ئەوا واتاکە ئەمەیە: تاك پێویستە هیچ شتێکی بۆ خۆی نەوێت، پێویستە ڕەزامەندی خۆی لە لەناوبردنی تاکگەرایی خۆیدا بدۆزێتەوە هەروەها لە بەشداریکردن وەك یەکەیەکی بچووك لە گشتێکی گەورەتردا کە دەوڵەت یان سیمبۆلی دەوڵەت کە سەرکردەیە، بدۆزێتەوە. لە کاتێکدا پرۆتستانیزم و کالڤنیزم جەختیان لەسەر ئازادی و بەرپرسیارێتی تاك کردۆتەوە، تەنانەت نازیزم کە جەخت لەسەر هیچێتی تاك دەکاتەوە کەچی تەرکیزی خستۆتە سەر بەرپرسیارێتی تاك. تەنها سەرکردە گەورەکان ناچنە ژێر ئەم ڕێسایەوە و، تەنانەت ئەوانیش دەبێت خۆیان بە ئامرازی دەستی کەسێکی تری باڵاتر لە خۆیان بزانن – خۆیان بە ئامرازی دەستی چارەنووس (قەدەر) بزانن.

ئەو ڕێبازەی کە خۆشەویستی بۆ خود تیایدا هاوشێوەی "خۆپەرستی"یە و ئەڵتەرناتیڤی خۆشویستنی کەسانی ترە سیۆلۆژیا و، فەلسەفەو ڕەوتی ژیانی ڕۆژانەی سیواخ دابوو، وە ڕەنگە جێگەی سەرسوڕمان بێت ئەگەر کەسێك هەمان ڕێبازی لە سایکۆلۆژیای زانستیدا نەدۆزییەوە. تیۆرەکەی فرۆید خاڵێکی تری ئەم حاڵەتە باس دەکات لە باسی خود شەیدایی (نەرجسییەت) دا. فرۆید بە کورتی ئەڵێت: مرۆڤ بڕێکی دیاریکراوی لیبیدۆ *Libido*ی هەیە. بە شێوەیەکی بنەڕەتی، لە مناڵدا، هەموو ئەم لیبیدۆیە وەك ئامانجی خۆی خودی کەسایەتی مناڵی هەیە (خودشەیدایی سەرەتایی).

دواتر لیبیدۆکە لە خودی کەسێکەوە ئاراستە دەکرێت بەرەو شتی تر. ئەگەر کەسێك لە "پەیوەندییە- شتگەرایی"یەکانیدا گیری خوارد، ئەوا لیبیدۆکە لە شتەکە پاشەکشە دەکات و ئەگەڕێتەوە بۆ خودی کەسەکە، خودشەیدایی ناوەندی. بە بۆچوونی فرۆید ئەلتەرناتیڤێکی میکانیکی لە نێوان خۆشویستنی ئیگۆ و خۆشویستنی شتدا هەیە. چەند زیاتر خۆشەویستی بدەمە جیهانی دەرەکی ئەوا هێندە کەمتر خۆشەویستیم بۆ خودی خۆم هەیە و بە پێچەوانەوە. بەم شێوەیە فرۆید چووە سەر وەسفکردنی دیاردەی کەوتنە خۆشەویستییەوە وەك هەژارییەك بۆ خود -خۆشەویستی لەبەرئەوەی هەموو خۆشویستی ئاراستەی شتێك

کراوە کە لە دەرەوەی کەسێکە. تیۆرەکەی فرۆید دەربارەی خودشەیدایی (نەرجسییەت) بە شێوەیەکی بنەڕەتی هەمان ئایدیا دەردەبڕێت کە لە ئاینی پرۆتستانت، فەلسەفەی ئایدیالیستی، و ڕەوتی ڕۆژانەی کلتووری مۆدێرندا بەرێوە دەچێت. ئەمە بەش بە حاڵی خۆی ئەوە پیشان نادات کە ئایا ئەو ڕاستە یان هەڵەیە، هیشتا ئەم وەرگێڕانەی بنەما گشتییەکان بۆ توخمگەلێکی سایکۆلۆژیای ئەزموونی سەرچاوەیەکی باشمان دەداتێ بۆ پشکنینی بنەماکە. ئەم پرسیارانەش سەرهەڵدەدەن: ئایا سەرنجدانی سایکۆلۆژی پشتگیری ئەو تێزە دەکات کە دەڵێت پێچەوانە بوونێکی سەرەکی هەیە و حاڵەتی جێگرتنەوەی (جێگۆڕکێی) نێوان خۆشەویستی بۆ کەسێك و خۆشویستنی خوددا؟ ئایا خۆشەویستی بۆ خۆت هەمان دیاردەی خۆپەرستییە، ئایا جیاوازییەك هەیە یان لە ڕاستیدا دژی یەکن؟ بەرلەوەی بێینە سەر گفتوگۆکردنی لایەنی ئەزموونی گرفتەکە، ڕەنگە سەرنج لەوە درابێت کە لە تێڕوانینێکی فەلسەفییەوە، چەمکی خۆشویستنی کەسانی دی و خۆشویستنی خود پێچەوانەن و چەمکێکی بەرگری لێنەکراوە. ئەگەر دراوسێکەم وەك مرۆڤێك خۆش بوێت و ئەمە کارێکی باش بێت، ئەی بۆ نابێت من خۆشم خۆش بوێت؟ بنەمایەك کە ئیعلانی خۆشەویستی بۆ مرۆڤ بکات بەڵام خۆشویستنی خۆم قەدەغە دەکات، بێ بەریم دەکات لە هەموو مرۆڤەکانی تر. هەرچۆنێك بێت قووڵترین ئەزموونی وجودی مرۆڤ بریتییە لە ئەزموون بە لەبەرچاو گرتنی کەسێك. هیچ هەماهەنگییەك بۆ مرۆڤ نییە چونکە من خۆمی تیا نیم. ڕێبازێك کە ئیعلانی ئەم تایبەتکردنە بکات بابەتگەرای نادڵسۆزانەی خۆی بەم ڕاستییە دەسەلمێنێت.

لێرەدا ئێمە دەگەینە ئەو کۆمەڵە ئایدیایەی کە ئاکامەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیەی لەسەر بینا کراوە. بە شێوەیەکی گشتی ئەم ئایدیایانە ئەمانەن: نەك تەنها کەسانی دی بەڵکو خودی خۆشمان "ئامانج"ی هەست و ئاراستەکانی خۆمانین، ئەو ئاڕاستانەی کە بەرەو ئەوانی دی و خودی خۆشمانن، بەدوور لەوەی کە پێچەوانە بن، بە شێوەیەکی تەریب بەرێوە دەچن (ئەم تێڕوانینە لە لایەن کارین هۆرنی *1939*ەوە بە تایبەت لە بەشی *5* و *7*دا جەختی لەسەر کراوەتەوە). بە لەبەرچاوگرتنی ئەو گرفتەی کە لە ژێر گفتوگۆکردندایە، ئەمە واتا: خۆشویستنی کەسانی تر و خۆشویستنی خۆمان بریتی نین لە ئەڵتەرناتیڤەکان، هەروەها نە ڕق لە ئەوانی تر و نە ڕق بوونەوەمان بۆ خۆمان ئەڵتەرناتیڤ نین. بە پێچەوانەوە ئاڕاستەیەك کە ڕووە و خۆشویستنی خۆمان بێ لەو کەسانەدا بەدی دەکرێت کە بەلانی کەمەوە لە توانایاندایە کە کەسانی تریان خۆش بوێت. ڕق لێبوونەوە بەرامبەر بە خود هیچ جیاوازییەکی نییە لەگەڵ ڕق لە خەڵك بوون، تەنانەت ئەگەر لە ڕووکەشدا پێچەوانە بریتی بوو لە "ئامانجەکان" و ئەوانەی کەسێکیش لەبەرچاو گیران.

بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم تێزە، پێویستە کێشەی ڕق و خۆشەویستی گفتوگۆی لەسەر بکرێت، بە

لەبەرچاوگرتنی ڕق لێبوونـەوە كەسـێك دەتوانێـت جیاوازی لە نێوان "ڕقی پەرچەكردارییانە" و "ڕقی بارودۆخی كاراكتـەر"دا بكـات. مەبەسـتم لـە ڕقـی پەرچەكردارییانـە ئـەو ڕقەیـە كـە بـە شـێوەیەكی بنەڕەتی بریتییە لە پەرچەكردارێك بۆ پەلاماردانێك بۆ سەر ژیان، ئاسایش، یـان خۆشی یـان كەسانی خۆشەویستی كەسێك. ئایدیای ئەم جۆرە بریتییـە لـە ئاراسـتەی پۆزەتیڤی كەسـێك بەرەو ژیانی ئـەو كەسـە، بـەرەو كەسـانی تـر و بـەرەو خۆشـییەكان. ئەگەر جەخت كردنەوەیەكی بەهێز هەبێت بۆ ژیان، ئـەوا وەك پێویسـت ڕقێكـی بـەهێز سـەرهەڵدەدات ئەگـەر بێتـو هـێرش بكرێتـە سـەر ژیـان. ئەگـەر خۆشەویستی هەبێت، ئەوا دەبێت ڕق لـە ئەگـەری هێرشـــكردنە ســـەر كەســـی خۆشویســـتراودا سـەرهەڵبدات. هیـچ خـەباتێكی سـۆزاوی بـۆ هـەر شتێك كە ڕق بـە پێویست نـازانێت بوونـی نـابێت ئەگـەر بێتـو ئامـانجی ئـەو خەباتـە هێرشـی كرایـە سەر. ڕقی لـەم جۆرە بریتییـە لـە ڕەنگاڵـەیی ژیـان. ئەمە لە لایەن هەڵوێستێكی دیاریكراوەوە هەژێنرا، كە مەبەستی تێكشكاندنی هێرشبەرەكەیە و كاتێك كۆتایی دێت كە هێرشبەرەكە بەزی (*F. Nietzsche, all, Stanza2,*، جـەختی كردۆتـە سـەر فـەرمانی ئەفرێنەرانـەی وێرانكـاری). ڕقـی بـارودۆخی كاراكتەر جیاوازە. ئەبێ دڵنیا بین لەوەی كە ئەو ڕقـەی كـە جـارێك لـە سـترەكتوری كاراكتـەرەوە ســـەرچاوە دەگرێـــت پەرچـــەكردارێك بـــۆ ئەزموونگەلێكی دیاریكراو دەخاتەوە كە لە لایەن تاكەوە لە مناڵیدا تووشی بوە. ئەمە ئیتر دەبێت بە سیفەتێكی جیاكـەرەوەی كاراكتـەری ئـەو كەسـە؛

ئـەو دوژمنكـارە. دوژمنكاری سـەرەكی ئـەو كەسـە تەنانـەت لـەو كاتـەدا كـە بـرەو بـە سـەرهەڵدانی ڕق نـادات سـەرنج لێـدراوە. شـتێك لـە دەربڕینـی دەموچاو، ئاماژە، تۆنی دەنگ، جۆری نوكتـەكان، كاردانـەوە بـێ مەبەسـتە كەمـەكان كـە كەسـی سـەرنجدەر ڕادەكێشـێت بـەرەو دوژمنكارییـەكی بنـەڕەتی، كـە ئەشـتوانرێت وەك ئامادەباشـی بـەردەوام بـۆ ڕق وەسـف بكرێـت. ئـەوە ئـەو سەرچاوەیەیە كـە ڕقـی پەرچەكردارییانـە لێـوەی هـەڵدەقوڵێت كـاتێك لـە لایـەن هـاندەرێك یـان پاڵنەرێكەوە ئەوروژێنرێت. ئەم پەرچەكرداری ڕقە ئەتوانرێت بە تەواوەتی عەقڵانی بێت. بەهەرحاڵ، لێرەدا جیاوازییـەكی بنـەڕەتی هەیـە. لـە حاڵـەتی ڕقی پەرچەكردارییانەدا، ئەوە هەڵوێستەكەیە كە ڕق لێبوونـەوە دروسـت دەكـات. لـە حاڵـەتی ڕقـی بـارودۆخی كاراكتـەردا، دوژمنكارییـەكی "بـێ مەبەسـت *idling*" لـە هەڵوێسـتەكە دێتـە كایـەی ڕاسـتییەوە. لـەو حاڵەتـەدا كـە ڕقـی سـەرەكی ئەوروژێنرێت، ئـەو كەسـەی كـە تووشـی بـووە وا بەدەردەكـەوێت كـە هەسـتێكی وەك هەسـتی (ڕزگـاربوون *relief*)ی هـەبێت. وەك ئـەوەی دڵـی خۆش بێت كە هـەلێكی عـەقڵانی دۆزیبێتـەوە بـۆ دەربڕینـی دوژمنكارییـە درێژخایەنەكـەی. ئـەو جۆرێكـی تایبـەت لـە ڕازیكـردن و خۆشـی لـە ڕقەكەیدا پیشان دەدات كە لە حاڵەتی كاردانەوەی ڕقی بنەڕەتیدا ون دەبێت.

لە حاڵەتی پەیوەندی نێوان كاردانەوەی ڕق و هەڵوێسـتی دەرەكیـدا، ئێمـە قسـە لەسـەر كاردانەوەیەكی "ئاسایی" دەكەین، تەنانەت ئەگەر

بە ڕاستەقینەکردنی ڕقی پەرچەکرداری کاراکتەریش بوو. لەم کاردانەوە دەرەکیەدا، ئێمە قسە لەسەر کاردانەوەیەکی "ئاسایی" دەکەین تەنانەت ئەگەر بە ڕاستەقینەکردنی ڕقی ئاساییەوە بۆ کاردانەوەیەکی "ناعەقلانی" کە لە کەسێکی عوصابی یان سایکۆتیکدا، ئەوا ئەتوانرێت چەندین گۆڕانی لە ژماردن نەهاتوو و هێڵی دیاریکردنی نائاشکرا بکێشرێت. لە کاردانەوەی ڕقی ناعەقلانیدا، سۆزەکان ناپەیوەندیدار دەبن لەگەڵ هەڵوێستە ڕاستەقینەکەدا. ڕێگەم بدەن با ئەم مەسەلەیە بە ئاماژەکردن بۆ ئەو کاردانەوەیەی کە دەروونشیکارەکان هەلی لێ وردبوونەوەیان هەیە بۆی زیاتر ڕوون بکەمەوە: نەخۆشێکی دەروونی *analysand* ئەبێت دە خولەك چاوەڕوانی بکات لەبەرئەوەی دەروونشیکارەکە دواکەوتووە. نەخۆشەکە دەچێتە ژوورەوە و ناخی پڕبووە لە ڕق بە هۆی ئەو تاوانەی کە دەروونشیکارەکە لەگەڵیدا ئەنجامی داوە. ئەوپەڕی ئەم حاڵەتانە لە کەسە دەروون نەخۆشەکاندا زۆر ئاشکراتر سەرنج دەدرێت. لەو کەسانەدا کە ناپەیوەندیدار بوون هێشتا زیاتر هەژێنەرە. ڕقی کەسی دەروون نەخۆش بە شتێك کە لە ڕوانگەی واقیعەوە بە هیچ شێوەیەك دوژمنکارانە نییە، دەوروژێت. هێشتا لە ڕوانگەی هەستەکانی خۆیەوە ئەوە کارێکی دوژمنکارانەیە، بەم جۆرەش کاردانەوەی ناعەقلانی تەنها لە ڕوانگەی واقیعی بابەتی دەرەکییەوە ناعەقلانییە، نەك لە ڕوانگەی ئایدیای بابەتی کەسی تووش بووەوە.

دوژمنکاری درێژخایەن ئەتوانرێت بەمەش بوروژێنرێت و بگۆڕێت بۆ ڕقی دەرکەوتوو بە پێشنیاری کۆمەڵایەتی، کە ئەویش، پڕوپاگەندەیە. ئەگەر پڕوپاگەندەی لەم جۆرە کە دەیەوێت خەڵك فێری ڕق لێبوونەوە بەرامبەر کۆمەڵە شتێکی دیاریکراو بکات کاریگەر بێت، ئەبێت لەسەر دوژمنکاری بارودۆخی کاراکتەرەوە بونیاد بنرێت لەناو بونیادی ئەندامانی ئەو گروپانەی کە ئەمە تیایدا بەرقەرارە. حاڵەتێك کە ئەمە بەرجەستە بکات ئەو داواکارییەیە کە نازیزم کە لەو گروپەی هەیە ناوکی خودی نازیزم پێکدەهێنێت کە بریتییە لە چینی مامناوەندی نزم. دوژمنکاری حەشاردراو بە تایبەت بریتی بوو لەو ئەندامە زۆرانەی ئەم گرووپە زۆر بەرلەوەی کە لە لایەن پڕوپاگەندەی (مازی *Mazi*)یەوە بکرێتە ڕاستەقینە، لەبەرئەمەشە کە ئەوان خاکێکی بەپیت بوون بۆ ئەم پڕوپاگەندەیە.

دەروونشیکاری هەلی لە پێویست زیاتر پێشکەش دەکات بۆ ئەوەی سەرنجی باردۆخەکە بدات کە بەرپرسە لە بوونی ڕق لە بونیادی کاراکتەردا. فاکتەری یەکلاییکەرەوە بۆ وروژاندنی ڕقی بارودۆخی کاراکتەر ڕەنگە بە چەند ڕێگەیەك بووترێت کە بە هۆیەوە هەرەمەکییەت و، سەربەستی، فراوانبوونی سۆزداری و دەروونی، گۆڕانی "خود"ی منداڵ تیایدا دەورە دەدرێت یان وێران دەکرێت. هۆکارەکانی کردنی ئەمە جۆراوجۆرن، ئەوان لە کردنەوە، بەناوەندکردنی دوژمنکاری و تیرۆر هەمەچەشن دەبن بەرەو جۆرێکی "ناسك" و زیرەکانەی "دەسەڵاتی

نەزانراو یان بێ ناو"، کە بە شێوەیەکی ئاشکرا هیچ شتێك قەدەغە ناکات بەڵام دەڵێت "ئەزانیت، یان حەزت لەم و لەو نییە".

تەگەرەی ساکاری پاڵنەرە خۆڕسکەکان دوژمنکارییەکی قووڵ دروست ناکات، ئەمە تەنها کاردانەوەیەکی ڕقی کاردانەوە ئاسا دروست دەکات. هێشتا گریمانەکەی فرۆید و چەمکەکەی لەسەر گرێی ئۆدیب لەمەوە سەرچاوەی گرتوە؛ ئەمە ئەو واتایە دەگەیەنێت کە ڕێگەگرتن لە حەز و ئارەزووە سێکسییەکان کە ئاراستەی باوك یان دایك کراون ڕق دروست دەکات کە بە دەوری خۆی ئەبێتە هۆی دوودڵی و قۆزتنەوە. ئەبێت دڵنیابین لەوەی کە ڕێگەگرتن وەك نیشانەیەك بۆ شتێك کە دوژمنکاری دروست ناکات بەدەردەکەوێت: زۆر بە توندی هەڵسوکەوت لەگەڵ منداڵدا نەکرێت، ئاسانکارییەکانی ئابلۆوقە نەدرێت، ڕێگەی پێ نەدرێت سەربەست بێت. بەڵام مەسەلە ڕاستەقینەکە ڕێگەگرتنی دانەبڕاندووە بەڵکو جەنگی منداڵ لە دژی ئەو هێزانەی کە ئەیانەوێت سەربەستی و بەرەڵایەتی تیا سەرکوت بکەن. چەندین فۆرم هەیە کە تیایدا جەنگ بۆ سەربەستی بەڕێوە دەچێت وە چەندین شێوازیش هەیە کە بەزین تیایدا شاراوەیە. ڕەنگە منداڵ ئامادە بێت کە دەسەڵاتی دەرەکی بە ناوەکی بکات و "باش" بێت، ئەمە ڕەنگە بە شێوەیەکی دیار هەڵگەڕانەوە بێت بەڵام بە ناسەربەخۆیی مابێتەوە، ڕەنگە ئەو منداڵە هەست بکات کە ئەو ئەگەڕێتەوە بۆ ڕێساگەلێکی کلتوورێکی دیاریکراو لەسەر حسابی خەسارەتی خودی تاکگەرایی خۆی -ئەنجامەکە هەمیشە پلەیەکی کەمتر یان زیاتر خاڵیبوونی ناخە، هەستکردنە بە هیچێتی، دوودڵی و لە هەموو ئەمەشەوە ڕقێکی درێژخایەن و نەخۆشی دەروونی لێدەکەوێتەوە کە نیچە زۆر بە باشی وەك ڕژدی ژیان دەستنیشانی کردووە.

بەهەرحاڵ جیاوازییەکی بچووك هەیە لە نێوان ڕق و ڕژدی بردنی ژیاندا. ئامانجی ڕق، لە دوا شیکارکردندا، بریتییە لە وێرانکردن و تێکشکاندنی ئەو شتەی لە دەرەوەی خودی خۆمە. بە تێکشکاندنیشی من هێز بەدەست دەهێنم بەڵام بە شێوەیەکی ڕێژەیی نەك ڕەها. لە ڕژدی بردنی ژیاندا، هەڵوێستی ڕژدی بردن دووبارە دەخوازێ کە ئەوانی تر تێکبشکێنێت نەك لەبەرئەوەی کە هێز و توانای ڕێژەیی بەدەست بهێنێت بەڵکو بۆ ئەوەی ئەو چێژەی هەبێت کە ئەوانی دی ڕێیان لێگیراوە کە چێژ لەو شتانە وەربگرن کە من ناتوانم بیچێژم. ئەم ئامانجی لابردنی ئازارە کە لەناو نەتوانایی خۆمدا بۆ خۆشگوزەرانی سەرچاوەی گرتووە، کاتێك کە کەسێکی تر دەیبێت ئەوە مانای وایە من نیمە.

بە شێوەیەکی بنەڕەتی هەمان فاکتەرەکان، گۆڕانی ڕقی درێژخایەن لە گروپێکدا دەکاتە مەرج. بە شێوەیەکی گشتی جیاوازییەکە لێرەدا لە نێوان سایکۆلۆژیای تاك و سایکۆلۆژیای کۆمەڵایەتیدا لەمەدا دەبینرێت: لە کاتێکدا لە سایکۆلۆژیای تاکدا، ئێمە بۆ تاك و هەلومەرجە ڕووداوییەکانی بەرپرس لە سیماتەکانی کاراکتەر کە بە هۆیە تاکێك جیاواز دەبێت لە ئەندامەکانی تری گروپەکەی، دەگەڕێین. لە سایکۆلۆژیای ئێمە حەز

بە سترەکتوری کاراکتەر دەکەین زیاتر لەوەی کە ئەمە (کۆمۆنتۆ)یەکە و لە ناو زۆرینەی ئەندامەکانی ئەو گروپەدا نموونەییە. بۆ مەسەلەی بارودۆخەکانیش، ئێمە بۆ بارودۆخی تاکی ڕووداوگەرای وەك باوکێکی لێپێچەرەوە یان مەرگی ناکاوی خوشکێکی خۆشەویست، بەڵام بۆ ئەو بارودۆخانەی ژیان کە ئەزموونێکی باون بۆ گروپی هاوشێوە. ئەمەش واتای یەکێك یان جیاکەرەوە دابڕاوەکانی تری هەموو مۆدی ژیان ناگەیەنێت بەڵکو واتای سترەکتوری هەمەکی ئەزموونە بنەڕەتییەکانی ژیان دەگەیەنێت چونکە ئەوانە بە شێوەیەکی بنەڕەتی لە لایەن هەڵوێستی سۆسیۆ- ئابووری و گروپێکی دیاریکراوەوە مەرجدار کراوە.

منداڵ بە توندی هەست بە "ڕوحیەتی" کۆمەڵگا دەکات ئەمەش بەرلەوەی کە بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ لەگەڵیدا ئاشنا بێت لە کاتی چوونە قوتابخانەدا. دایك و باوك لە پێکهاتەی کاراکتەری خۆیاندا ڕوحیەتی باوی ناو کۆمەڵگاکەی خۆیان و ئەو چینەی کە بۆی دەگەڕێنەوە دەنوێنن و ئەم کەش و ئاووهەوایە ئەگوێزرێتەوە بۆ منداڵەکە لەو ڕۆژەوەی کە لەدایك دەبێت. کەواتە خێزان بریتییە لە "ئاژانسی دەروونی" کۆمەڵگە. ئێستا بەردەوام بوون لەسەر گرفتەکانی جیاوازی کردن لە ڕقدا ڕوون دەبێتەوە. لە کاتێکدا لە حاڵەتی ڕقی دژەکرداردا، ئەو پاڵنەرەی کە لە هەمان کاتدا بریتییە لە بابەتیش، پێکهێنەری "هۆکار"ی ڕقیشە، لە حاڵەتی ڕقی بارودۆخی کاراکتەردا، ئاراستەی سەرەکی، ئامادەبوون بۆ ڕق، بەبێ ئاماژەکردن بۆ بابەتیك وە پیشتر پالنەریك دوژمنکارییە دریژخایەنەکە ئەگۆریت بۆ رقیکی دەرکەوتوو هەروەك روونکرایەوە، بە شیوەیەکی بنەرەتی ئەم رقە بنەرەتییە لە منالیدا بە هۆی چەند کەسانیکی دیاریکراوەوە هینراوەتە ئاراوە، بەلام دواتر بۆتە بەشیك لە پیکهاتەی کەسیتی وە بابەتیش کە رۆل دەبینیت بەلام رۆلیکی لاوەکی. لەبەرئەوە و لە حالەتەکەیدا و بە شیوەیەکی بنەرەتی، هیچ جیاوازییەك نییە لە نیوان شتەکان لە دەرەوەی خودی خۆم و خودی خۆمدا. دوژمنکاری هیواش و دریژخایەن *idling hostility* هەمیشە لەویدایە، ئەو بەپیی بارودۆخ لە دەرەوەی گۆرانی شتەکاندایە، بەلام پشت بە چەند فاکتەریك دەبەستیت لەوەدا کە ئایا خودی خۆم ئەبمە بابەتیك لە دوژمنکارییەکانی خۆم. ئەگەر کەسیك بیەویت بزانیت کە بۆچی کەسیکی دیاریکراو لە یەك حالەتدا بیزراوە وە بۆچی خودی خۆم لە حالەتیکی تردا بیزراوم؟ بۆ ئەم مەسەلەیە دەبیت لەو هەلویستەدا کە دەبینە جیگەی رقی دەرکەوتووی ئەوانی دی، فاکتەرە دیاریکراوەکانی ئەو رقە بزانین. ئەی لەم چوارچیوەیەدا چی بە لامانەوە خۆشە، ئایا ئەو بنەما گشتییەی کە رقی بارودۆخی کاراکتەر شتیکە لە تاکیکەوە تیشك دەداتەوە و وەك تیشکیکی گەرۆك زۆرجار تەرکیز دەخاتە سەر ئەم یان ئەو بابەت لە ناویشیاندا خودی خۆم.

بەهیزی رقی بنەرەتی یەکیکە لە گرفتە سەرەکییەکانی کلتووری ئیمە. لە سەرەتای ئەم

باسەدا، لە لایەن کالڤنیزم و پرۆتیستانیزمەوە وەها وێنەی مرۆڤ کێشرابوو کە لە بنەڕەتدا خراپ و ڕق لە خۆ گرە. ڕقی لووتەر لە دژی شۆڕشی جووتیاران زیاد لە پێویست توندوتیژ و چڕوپڕە.

ماکس فیبەر جەختی لەسەر بێمتمانەیی بۆ ئەوانی دی کردۆتەوە کە بەنێو ئەدەبی پیوریتانیدا کە پڕاوپڕە لە ئاگادارکردنەوە لە دژی هەبوونی هەر متمانەیەك لە پرۆسەی یارمەتیدان و باش ڕەفتارکردن لەگەڵ هاولاتییەکانماندا تێپەڕ دەبێت.

تەنانەت بێمتمانەیی قووڵ بەرەو نزیکترین هاوڕێی کەسێك لە لایەن باختێر *Baxter*ەوە باسکراوە. ت. ئادامز ئەڵێت: ئەو –کەسی زانا– لە ئاست کێشەیەکی دەرەوەی خۆیدا کوێرە، بەلام لە ئاست کێشەی خۆیدا چاوەکانی باش دەبینن.

کەسی زانا خۆی بە بازنەی کاروبارەکانی خۆیەوە وابەستە دەکات و متمانە بە پەنجەکانی خۆی ناکات لە بەرامبەر ئاگرە بێ سوودەکاندا.. ئەو هەست بە چەوتی جیهان دەکات و لەبەر ئەوەش فێر دەبێت کە هەردەم متمانە بە خودی خۆی و تا ڕادەیەکیش بە ئەوانی تر بکات بۆ ئەوەی لە لایەن بێهیواییەکەیەوە تێکوپێك نەشکێنرێت.

*(Work of Puritan Divines, quoted Weber. 1930. p. 222)*

هۆبز وای گریمانە کردبوو کە سروشتی مرۆڤ وەك سروشتی گیاندارێکی مشەخۆر وایە، کە پڕە لە دڕندەیی، و پەنابردنە بەر کوشتن و بڕ و تالان کردن. تەنها بە هۆی بیروڕا یەکخستنی هەمووانە دەربارەی ملکەچبوون بۆ دەسەلاتی دەوڵەت، ئاشتی و یاسا دروست دەبێت. تێڕوانینی کانت دەربارەی سروشتی مرۆڤ زۆر دوور نییە لە بۆچوونەکەی هۆبزەوە، ئەویش بە هەمان شێوە لەو باوەڕەدایە کە سروشتی مرۆڤ خاوەنی ئارەزوویەکی سروشتی بنەڕەتییە بۆ خراپە. لەنێو سایکۆلۆجیستەکاندا، ڕقی درێژخایەن وەك بەشێکی خۆڕسکی سروشتی مرۆڤ گریمانەیەکی باو بووە. ویلیەم جەیمز ئەمەی هێندە بە بەهێز دادەنا بە جۆرێك وای دەبینی کە ئێمە هەموو هەست بە پاڵنەرێکی سروشتی دەکەین لە دژی پەیوەندی فیزیکی لەگەڵ کەسانی تردا.

*(Cf. . James 1839, esp. vol. 2, p. 348)*



فرۆید

فرۆید لە تیۆرەکەیدا دەربارەی غەریزەی مردن دای نابوو کە لەبەر هەندێ هۆکاری بایۆلۆژی، مرۆڤ لە لایەن هێزێکی گەورەوە کە ناتوانرێت بەری لێ بگیرێت، پاڵی پێوە دەنرێت بۆ تێکشکاندنی ئەوانی تر یان تەنانەت خودی خۆشی. هەرچەندە هەندێ لە فەیلەسووفەکانی سەردەمی ڕۆشنگەری لەو باوەڕەدا بوون کە سروشتی مرۆڤ باشە و ئەو شەڕانگێزییەش کە تیایدایە بەرهەمی ئەو بارودۆخەیە کە مرۆڤ تیایدا دەژی. گریمانەی شەڕانگێزی مرۆڤ وەك بەشێکی بۆماوەیی لە سروشتی مرۆڤدا بە ئایدیای چەند بیریارێکی بەرچاوی سەردەمی نوێدا تێپەڕ

دەبێت هەر لە لوتەرەوە تا ئەبڕۆمان. ئێمە پێویستمان بەوە نییە کە گفتوگۆ لەسەر ئەوە بکەین کە ئایا ئەم گریمانەیە شیاوە یان نا. بە هەرحاڵ، فەیلەسووف و سایکۆلۆژیستەکان کە ئەم باوەڕەیان هەڵگرتووە تێبینەر و چاودێری وردی مرۆڤ بوون لەناو کلتوورەکانی خۆیاندا، وە لێرەشەوە ئەوان ئەو هەڵەیەیان کردووە کە مرۆڤی مۆدێرن لە جەوهەری خۆیدا بریتی نییە لە بەرهەمێکی مێژوویی بەڵکو سروشت وای کردووە کە وابێت. لە کاتێکدا کە بیریارە گرنگەکان بە شێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا بەهێزیی شەڕانگێزی ناو مرۆڤی مۆدێرنیان بەدی کردووە، ئایدیۆلۆژیا باوەکان و بیروباوەڕی مرۆڤی پێوانەیی مەیلی فەرامۆشکردنی دیاردەکان دەکات. تەنها ژمارەیەکی کەمی خەڵك بە ئاگان لە حەزنەکردنی ڕیشەییان بەرامبەر ئەوانی دی، خەڵکانێکی زۆر تەنها هەستێکیان هەیە بەرامبەر بە حەزکردن یان هەستکردنێکی کەم بەرامبەر ئەوانی دی.

زۆرینەی خەڵك تەواو بێئاگان لە توندی ئەو کینە درێژخایانەی کە لە ناخیاندایە و لە هەمان کاتیشدا لە ناخی ئەوانی دیدایە. ئەو خەڵکانە ئەو هەستەیان لا دروست بووە کە ئەوان دەزانن کە ئەوەی لە سەریان پێویستە بیکەن: حەز بە خەڵك بکەیت، خەڵکت بە باش بێتە بەرچاو، هەتا ئەو کاتەی کە بە ڕاستی و بە کردەوە کردارێکی دوژمنکارانە ئەنجام دەدەن. لێکجیانەکردنەوەی ئەم خەڵکە "کە حەزیان بە ئەوانی دییە" خاسیەتی قەرەبووخوازانەی وەك نەبوونێکی بنەڕەتی بۆ کەیفهاتن دەخاتە ڕوو.

لە کاتێکدا زۆر دووبارەبوونەوەی بێمتمانەیی و کەیف نەهاتن بە ئەوانی دی بەلای زۆربەی چاودێرانی کۆمەڵایەتییەوە زانراوە و کەیف بەخۆ نەهاتن کەمتر دیاردەیەکی ناسراو و ڕوونە. ئەم ڕق لەخۆبوونە ئەتوانرێت بە دەگمەن دابنرێت و تەنها لەو کاتەدا سەرهەڵبدات کە ئێمە بیر لەو حاڵەتانە دەکەینەوە کە تیایدا خەڵك بە شێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا ڕقیان لە خۆیان دەبێتەوە. زۆربەی کات ئەم ڕق لەخۆ بوونە بە زۆر شێوازی جۆراوجۆر دەشاردرێتەوە. یەکێك لەو دەربڕینانەی ڕق لەخۆبوون کە بە شێوەیەکی ناڕاستەوخۆ دووبارە دەبێتەوە بریتییە لەو ڕادە نزمییەی هەستەکان کە لە کلتووری ئێمەدا زۆر بەربڵاوە.

ئەو کەسانە بە شێوەیەکی بە ئاگایانە هەست ناکەن کە ڕقیان لە خودی خۆیانە: ئەوەی ئەوان هەستی پێ دەکەن بریتییە لەوەی کە ئەوان نزمن لە بەرامبەر ئەوانی دیدا، هەست دەکەن گەمژەن، هەست دەکەن قێزەوەند و سووکن.

دەبێت دڵنیابین لەوەی کە دینامیکای هەستکردن بە سووکی و خۆ بە کەم زانین زۆر ئاڵۆزە و چەند فاکتەرێکی تری هەیە جگە لەم فاکتەرەی کە ئێمە ئێستا باسی دەکەین. بەهەرحاڵ ئەم فاکتەرە هەرگیز ون نابێت و ڕق لەخۆبوون یان لانی کەم نەبوونی حەزکردن بە خۆت هەمیشە ئامادەیە و لە ڕوانگەی دینامیکیشەوە فاکتەرێکی گرنگە.

فۆرمێکی تری گونجاوتر بۆ ڕق لەخۆبوون بریتییە لە ئارەزووی ڕەخنە لەخۆگرتنی بەردەوام. ئەم خەڵکانە هەست بە سووکی یان کەمێتی خۆیان

ناکەن بەڵام ئەگەر بێت و هەڵەیەك بکەن، شتێك لە خۆیاندا بەدی بکەن کە نابێت وەهابێت، ڕەخنە لەخۆگرتنەکەیان سەرتاپا بەدەر دەبێت لە گرنگی ئەو هەڵەیە یان ئەو کەموکوڕییە.

ئەوان دەبێت یان کاملْ بن بە پێی پێوەرەکانی خۆیان، یان لانی کەم هێندە کاملْ بن کە لەگەلْ پێوەری ئەو خەڵکەی دەوروبەریاندا بگونجێن چونکە ئەوان بەزەیی و دانپیانانیان دەوێت. ئەگەر ئەوان وا هەست بکەن کە ئەوەی کردوویانە تەواو و کاملە یان ئەگەر ئەوان سەرکەوتوو بوون لە بەدەستهێنانی دانپیانانی خەڵکانی دی، ئەوا هەست بە خۆشی و ئاسوودەیی دەکەن. بەڵام هەرکە ئەمە دیار نەما ئەوا هەست دەکەن کە لە لایەن هەستێکی خۆ بە کەم زانینی توندەوە کۆنترۆلْ کراون. لێرەدا دووبارە نەبوونی سەرەکی کەیفهاتن بۆ خودی خۆیان بریتییە لە سەرچاوەیەك کە ئەو ئاراستەیەی لێوە هەڵدەقوڵێت. ئەم حاڵەتەمان باشتر بۆ ڕوون دەبێتەوە گەر بێت و ئەم ئاڕاستەیە بەرەو کەسێك لەگەلْ گونجاندنی کەسێك لەگەلْ ئەوانیدیدا بەراورد بکەین. بۆ نموونە ئەگەر پیاوێك بڕوای وا بێت کە ئافرەتێکی خۆش دەوێت دەبێت وا بیربکاتەوە کە ئەگەر ئەو ئافرەتە هەر هەڵەیەك بکات ئەوە مانای وایە کە ئەو باش نییە، یان ئەگەر هەستی پیاوەکە بەرامبەر بە ئافرەتەکە لەسەر ئەوەی ئایا کەسانی دی ڕەخنە لە ئافرەتەکە دەگرن یان پیای هەڵدەدەن، ئەوا ئێمە ناتوانین گومان لەوە بکەین کە نەبوونێکی بنەڕەتی خۆشەویستی لەو پیاوەدا هەیە بەرامبەر بە ئافرەتەکە. ئەوە ئەو کەسەیە کە ڕقی لەهەر کەسێکە کە هەموو هەلێك دەقۆزێتەوە بۆ ڕەخنەگرتن لە کەسێکی دی تا. دەربڕینی هەرە بەربڵاوی نەبوونی کەیف بەخۆ نەهاتن بریتییە لەو شێوەیەی کە خەڵك مامەڵە لەگەلْ خۆیاندا دەکەن. خەڵك خاوەنی کۆیلەی خۆیانن کە کۆیلەن. لە جیاتی ئەوەی ببنە کۆیلەی ئاغایەك لە دەرەوەی خودی خۆیان، کەچی ئاغاکە لە ناخی خۆیاندایە. ئەم ئاغایە هەڵەشە و دڵڕەقە و یەك چرکە پشوویان ناداتێ و هەموو خۆشی و شادییەکی لێ قەدەغە کردوون، ڕێگەیان پێ نادات کە ئەوەی دەیانەوێت ئەنجامی بدەن و ئەگەر ئەوان وایان کرد، ئەوا بە دزییەوە و بە ویژدانێکی تاوانکارانەوە دەیکەن. تەنانەت شوێنکەوتنی خۆشی بە هەمان شێوەی کارکردن شتێکی زۆرەملێیە. شوێنکەوتنی خۆشی دووریان ناخاتەوە لەو ناڕەحەتی و بێزارییە بەردەوامەی کە ژیانیانی داگیر کردووە. وە زۆربەی کاتیش ئەوان بەئاگا نین لەم مەسەلەیە. بەڵام چەند حاڵەتێکیش هەیە کە بەدەرە لەم مەسەلەیە. جەیمز سێسلمانی خاوەن بانك کە لە سەرەتای ژیانیدا سەروەت و سامانێکی زۆر و پلەوپایەی زۆری بەدەست هێنا، تەنها لە لایەن کەسانێکی کەمەوە بیستراوە کە جەیمز خۆی وتوویەتی: من هەرگیز لە ژیانمدا ئەوەم نەکردووە کە ویستوومە بیکەم و هەرگیزیش بۆم ناکرێت (*Cf. A Robeson, 1927*). ڕۆڵی (ویژدان *Conscience*) وەك بە ناوەکی کردنی دەسەڵاتە دەرەکییەکان و وەك گەیەنەری دوژمنکارییەکان دژی خۆت لە لایەن فرۆیدەوە بە ڕوونی بەدی کراوە لە فۆرمەلەکردنی چەمکی

(بەرزەمن) سوپەر ئیگۆدا. رۆید وا گریمانەی كردبوو كە بەرزە– من ڕێژەیەكی زۆری وێرانكاری بنەڕەتی لە خۆ دەگرێت كە لە مرۆڤدا هەیە و لە ڕووی ئەرك و ناچارییە ئاكارییەكاندا لە دژی خۆی ئاڕاستەیان دەكات. سەرەڕای نەیاری بۆ تیۆرەی سوپەر ئیگۆی فرۆید، كە ناتوانرێت لێرەدا بخرێتە ڕوو (بڕوانە گفتوگۆیەكم لەسەر سوپەر ئیگۆ لە ئی. فرۆم *1936* ئەی) فرۆید بێگومان بە باشی هەستی بەو دوژمنكاری و دڵڕەقییە كردووە كە لە (ویژدان)دا هەیە.

ئەوەی ڕاستی دەربارەی دوژمنكاری و ڕقوكینە هەڵگرتووە، ڕاستی دەربارەی خۆشەویستیشی هەڵگرتووە، هێشتا خۆشەویستی بۆ ئەوانی دی و خۆشویستنی خود تا ڕادەیەك گرفتێكی قورسترە بۆ گفتوگۆكردن لەسەری: ئەمەش بە هۆی دوو هۆكارەوە. یەكەمیان ئەو ڕاستییەیە كە كینە دیاردەیەكە كە لەهەر كوێیەكی كۆمەڵگای ئێمەدا دەتوانرێت بەدی بكرێت، وە لەبەر ئەمەشە كە كینە بابەتێكی ئاسانە بۆ لێوردبوونەوە و لێكۆڵینەوەی ئەزموونی. بەڵام بە بەراوردكردن، خۆشەویستی دیاردەیەكی دەگمەنە و تەنها لە كاتی گرفتەكاندا گونجاوە بۆ لێكۆڵینەوەی ئەزموونی. لەبەرئەوە هەر گفتوگۆیەك دەربارەی خۆشەویستی واتای خەتەرناكی بوون بە نائەزموونی و تەنها مەزەندەكاری دەگەیەنێت، گرفت یان ناڕەحەتییەكی تر ڕەنگە گەورەتر بێت. لە زمانی ئێمەدا وشەیەك نییە هێندەی وشەی (خۆشەویستی) خراپ بەكارهێنرابێت و لەكەدار كرابێت. وشەی خۆشەویستی لە لایەن ئەوانە باسكراوە و پێشنیار كراوە كە ئامادەبوون پەیڕەوی لەهەر كارێكی دڵڕەقانە بكەن كە خزمەتی هێنانەدی مەبەستەكانیان بكات. وشەی خۆشەویستی وەك ماسكێك بەكارهێنراوە بۆ زۆركردن لە خەڵك كە ئاسوودەیی و دڵخۆشییەكانی خۆیان بكەنە قوربانی و بۆ ملكەچ پێكردنی هەموو شتەكانی خۆیان بۆ بەرژەوەندی ئەوانەی كە سوود لەم ملكەچییە وەردەگرن. وشەی خۆشەویستی وەك بناغەی ئاكاری بۆ داواكاری بێ پاسا و بەكارهێنراوە.

خۆشەویستی وا بەتاڵ كراوەتەوە كە بەلای خەڵكانێكی زۆرەوە خۆشەویستی مانای ئەوە بگەیەنێت كە دوو كەس بۆ ماوەی بیست ساڵ پێكەوە بژین بەبێ ئەوەی لە هەفتەیەكدا لە جارێك زیاتر شەڕ و دەمەقاڵە بكەن. ئەمە مەترسیدار و بگرە شەرمەزارییە كە وشەیەك بەو جۆرە بەكاربهێنرێت، هێشتا ڕەنگە دەروونناسێك خۆی بۆ ئەم شەرمەزارییە شل نەكات و مل نەدات. ئامۆژگاری كردنی خەڵك بۆ خۆشەویستیكردن لە باشترین حاڵەتدا چێژێكی خراپە، بەڵام ئەنجامدانی شیكارییەكی سادە و ڕەخنەیی لەسەر دیاردەی خۆشەویستی و ڕووهەڵماڵینی كاروبارە بە خۆشەویستی ڕەنگڕێژكراوەكانی كە ناتوانرێت لە یەكتری جیابكرێنەوە بریتییە لە ناچارییەك كە دەروونناس ئەو مافەی نییە كە لێی بەدوور بێت. خەریكە قسەی زیاتر لەسەر ئەم مەسەلەیە دەكەین بەبێ ئەوەی كە پێتان ڕابگەیەنم كە ئەم باسە هەوڵدان نییە بۆ شیكردنەوەی خۆشەویستی تەنانەت وەسفكردنی دیاردە سایكۆلۆژییەكان كە

بە شێوەیەكی تەقلیدی بە زاراوەی (خۆشەویستی) داپۆشراوە بەشێكی گەورەی كتێبێكی پێویستە.

دوو دیاردە زۆر بە توندی پەیوەستن بە یەكترییەوەو زۆربەی جار وەك خۆشەویستی خراوەتە ڕوو –خۆشەویستی ماسۆشیی و سادیی. لە حاڵەتی خۆشەویستی ماسۆشیانەدا، كەسێك خودی خۆی، دەستپێشكەری خۆی و هەماهەنگی خۆی وەلا دەنێت بۆ ئەوەی جارێكی تر بە شێوەیەكی گشتی لە كەسێكی تردا كە بەهێزترە سەرهەڵبداتەوە. بە هۆی ئەو دوودڵیانەوە كە ئەو هەستە تەرەقی پیَ دەدات كە كەسێك ناتوانێت لەسەر قاچەكانی بوەستێت، كەسێك دەیەوێت دووربێت لە خودی تاكئاسای خۆی و دەیەوێت ببێت بە بەشێك لە بوونێكی تر، بەم جۆرە ئاسایشی تیا دروست دەبێت و سەنتەرێك ئەدۆزیتەوە كە ئەو كەسە خۆی تیایدا ون دەكات.

ئەم خۆبەدەستەوەدانەی خودی كەسێك زۆرجار وەكو نموونەیەك بۆ "خۆشەویستی گەورە" بە شان و بالیدا هەلدراوە. لە راستیدا ئەمە فۆرمیكی بتپەرستییە و لەناوبردنی خودیشە. ئەو راستییەی كە ئەم خۆبەدەستەوەدانە وەك خۆشەویستی بە هەند وەرگیراوە وای كردووە كە زیاتر مەترسیدار بێت.

خۆشەویستی سادیانە لە لایەكی ترەوە لەو ئارەزووەوە سەرچاوە دەگرێت كە دەخوازێت بابەتەكەی خۆی هەلبلوشیت بۆ ئەوەی بیكاتە ئامیرێكی بی ئیرادە لەبەردەستی خۆیدا. ئەم مەیلە لە نەتوانایییەكی قوولەوە بۆ ئەوەی بە تەنها و بە پشتبەستن بە خۆی لەسەر قاچ بوەستێت، سەرچاوەی گرتووە، بەڵام لە جیاتی دۆزینەوەی هێز و توانای روو لە زیادبوون بە هۆی ئەوەی كە هەللووشراوە، توانا و ئارامی لە بوونی هێزی سنووردارا بەسەر كەسانی تردا بەدی دەكرێت. خۆشەویستی ماسۆشی هەروەها سادیش دەربری یەك پێداویستی سەرەكین كە لە نەتواناییەكی سەرەكییەوە هەلدەقولێن بۆ ئەوەی سەربەخۆ بن. گەر ئەم مەسەلەیە بخەینە سەر شێوەی زاراوەی بایۆلۆژی، ئەم پێداویستیە سەرەكییە پێی دەوترێت "سیمبایۆسیس *Symbiosis* "پەیوەندی نزیكی نیوان رەگەزێك و ئەو پیكهاتەیەی كە ئەم رەگەزە بەشیكی بچووكیەتی –و–" خۆشەویستی سادی زۆربەی كات ئەو جۆرە خۆشەویستییەیە كە دایك و باوكان هەیانە بۆ منالەكانیان. ئایا كۆنترۆلكردنەكە بە شێوەیەكی روون دەسەلاتگەرایە یان "مۆدیرن" هیچ جیاوازییەكی بنەرەتی دروست ناكات. لەهەر حالەتیكیاندا، خۆشەویستییەكە ئارەزووی لاوازكردنی خود (*Self*)ی منال دەكات و لە ساڵانی دواتردا بەرەو پیشكەوتن ئاراستەی ئارەزووە سیمبایۆتیكیەكان پالی پیوە دەنیت. خۆشەویستی سادیانە لەنیو پیگەیشتوواندا زۆر بەربلاو نییە. زۆرجار لە پەیوەندییە دریژخایەنەكاندا، رقلیبوون تایبەت بە هەردوو ماناكە هەمیشەییە، هاوبەشیك جەمسەریكی پەیوەندییە سیمبایوتیكییەكە دەنوینیت كە جەمسەری سادیزمە و هاوبەشەكەی تر جەمسەرەكەی تری دەنوینیت كە جەمسەری ماسۆشیزمە. زۆرجار رۆلەكان بە تەواوی دەگۆرین

–خەباتی بەردەوام بۆ كۆنترۆڵكردن و ملكەچكردن وەك خۆشەویستی ڕاڤە كراوە.

لـەوەی كـە پێشـتر باسمـان كـرد، بۆمـان دەردەكـەوێت كـە نـاتوانرێت خۆشەویسـتی لـە سەربەسـتی و سـەربەخۆیی جیابكرێتـەوە، بـە پێچەوانـەی خۆشەویستی بە نـاو سیمبایوتیكی، پێكهاتـەی بنـەڕەتی خۆشەویسـتی بریتییـە لـە سەربەسـتی و یەكسـانی. سـیمای خۆشەویسـتی بریتییە لـە هێز، سەربەخۆیی، هەماهـەنگی خـود، كـە نـاتوانێت بـە تەنـها لەسـەر پـێ بووەسـتێت و بەرگەی دابڕان بگرێت. ئەم خاسـیەتە بـۆ كەسـی خۆشویستراو و ئەوەش كە خۆشەویستی بەخشـە هـەر ڕاستە. خۆشەویستی كردەیـەكی خۆوەكییـە. خۆوەكیـش بـە مانـا حەرفییەكەشـی توانـا بـۆ ئەنجامدانی ویستی ئازادی كەسێك دەگەیـەنێت. گەر دوودڵی و لاوازی خود ببنە ڕێگرێك لەبەردەم تاكدا بۆ ئەوەی لە ناخی خۆیدا ڕەنگ بداتـەوە و ڕیشـە دابكوتێـت، ئـەوا نـاتوانێت خۆشەویسـتی بكات.

ناتوانرێت بە تەواوەتی ئەم ڕاستییە لە خەڵك بگەیـەندرێت تەنها لـەو حاڵەتـەدا نـەبێت كـە ئێمـە ئەوە لەبەرچاو بگرین كە ئایا خۆشەویستی بەرەو چـی ئاڕاسـتە كـراوە. خۆشەویسـتی پێچەوانـەی ڕقوكینەیە. ڕقوكینە هەستێكە ئاوات بۆ وێرانكاری دەخوازێـت؛ خۆشەویسـتی جەختكردنەوەیـەكی سۆزدارە بۆ "بابەت"ەكەی خۆی ئەمە مانای ئەویە كە خۆشەویستی بریتی نییە لە "كاریگەری"یەك، بەڵكو هەوڵدانێكی چالاكە و ئامانجەكەش بریتییە لـە خۆشەویسـتی، پێشـكەوتن، و سەربەسـتی "بابەتەكـەی" ئـەم جەختكردنـە سۆزدارییە شـتێكی مـەحاڵ دەبێـت گـەر خـودی كەسـێك لاواز بێـت، چونكە ئەم جەختكردنە ڕەسەنە هەمیشە لە هێز و تواناوە سەرچاوە دەگرێت.

ئـەو كەسـەی كـە خـودی خـۆی لـە لاوازیدایـە دەتوانێـت تەنها بـە شێوەیەكی ڕاڕا خۆشەویسـتی بكـات، واتـە ئـەو كەسـە دەتوانێـت بـە بەشـە بەهێزەكـەی خۆشەویسـتی بكـات و بـە بەشـە لاوازەكەشی دەبێت ڕقوكینە ببەخشێتەوە.

زاراوەی جەختكردنەوەی سۆزاوی (*Passionate affirmation*) بە ئاسانی بـەرەو بـە هەڵەتێگەیشـتن مـل دەنێـت، واتـە جەختكردنـەوەی ڕووناكبـیری مانای حوكمدانێكی تەواو عەقڵانی ناگەیەنێت. ئەم زاراوەیە جەختكردنەوەیەكی قووڵتر دەگەیەنێت كە تیـایدا شەخسـیەت، ڕووناكبـیری، هەسـت و سۆزەكانی كەسێك وەك گشتێك بەشداری دەكەن. چـاو، گـوێ، لووتـی كەسـێك زۆرجـار ئۆرگـانی جەختكردنـەوەی باشـترن لـە عـەقڵی ئـەو كەسـە. ئەگـەر ئـەم جەختكردنـەوە قـووڵ و سـۆزاوییە، پەیوەست كراوە بـە جەوهـەری "بابـەت"ەوە نـەك تەنها بە چۆنێتییە كەرتیەكانەوە، ئەوا لە تەوراتدا هیـچ دەسـتەواژەیەكی تـر هێنـدەی دەسـتەواژەی خۆشەویستی خوا بۆ مرۆڤ بوونی نییە جگە لـەو وتەیـەی كـە لـە كۆتایی هـەر ڕۆژێكـی بەدیـهێنانی (خلق)دا دەوترێت: "خوا ئەمەی بینی كە باشە".

خـراپ تێگەیشـتنێكی تریـش هەیـە كـە دەتوانرێت بە شێوەیەكی تایبەت خۆی لێ لابدرێت یـان بـە دوور بگـیرێت. ڕەنگـە لـەو شـتانەی كـە باسمان كرد، كەسێك بگاتە ئەو ئاكامەی كە هەموو

جەختکردنەوەیـــەك خۆشەویســـتییە بـــەبێ لەبەرچاوگرتنی شایستەیی بابەتەکە بۆ ئـەوەی خـۆش بویسـترێت، ڕەنگـە ئەمـە ئـەو مانایـە بگەیـەنێت کـە خۆشەویستی هەستێکی پوختـی زاتی جەختکردنەوەیە وە گرفتی بەها بابەتییەکان ناچێتـە نـاو ئـەم مەسـەلەیەوە. لـێرەدا پرسـیارێك سـەرهەڵدەدات، ئایـا کەسـێك ئـەتوانێت خراپـەی خۆش بوێت؟ ئێمە لێرەدا ڕووبەڕووی یـەکێك لـە هـەرە قورسترین گرفتـەکانی سایکۆلۆژی فەلسـەفە دەبینـەوە، گفتوگۆیـەك کـە نـاکرێت لـێرەدا لێـی بدوێـین. بەهـەرحاڵ، مـن دەبێـت ئـەوە دووبـارە بکەمەوە کـە جەختکردنـەوە بـەو مانایـەی لـێرەدا بەکارهێنراوە شتێك نییە کە سەد دەرسـەد زاتـی بێـت. خۆشەویسـتی جەختکردنـــەوەی ژیـــان، پێگەیشـــتن، خۆشـــنوودی، و سەربەســـتییە. لەبەرئەوە گەر بە پێناسەش بێت خراپە نەفیکردن، مـردن، و جەبرییـەت دەگەیـەنێت کـە نـاتوانرێت خۆشبوویسترێت. بە دڵنیاییـەوە دەیڵێم هەسـتی زاتی دەتوانرێت ببێتە خۆشی یان وروژاندنێکی پڕ خۆشی، کە بە ئاگایانە لە زاراوەی خۆشەویستی تـەقلیدیدا فۆرمەلـە کراوە. ئـەو کەسـە ڕەنگـە لـەو باوەڕەدا بێت کە ئەو خۆشەویستی دەکات، بەڵام شـیکردنەوەکانی نـاوەڕۆکی مێشـکی حاڵــەتێك دەخەنـە ڕوو کـە زۆر جیـاوازە لـەوەی مـن وەك خۆشەویستی باسم کردووە. پرسیاری هاوشێوەی ئەمە زۆر سەرهەڵدەدەن لە قسەکردن لەسەر گرفتی سایکۆلۆژی تری دیاریکراودا، بۆ نموونـە، گرفتی ئەوەی کە ئایا ئاسـوودەیی پاشـکۆ و پەیوەسـتی بـــەهای دیـــاریکراوی تـــری وەك سەربەســـتی و هەماهەنگییـە؟ ڕەنگـە کەسـێك هەمیشـە ئـەم دەمەقاڵەیەی وەها بەکارهێنابێت کە ئەو کەسانەی "ئاســـوودەن" بـــۆ ئەوەیـــە کـــە پاســـاو بـــۆ سـەرکوتکردنەکانیان دابنێـن. ئەمـەش بـەرگری لـەخۆکردنێکی لاوازە. نـاتوانرێت سەربەسـتی لـە بەهاگەلێکی دیاریکراو جیابکرێتەوە و ئاسوودەیی هەروا بە ئاسانیش بریتی نییە لە هەستێکی زاتی کەیفـهاتن. ئـەو حاڵەتـەی لـێرەدا شایسـتەی باسـکردنە بریتییـە لـە ماسۆشـیزم. کەسـێك ئەتوانێت کەیفی بە ملکەچکردن بێت یان کەیفی بە سـزادان و بگـرە مـەرگیش بێـت، بـەڵام هیـچ ئاسـوودەییەك لـە ملکـەچی و سـزادان و مردنـدا نییە.

ئـەم لەبەرچاوگرتنـە مـەیدانی سـایکۆلۆژی جێدەهێڵێـت و ئەگەڕێتـەوە بـۆ مـەیدانی فەلسـەفە یان ئاین. من پێم وا نییە ئەم وابێت. شیکارێکی سـایکۆلۆژی ورد و خەسـت ئـەتوانێت جیـاوازی نێوان کەیفهاتن و ئاسوودەیی پیشان بدات. هێشتا ڕەنگە سایکۆلۆژیا بـەئاگابێت لـەم گرفتانـە تەنـها ئەگـەر هـەوڵ نـەدات خـۆی لـە گرفتـی بـەهاکان جیابکاتـەوە و لـە کۆتاییشـدا پاشەکشـی لـەو پرسیارە ناکات کە دەربارەی مەبەست و ئامانجی بوونی مرۆڤە.

خۆشەویسـتی وەکـو ڕقـی هەلومـەرج یـان بارودۆخی کاراکتەر لە ئاراستەیەکی سەرەکییەوە سەرچاوەی گرتووە کە بە شێوەیەکی هەمیشەیی ئامادەیی هەیە، ئامادەییەك بۆ خۆشەویستی یان بـۆ سـۆزێکی بنـەڕەتی. خۆشەویسـتی لـە ئۆبژێکتێکـی تایبەتییـەوە سـەرچاوەی گرتـووە.

توانست و ئامادەیی بۆ خۆشەویستی جیاکەرەوەیەکی کاراکتەرە و هەمان شێوەی ئامادەییشە بۆ رقلیبوون کاریکی گرانە کە بلییت کامانەن ئەو بارودۆخانەی کە لە بەرژەوەندی گەشەکردنی ئەم سۆزە بنەرەتییەدان. پیدەچیت دوو بارودۆخی سەرەکی هەبیت، یەکیکی پۆزەتیڤ و یەکیکی نیگەتیڤ. بە شیوەیەکی ساکار بارودۆخە پۆزەتیڤەکە ئەوەیە کە وەك منالیك خۆشەویستی ئەزموونکراوت هەبیت لە کەسانی ترەوە. بە شیوەیەکی تەقلیدی وا دانراوە کە دایك و باوك منالەکانیان وەك بابەتیك خۆش دەویت ئەمەش حالەتیکی (استثنائی)یە زیاتر لەوەی ریسایەك بیت. ئەم بارودۆخە پۆزەتیڤە زۆربەی کات غائبە. بارودۆخی نیگەتیڤ بریتییە لە غیابی هەموو ئەم فاکتەرانەی کە لە سەرەوە باسکران. کەسیکی لیکۆلیاری ئەزموونەکانی منالی باش گومان لەوە دەکات کە غیابی ئەم بارودۆخانە زۆر زۆرن.

لەو پیشینە لۆژیکییەوەی کە پیی وایە خۆشەویستی راستەقینە لە سۆزیکی بنەرەتییەوە سەرچاوەی گرتووە، ئەنجامیکی گرنگ سەبارەت بە بابەتەکانی خۆشەویستی سەرهەلدەدات. ئەم ئەنجامەش لە بنەرەتدا هەمان ئەنجامەکە دەربارەی بابەتەکانی رقی دریژخایەن وترا: بابەتەکانی خۆشەویستی خاوەنی تایبەتمەندیتی نین. دەبیت دلنیا بین لەوەی کە ریکەوت نییە کەسیکی دیاریکراو دەبیتە بابەتی خۆشەویستییەکی دەرکەوتوو. ئەو فاکتەرانەی کە دەستنیشانکەری هەلبژاردن (خیار)ی لەم جۆرەن زۆر لەوە قورستر و زۆرترن کە لیرەدا باس بکرین.

هەرچۆنیك بیت خالی گرنگ ئەوەیە کە خۆشەویستی بۆ بابەتیکی دیاریکراو تەنها بریتییە لە راستاندن (بە واقیعی کردن) و تەرکیزکردنە سەر خۆشەویستی خاو و لەسەرخۆ لە روانگەی یەك کەسەوە. ئەمە وەك ئایدیای خۆشەویستی رۆمانسی نییە کە پیی وایە لە دنیادا تەنها یەك کەس هەیە کە خۆشت بویت؛ وە ئەمەش ئەو هەلە گەورەیەیە کە کەسیك بە دریژی تەمەنی خۆی دەبیت بیقۆزیتەوە بۆ دۆزینەوەی ئەو تەنها کەسە. وە ئەو خۆشەویستییەش بۆ ئەو پیاوە یان ئەو ژنە دەبیتە هۆی کشانەوە لە هەموو ئەوانی دی (کەسانی دی). ئەو جۆرەی خۆشەویستی کە دەتوانریت لە رووی یەك کەسییەوە ئەزموون بکریت، بەو راستییە ئاشکرا دەکریت و دەخریتە روو کە ئەوە خۆشەویستی نییە، بەلکو پاشکۆیەتییەکی سۆزاوییە. جەختکردنەوەی بنەرەتی کە لە خۆشەویستیدا هەیە بەرەو کەسی خۆشویستراو وەك بەرجەستەکردنی چۆنیتییە بنەرەتییەکانی مرۆڤ وایە کە بەرەو کەسی خۆشویستراو ئاراستە کراوە. خۆشەویستی بەرامبەر یەك کەس واتا خۆشەویستی بۆ مرۆڤ وەك ئەوەی کە هەیە. ئەو جۆرەی "کار دابەشکردن" کە ویلیەم جەیمز وای ناوناوە، واتە خۆشویستنی ئەندامانی خیزانەکەت، بەلام لە دەرەوەی هەستکردن و خۆشویستنی "نامۆ"یەك کە ئەمەش بە بروای جەیمز بریتییە لە نەتوانایییەکی سەرەکی بۆ

خۆشەویستی. خۆشەویستی بۆ مرۆڤ وەك ئەمە بریتی نییە لە رووتکردنەوەیەك کە لە دوای خۆشەویستی بۆ کەسیکی دیاریکراوەوە بیت، یان گەورەکردنیکی ئەزموونەکە لەگەل بابەتیکی دیاریکراودا بیت، بەلکو ئەمە لۆژیکە بە هەند وەرگیراوەکەیەتی کە لە پەیوەندیکردن لەگەل تاکە کۆنکریتەکاندا پیویستی دەبیت.

لەمەوە دەگەینە ئەو ئاکامەی کە خودی خۆم بریتییە لە بابەتیك بۆ خۆشەویستی یەکەم وەك کەسیکی دی. جەختکردنە سەر ژیانی خۆم، ئاسوودەیی، پیگەیشتن، سەربەستی خۆم لە ئامادەیی ئامادەبوونی سەرەکی و توانای باش بۆ ئەم جۆرە جەختکردنەوەیە سەرچاوەی گرتووە. گەر تاکیك ئەم ئامادەییەی هەبیت، ئەوا ئەو دەربارەی خودی خۆشی هەیەتی، گەر ئەو توانی تەنها ئەوانی دی خۆشبوویت، ئەوا هەرگیز ناتوانیت خۆشەویستی بکات یان خۆشەویستی ببەخشیت. بە کورتی خۆشەویستی ناتوانریت بە هەمان شیوەی رق لە سۆنگەی بابەتەکانییەوە دابەش بکریت.

ئەو بنەمایەی لیرەدا دەستنیشان کراوە و پیی وایە رق و خۆشەویستی بریتین لە راستاندنی ئامادەییەکی هەمیشەیی، دەربارەی دیاردەی تری سایکۆلۆژیش هەر راستە. بۆ نموونە ئارەزووپەرستی (شەهوانیەت) بریتی نییە لە پەرچەکرداریك لە بەرامبەر وروژینەریکدا. کەسی شەهوانی یان ئەوەی کە پیی دەوتریت کەسی ئیرۆتیکی، ئاراستەیەکی ئیرۆتیکی هەیە بەرەو جیهان. ئەمە مانای ئەوە نییە کە ئەو بە شیوەیەکی نەگۆر لە رووی سیکسییەوە وروژاوە، بەلکو مانای ئەوە دەگەیەنیت کە کەشوهەوایەکی ئیرۆتیکی هەیە لە لایەن بابەتیکی دیاریکراوەوە راستینراوە یان هینراوەتە دی. ئەوەی لیرەدا مەبەستمە بریتی نییە لە توانای بەخشراوی فسیۆلۆژی بۆ ئەوەی لە رووی سیکسییەوە بوروژیت، بەلکو کەشوهەوایەکی ئامادەیی ئیرۆتیکییە کە دەتوانریت لەو کاتەدا کە کەسەکە لە حالەتی وروژاندنی سیکسی راستەقینەدا نییە لەژیر زەرەبینیکدا سەرنجی لی بدریت. لە لایەکی ترەوە کەسانیك هەن کە ئەم ئامادەییە ئیرۆتیکییەیان تیادا نییە. لەو کەسانەدا وروژاندنی سیکسی بە شیوەیەکی بنەرەتی بە هۆی وروژینەریکەوە کە لەناو غەریزەی سیکسدا کاردەکات، دروست دەبیت. ئاستی وروژاندنی ئەو کەسانە لە نیوان سنووره فراوانەکاندا دەگۆریت، بەلام لەم جۆرە وروژاندنە سیکسییەدا چۆنیتییەکی هاوبەش هەیە کە بریتییە لە جیاوازبون لە کەسیتییە گشتییەکەی ناو چۆنیتییە روناکبیری و سۆزدارییەکەی.

روونکردنەوەیەکی تری هەمان بنەما بریتییە لە واتای جوانی. جۆرە کەسیتییەك هەیە کە ئامادەیی بۆ بینینی جوانی هەیە. دووبارە ئەمە مانای ئەوە ناگەیەنیت کە ئەو بە شیوەیەکی نەگۆر سەیری وینە، و خەلك و، دیمەنە جوانەکان دەکات. بەلام کاتیك ئەو شتانە بوونیان دەبیت، ئامادەییەکی هەمیشەیی و بەردەوام بەدی دیت، و هەستی ئەو بەرامبەر جوانیی هەروا بە ئاسانی لە لایەن ئەو شتەوە ناوروژیت.

لیرەدا دووبارە لیوردبوونەوەیەکی پوخت ئەوە نیشان دەدات کە ئەم جۆرە خەلکە شیوەیەکی جیاوازیان هەیە بۆ روانینە جیهان و ئەو شتانەش کە هەستی جوانیش نابزوینن. ئیمە دەتوانین نموونەی زیاتر لەسەر ئەم بنەمایە بخەینە روو. لیرەدا بنەماکە ئاشکرایە: لە کاتیکدا زۆریك لە قوتابخانە سایکۆلۆژییەکان لە رووی پەرچە وروژینەرەوە بیریان لە کاردانەوەی مرۆڤ کردۆتەوە، ئەمەش بە پیی ئەو بنەمایەی کە کاراکتەر بریتییە لە بناغەی ژمارەیەکی زۆری ئامادەگییەکان لەو جۆرانەی کە باسمان کردن، کە بە شیوەیەکی نەگۆر ئامادەییان هەیە، بەلام بە هۆی وروژینەریکی دەرەکییەوە رووی نەداوە. ئەم تیروانینە بۆ سایکۆلۆژیای داینامیکی لەو جۆرە شتیکی بنەرەتییە.

فرۆید وای دانابوو کە هەموو ئەم ئامادەگیانە لەو غەریزانەوە سەرچاوەیان گرتووە کە لەناو پیکهاتەی بایۆلۆژی مرۆڤدان. بە بروای من گەر ئەمە بە نیسبەت هەندیکیانەوە راست بیت، ئەوا هەندەکەی تریان وەك پەرچەکردار بۆ تاك و ئەزموونە کۆمەلایەتییەکانی تاك سەریان هەلداوە. دواهەمین پرسیاریك دەمینیتەوە بۆ ئەوەی گفتوگۆی لەسەر بکەین. وا دانراوە کە خۆشەویستی بۆ خۆت و ئەوانی دیش لە بنەرەتدا تەرین، ئەی کەواتە ئیمە چۆن ئەو جۆرەی خۆپەرستی کە بە شیوەیەکی ئاشکرا دژە لەگەل هەر بایەخدانیك بە ئەوانی دی، روون بکەینەوە؟ کەسی خۆپەرست تەنها کەیفی بە خودی خۆی دیت، و هەموو شتیکی هەر بۆ خۆی دەویت و هیچ سوودیك بە ئەوانی دی نابەخشیت چونکە هەر پەرۆشی قۆرغ کردنیەتی بۆ خۆی. ئەو تەنها لە روانگەی ئەوەی چی لە دنیاوە چنگ دەکەویت، دەروانیتە ژیان. ئەو ریز لە سەروەری و بەرژەوەندی و سوودی کەسانی دی ناگریت. کەسی خۆپەرست تەنها هەر خۆی دەبینیت، و تەنها لە روانگەی بە سوودی شتەکان و کەسەکان بۆ ئەم، هەلسەنگاندن دەکات. کەسی خۆپەرست هەرگیز ناتوانیت خۆشەویستی بکات. ئەم خۆپەرستییە دەتوانریت بە هۆی هەموو جۆرەکانی ئامازە خۆپەرستییەکانەوە بخریتە روو یان حەشار بدریت. ئاشکرایە کە لەم جۆرە کەسانەدا دژایەتییەك هەیە لە نیوان بایەخی زۆروزەوەند بۆ خودی خۆیان و نەبوونی بایەخ بۆ ئەوانی دی. خۆپەرستی و خۆشویستنی خود بە دوور لەوەی کە هاوشیوەن، دژیەکیشن. خۆپەرستی جۆریکە لە چاوچنۆکی. وەك هەموو بەرچاوتەنگییەك، خۆپەرستی ناجیگیرییەك لەخۆ دەگریت وەك ئاکامیك بۆ ئەوەی کە هەرگیز کەیف هاتنیکی راستەقینە نییە. چاوچنۆکی چالیکی زۆر قوولە کە کەسەکە بە هەولدانیکی بیکۆتاوە ماندوو دەکات بە مەسەلەی کەیفهاتن بە پیداویستی بە بی ئەوەی هەرگیز پیی بگات. ئەم مەسەلەیە بەرەو خالیکی گرنگ دەمانبات: لیوردبوونەوەی ورد ئەوە نیشان دەدات کە لە کاتیکدا کەسی خۆپەرست هەمیشە بە دوولییەوە هەر خەمی خۆیەتی، و هەمیشە نارازی و هەلپەیەتی لە پیناو شتەکاندا، دەبینین ئەم حالەتە بەرەو ترسیکی بی ئامانی دەبات. کەسی خۆپەرست پر دەبیت لە رژدی بردنی سووتینەر

بەرامبەر هەر کەسیك کە لەم زیاتری هەبیت. گەر وردتر سەرنج بدەین، بە تایبەت لە داینامیکە نائاگاییەکان، بۆمان دەردەکەویت کە ئەم جۆرە کەسانە لە بنەرەتدا کەیفیان بە خودی خۆیان نایەت و بگرە زۆر بە قوولی رقیان لە خۆیانە. ئەو مەتەلەی کە لەم دژیەك بوونەدایە بە ئاسانی شی دەکریتەوە. خۆپەرستی لە نەبوونی کەیفهاتنی کەسیکەوە بۆ خۆی سەرچاوەی گرتووە. ئەو کەسەی کە کەیفی بە خۆی نایەت، کە خۆی پێ قبوول ناکریت، لە دوودلییەکی بەردەوامدایە سەبارەت بە خودی خۆی. ئەو کەسە ئاسایشی ناوەکی نییە چونکە ئەو جۆرە ئاسایشە تەنها لەبەر رۆشنایی کەیف بە خۆهاتن و جەختکردنەوەدا دروست دەبیت. هەمان شت دەربارەی ئەوانەی پییان دەوتریت کەسە نەرجسییەکان -خود شەیداکان- هەر راستە. ئەمان هیندەی حەز لە خۆیان دەکەن، هیندە پەرۆشی بەدەستهینانی شتەکان نین. ئەمە لە کاتیکدایە کە لە رووکەشدا وا دیارە کە ئەم کەسە نەرجسییانە لە خۆشەویستییەکی قوولدان لەگەل خۆیاندا، بەلام لە راستیدا هیچ کەیفیان بە خۆیان نایەت و نەرجسییەتەکەشیان -بەهەمان شیوەی خۆپەرستی- بریتییە لە قەرەبووکردنەوەیەك بۆ ئەو نەبوونیە بنەرەتییەی خۆشەویستی خود.

فرۆید دەستنیشانی ئەوەی کردبوو کە کەسی نەرجسی خۆشەویستییەکەی بۆ کەسانی دی کیشاوەتەوە و ئاراستەی خودی خۆی کردووە. لە کاتیکدا بەشی یەکەمی دەستەواژەکەی فرۆید راستە، بەلام بەشی دووەم تەواو هەلەیە، چونکە کەسی نەرجسی نە خۆی خۆش دەویت و نە کەسانی تریش.

تیگەیشتن لەم میکانیزمە ئاسانترە گەر بیت و بەراوردی ئەمە لەگەل زۆر بە تەنگەوەهاتن و زۆر پاریزگاری کردنی کەسانی تر، بکەین. ئەو دایکیکی بە تەنگەوەهاتوو بیت یان باوکیکی خەمخۆر، لیوردبوونەوەیەکی قوول ئەوە نیشان دەدات کە: لەکاتیکدا کە ئەم کەسانە بە شیوەیەکی ئاگایانە لەو باوەرەدان کە بە شیوەیەکی تایبەت کەیفیان بە مندالەکانیان یان میردەکانیان دیت، لە راستیدا دوژمنکارییەکی کپکراوی قوول هەیە بۆ ئەو شتانەی یان ئەو بابەتانەی کە لایان جیگەی بایەخ و گرنگپیدانە. ئەوان بی سنوور پەرۆشن لەبەرئەوەی دەبیت قەرەبووی نەك تەنها نەبوونی کەیفهاتن بکەنەوە، بەلکو قەرەبووی دوژمنکارییەکی راستەقینەش.

گرفتی خۆپەرستی هیشتا لایەنیکی دیکەشی هەیە. ئایا قوربانیدان بە خودی خۆت دەربرینیکی توندی ناخۆپەرستی نییە، وە لە لایەکی تریشەوە کەسیك کە خۆی خۆش دەویت دەتوانیت ئەو قوربانییە مەزنە ئەنجام بدات؟ وەلامی ئەم پرسیارە بە گشتی پشت بە جۆری ئەو قوربانییەی کە مەبەستە دەبەستیت. یەك قوربانی هەیە، هەروەك چۆن کە ئەم مەسەلەیە بە شیوەیەکی تایبەت لەم چەند سالەی دواییدا لە لایەن فەلسەفەی فاشییەوە جەختی لەسەر کرابووەوە. تاك دەبی ئاوات بۆ شتیك نەخوازیت کە لە دەرەوەی خودی خۆی بیت وەکو سەرۆك، یان پیشبرکییەك. تاك خۆی بە هیچ دەزانیت و پیی وایە بە ئەنجامدانی کردەوەی

خۆلەناوبەرانە لە پیناو هیزی بەرزتردا، پیناسەی خۆی دەدۆزیتەوە. لەم چەمکەدا قوربانیدان بە خود بۆ شتیك یان کەسیکی گەورەتر لە خود، خۆی لە خۆیدا بریتییە لە باشترین و گەورەترین دەسکەوت. ئەگەر خۆشەویستی بۆ خودی خۆت هەروەها بۆ کەسیکی تر مانای جەختکردنەوەی بنەرەتی و ریز بگەیەنیت، ئەوا ئەم چەمکە لە دژایەتییەکی توندایە لەگەل چەمکی خۆشویستنی خوددا. بەلام جۆریکی تری قوربانی هەیە: ئەگەر پیویست بیت کە کەسیك گیانی خۆی ببەخشیت لە پیناو پاریزگاریکردن لە ئایدیایەك کە بۆتە بەشیك لە ژیانی یان لە ژیانی کەسیکی خۆشەویستی، ئەوا قوربانی لەم حالەتەدا بریتییە لە توندترین دەربرینی خودسەلماندن. بیگومان ئەمە سەلماندنی فیزیکیانەی ئەو کەسە ناگەیەنیت، بەلکو سەلماندنی خودە بە مانای جەوهەری کەسیتی ئەو کەسە. لەم حالەتەدا قوربانیدان بریتی نییە لە ئامانج، بەلکو ئەو نرخەیە کە دەبیت لە پیناو هینانەدی و سەلماندنی خودی ئەو کەسەدا بدریت. لە کاتیکدا کە لە حالەتی دووەمیاندا قوربانیدان لە خۆسەلماندنەوە سەرچاوەی گرتووە، بەلام لەو حالەتەدا کە پیی دەوتریت قوربانی ماسۆشی، قوربانیدان لە نەبوونی خۆشویستنی خود و ریزگرتنی خودەوە سەرچاوەی گرتووە و ئەمەش بە شیوەیەکی بنەرەتی قوربانییەکی نەهلیستییە.

گرفتی خۆپەرستی لە بواری چارەسەرکردنی دەروونیدا پیگەیەکی تایبەتی هەیە. کەسی نیوروتیکی (عوسابی) زۆربەی جار خۆپەرستە بەو مانایەی کە ئەو لە پەیوەندی لەگەل ئەوانی دیدا چەقیوە و زۆر دوودلە دەربارەی خۆی. ئەمە دەبیت چاوەروانکراو بیت چونکە نیوروتیك بوون واتە تیکەلبوونی خودیکی بەهیز بە سەرکەوتوویی بەدەست نەهاتووە. ئاساییبوون مانای ئەوە نییە کە وابیت. واتە بۆ زۆرینەی تاکە باش پەروەردەکراوەکان کە لە تەمەنیکی گەنجیدا خۆیان دۆراندووە و بە تەواوەتی بە بەخشینی خودیکی کۆمەلایەتی لە لایەن کۆمەلگاوە جیگەی گیراوەتەوە. ئەوان ململانیی نیورۆتیکیان نییە چونکە جیاوازی و ناکۆکی نیوان کۆیلەکانیان و جیهانی دەرەوەیان نەماوە. زۆرجار کەسی عوسابی بە شیوەیەکی تایبەت خۆپەرست نییە، هۆکارەکەشی لە بنەرەتدا هەر هەمان هۆکاری خۆپەرستییە. ئەو شتەی کە ئەو کەسە بە شیوەیەکی پراکتیکی تیای نییە بریتییە لە خۆشویستنی خود. خۆشویستنی خود ئەو شتەیە کە پیویستە بۆ ئەوەی تەندروست بیت. کە کەسی عوسابی باشتر دەبیت، ئەوا مانای ئەوە نییە کە ئاساییە واتە خۆی لەگەل پیوەرە کۆمەلایەتییەکاندا گونجاندووە. تیۆریك وەك ئەوەی فرۆید دەربارەی نەرجسییەت کە کەلتووری بیزراندنی خۆشویستنی خود بە عەقلانی دەکات کاریگەری ویرانکەری دەبیت. ئەو تیۆرە تابوو لەسەر خۆشویستنی خود زیاد دەکات. کاریگەری ئەم تیۆرە تەنها کاتیك ئەتوانریت پیی بوتریت پۆزەتیڤ ئەگەر مەبەستی چارەسەری دەروونی بۆ یارمەتیدانی تاك بۆ ئەوە نەبیت کە خۆی بدۆزیتەوە بەلکو بۆ وازهینان لە جەنگین بیت لە

پینـاو خـودی خـۆی و گونجـاندن لەگـەڵ شـیوەی کلتــووردا بــە شــیوەیەکی ئاشــتیانە و بــە پیــی ژاوەژاوی عوساب.

لــەم چاخــەماندا ئــارەزووی کردنــی تــاك بــە ئــەتۆمیکی بیــهیز لــە زیادبووندایــە. سیســتمە ســەرکوتکەرەکان ئــارەزووی کورتکردنــەوەی تــاك دەکــەن بــۆ ئــامیریکی بــی ئــیرادە و بــێ هەســتی دەستی ئەوانەی کە دەبنە دەسەڵاتدار. کاتیك کە تــــاك ســــەرکوت دەکریــــت و وەك ئــــامراز بەکاردەهینریت، ئیتر لە کۆتاییدا هەست دەکات کە زۆر لاوازە و نــاتوانیت بــە تــەنیا هــەلبکات. پروپاگــەندەی دەســـەڵاتداری ئــەو گفتوگۆیـــە بــەکاردەهینیت کــە گوایــە تــاك لــە دەولەتــە دیموکراســییەکاندا خۆپەرســتە و دەبیــت ئــەم خۆپەرســت نــەبیت و لــە رووی کۆمەڵایەتییــەوە بەبایـەخ بیت. ئەمە درۆیەکـەو هیچـی تـر. نـازیزم درندانـەترین خۆپەرستی بیرۆکراسـی پیشـەنگ و دەولــەتی خۆپەرســتی گــۆری بــوو بــۆ پیــاوی تیکرایـی. ئارەزووەکـانی خۆپەرستی بریتییـە لـە چــەکیك بــۆ ئامــادەکردنی تــاکی تیکرایــی بــۆ ملکـەچکردن و ریسـوابوون. رەخنــەی کۆمــەلگای دیموکراسـی نـابیت پیـی وابیـت کـە خـەلك زۆر خۆپەرستن. ئەمە راستە بەڵام ئاکامی شتیکی ترە. ئەوەی دیموکراسی نـەیتوانیوە پیشی بکـەویت بۆ ئەوەیە کە تاك وا لیبکات خۆی خۆش بوویت، واتە هەستیکی قوولـی خۆسـەلماندنی هـەبیت. نـەریتی ئینکاری لە خود کردنی ناو کەشکۆلی پیوریتان – پرۆتســتانت، پیویسـتی ملکـەچپیکردنی تـاك بـۆ داواکارییــەکانی بەرهــەم و ســـوود بــارودۆخیك دەخولقینیــت کـــە فاشـــیزم دەتوانیــت لیـــوەی هــەلبقولیت. ئامـادەبوون بـۆ ملکـەچکردن، خـراپ بەکارهینانی بویـری کە لە لایـەن وینـای جـەنگ و خۆلەناوبردنــەوە کــە تەنـــها لەســـەر بنـــەرەتی بیـــهیواکردنی نائاگاییيانــەوە بنیـــادنراوە، ئـــەم مەیلانەی لەناو گۆرانییە مارشییەکان و قیژاندن بۆ فروهــەردا نوقــم بــووە. ئــەو تاکــەی کــە لــە خۆشویستنی خۆی وەستاوە، ئامادەیە بمریـت و هەروەها بشکوژیت. گرفتی کلتووری ئیمـە، ئەگـەر نەشـبیتە کلتوریکـی فاشـی، کلتووریـك نییـە کـە خۆپەرستی زۆری تیـابیت، بـەلکو کلتووریکـە کـە خۆشویسـتنی خـودی تیـا نییـە. ئامـانج دەبیـت دروستکردن و رەخساندنی ئەو هەلومەرجانە بیت کـەوا لـە تـاك بکـات بتوانیـت سەربەسـتی خـۆی بەدەست بهینیت. سەربەستی تەنها لە شیوازیکی رەسمیدا نا، بەلکو بە دەستەبەرکردنی سەرتاپای کەسـیتی لـە چۆنیتییـە کلتـووری، ســۆزداری و سیکسییەکانیدا. ئەم سەربەستییە بریتـی نییە لە بەشیك لە کەسیتی بەسـەر بەشـیکی تردا، ویـژدان بەسەر سروشتدا، (بەرزەمن) بەسەر (من)دا– بەلکو تیکەلبوونی هەموو کەسیتییە و دەربرینـی راستی ئــامیزی هــەموو ئەگــەرەکانی ئــەم کەســیتییە تیکەلەیە.

**سەرچاوە**

*www.erichfromm.do*

# ناسیۆنالیزم

• د.موسا ئیبراهیم
▪ لە عەرەبییەوە: شوان ئەحمەد

ئـــەو رووداو و گۆڕانکارییـــە کتوپڕانـــەی لەجیـــهانی ئـــەمڕۆدا روودەدەن، جـــارێکی‌تر مەســـەلەی ناســـیۆنالیزمیان هێنایـــەوە ریـــزی پێشەوە، ئەمـەش تەنـها تایبـەت نییـە بـەوڵاتێکی دیاریکراو یـان ناوچەیـەکی تایبـەت، بـەڵکو بۆتـە مەســـەلەیەکی گشـتی و سەرتاســـەری، هۆکـــاری نەتەوایـــەتی بـــەگرنگترین ئـــەو هۆکارانـــە ئـەژماردەکرێت کەدەســـتی لـەزووتر لێکـترازانی یـەکێتی سۆڤیەت و چیکۆسـلۆڤاکیادا هـەبوو، وەك چۆن هەرەشـەش لەپارچـە پارچـەکردنی زۆر لـەو وڵاتانە دەکات کە فرە نەتەوەن.

ئـەوەتا ئـەورووپا گەڕانـەوەی پارتـە راسـتڕەوە توندڕەوەکـان بەخۆیـەوە دەبینێـت کەهـــەموویان داوای دەرکردنی کرێکارە بیانییەکان و گێڕانـەوەی وڵاتـەکانیان دەکـەن بـۆ سـەردەمانی سـەروەری و شـکۆمەندیان لـەڕابردوودا، بەتایبـــەتی لـــەڕووی هـێزی سـەربازییەوە، نموونـەی ئەمانـەش وەك: بزوتنـەوەی فاشـیزم و نازیزمـە نوێیـەکانی نـاو ئیتاڵیاو ئـەڵمانیاو حزبەکـەی (جـان مـاری لۆپـن) لەفەرەنسا کـەتوانی لـەدوا هـەڵبژاردنی پەرلـەمانی ئـــەو وڵاتـــەدا *12*٪ی دەنگـــەکان (مەبەســـتی هەڵبژاردنەکانی *1993*)یـە، بـۆ راسـتە توندڕەوەکـان بەدەست بێنێت.[1]

ئـەم بزوتنەوانـە تەنـها لـەو کاتانـەدا دەبنـە هەڕەشەیەکی فیعلی کەگۆڕانکاری یاخود قـەیرانی گـــەورە روودەبـــدات، هـــەروەها لەهەڵبژاردنـــە پەرلەمانییەکەی رۆسیا لـەکانوونی یەکـەمی ساڵی *1993* ناسیۆنالیســـتە توندڕەوەکـــانی ئـــەو وڵاتـــە بەسـەرکردایەتی (فلادیمـێر جیرنۆڤسـکی) کەسـەر بەپارتی لیبرال دیموکراتی (راسـتی توندڕەوەن)، توانیـــان لـــە*24*٪ی ریـــژەی دەنگـــەکان بـــۆ خۆیـــان مسۆگەربکەن.[2]

سەركەوتنی ئەم حزبە لەو هەڵبژاردنە پەرلەمانییەی روسیادا بووە مایەی ترس و نیگەرانی ژمارەیەك لەولاتان، بەتایبەتی كە (جێرنۆڤسكی) هەڕەشەی ئاراستەی چەند دەوڵەتێكی جیهان كرد، لەڕیزی پێشەوەشیاندا ئەڵمانیاو یابان.

هەروەها داوای دەست بەسەراگرتنەوەی هەموو ئەو دەوڵەتانەی دەكردەوە كەلەیەكێتی سۆڤیەتی جاران جیابووبوونەوە، (جێرنۆڤسكی) هەر بەوەندەشەوە نەوەستاو داوایكرد ئالاسكاو ئێران و توركیاو ئەفغانستان و پۆڵەنداو فینلەندا بخرێنەسەر ولاتەكەی و هەڕەشەی بەكارهێنانی چەكی ئەتۆمی و هەلایسانی شەڕێكی خوێناویشی كرد.

هەموو ئەو گۆڕانكاریانە ناچارمان دەكەن بەوەی بكەوینە تاوتوێكردنی مەسەلەی ناسیۆنالیزم، لەڕووی ماهیەت و پەرەسەندن و ئاسۆكانی و دامەزرێنەرانییەوە.

باسكردنی ئەم بابەتە وردو بەرفراوانە لەسەرەتای سەدەی نۆزدەوە تاڕۆژگاری ئەمڕۆمان، فكری سیاسی بەخۆیەوە سەرقاڵكردووە، چەمكی ناسیۆنالیزم مانایەكی هەمەلایەنی هەیەو لێكۆڵیارو زانیایان بەدەستنیشانكردنی خەسڵەت و سنوورەكانییەوە ماندووبوونێكی زۆریان كێشاوە.

ئەگەرچی ئەوانە هەولێكی زۆریان بەخەرجداوە، بەلام تاهەنووكەش نەگەیشتوونەتە ئەوەی پێناسەیەكی تەواو گشتگیری بۆ بدۆزنەوە، لەم بارەیە بیریارێكی وەك (بۆید شیڤەر) دەڵێت: "گەر ناسیۆنالیزم لەسادەترین ماناكانیدا بریتیی بێت لەبوونی ئینتما بۆ گروپ، ئەوا ئەمە نامانگەیەنێتە مانایەكی روون و ئاشكرای وا كەخواستی لێكۆڵیارەكان تێربكات".[3]


هیگل

(شیڤەر) پێیوایە كەچەمكی ناسیۆنالیزم لەئەسڵدا لاتینییەو دەگەڕێتەوە بۆ تێرمی (*Nascar*) كەبەمانای (من لەدایكبووم) دێت و لەمەشەوە هەریەك لەچەمكی نەتەوەو نەتەوایەتی و ئایدیای ناسیۆنالیزمی لێكەوتەوە.

ماناكانی چەمكی ناسیۆنالیزم لەنەتەوەیەكەوە بۆ نەتەوەیەكی‌تر دەگۆڕێت، ئەویش بەپێی جیاوازی هەلومەرج و رووداو و جیاوازی ژینگە جوگرافییەكان، بەلام وەكی دیاردەیەكی كۆمەلایەتی و سیاسی كاریگەری قووڵی هەیەو تائێستاش هەموو دنیای گرتۆتەوەو هەروەك مسیۆ (سنایدەر)یش دەڵێت: "لەسەردەمی نوێدا ناسیۆنالیزم هێزی گەورەو بزوێنەری سەرەكی رووداوە مێژووییەكانە"، یاخود وەكی (هـ.كۆن) دەڵێت: "میللەتان ئەو كاتە پێ دەنێنە ناو مەدەنییەتەوە كەبەگیانی ناسیۆنالیزم چەكدارین و خۆیان بەو ئایدیایە تەیاركردبێت".[4]

چەمكی ناسیۆنالیزم چەمكێكی نوێیەو هەستی نەتەوایەتیش كەواتای بوونی ئینتمایە بۆ نەتەوەیەك، تەنیا لەكۆتایی سەدەی هەژدەهەمداو

لەسەروبەندی شۆڕشی فەرەنسیدا نەبێت لەئەوروپای خۆرئاوادا نەبوو بەبزوتنەوەیەکی میللی و لەماوەی نیوەی یەکەمی سەدەمی بیستەمیشدا بوو بەهەست و خولیایەکی گەورەو بەهێز.[5]

لەسەدەی هەژدەدا هەندێك نووسەر پێیان وابوو (رەگەز—*race*) هۆکارێکی سەرەکی نەتەوەییەو (فردریك شلیگل) پێی لەسەر ئەم بۆچوونە دادەگرت، ئەو پێی وابوو کەتەواوی ئەندامانی نەتەوە یەك تاکەکەس دروستدەکەن، بۆئەوەی ئەمەش بەئاکام بگات ئەوا پێویستە هەموویان لەیەك بنەچەوە هاتبن و یەك رەچەڵەکیان هەبێت، (ئەدۆڵف هتلەر) و شوێنکەوتوانی ئەم ئایدیایەیان قۆستەوەو پێیان وابوو بنەمای نەتەوەی ئەڵمانی لەسەر رەگەز دروستدەبێت.

زۆرێك لەو بیریارانەی باس لەمەسەلەی ناسیۆنالیزم دەکەن، هاوڕان لەسەرئەوەی زمانی هاوبەش بەهێزترین هۆکاری دروستبوونی نەتەوەیە. هەرچەندە زمان هۆکارێکی گرنگە، بەڵام لەهەموو حاڵەتێکدا هۆکاری یەکلاییکەرەوە نییە، بۆ نموونە ئەوەتا بەلجیکاییەکان بەدوو زمان و سویسراییەکانیش بەچوار زمان قسەدەکەن.

تەشەنەسەندنی هەستی نەتەوایەتی دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای بەرپابوونی شۆڕشی فەرەنسی، چونکە نەتەوەکانی دیکەی ئەوروپا هەڵوێستێکی سلبیان لەبەرامبەر مەرامە پانخوازییەکانی (ناپلیۆن)دا هەبوو، پاشان ئەم هەڵوێستەیان گۆڕا بەنارەزایی دەربڕین و دواتر بووە رکوکینە، هەرەشەو مەترسیی فەرەنسییەکان بووە مایەی ئەوەی بەریتانییەکان لەناوخۆیاندا یەك بگرن و لەبەرامبەر فشاری شۆڕشی فەرەنسیدا زیاترو زۆرتر بەنیشتمانەکەیانەوە پەیوەست بن.

لەسەروبەندی هێرش و پەلامارەکانی (ناپلیۆن)دا (شلیگل) روودەکاتە هاوولاتیانی ئەڵمانیاو پێیان دەڵێت: (هەتاکەی ستامکارێکی وەك ناپلیۆن سەر کوتتان بکات، ئەی ئەڵمانییەکان خۆتان لەو سەرشۆڕییە قوتاربکەن و لەپێناو شەرەفی ئەڵمانیادا دەستبەکاربن)[6]، ئیتر تەواوی نووسەرانی ئەوروپا دەستیان دایە هاندانی خەڵك بۆ بەگژاچوونەوەی دووژمنکارییەکانی فەرەنسا، ئەم کارەشیان بەوە دەکرد کەهەستی نەتەوایەتیان تێدا بەئاگابهێنن. پاش ئەوە گیانی نەتەوایەتی بەشێوەیەکی بەرفراوان تەواوی ئەوروپای گرتەوەو لەگرنگترین خەسڵەتەکانیشی سرودە نەتەوەییەکان و ئاڵای نیشستمانی و ستایشکردنی بنەماڵەی پادشا فەرمانڕەواکان بوو.

لەگەڵ هاتنی سەدەی نۆزدەدا ئایدیای ناسیۆنالیزم دەستی بەفۆرمەڵەبوونکردو بنەماکانی ناسیۆنالیزمی نوێش لەهەردوو سەدەی نۆزدەو بیستدا دارێژران، نەتەوە بووە ئەو چوارچێوەی کەتاکەکەس و تەواوی چینەکانی لەخۆیدا کۆدەکردەوە، لەبەرئەوەی هەموو چینێك پێی وابوو کەناتوانێت داکۆکی لەبەرژەوەندییەکانی خۆی بکات تەنها لەرێی نەتەوەوە نەبێت.

ناسیۆنالیزم لەسەدەی بیستەمدا زۆربەی زۆری بوارەکانی ژیان و بەها ئینسانییەکانی گرتەوەو لەئاکامی ژمارەیەك جەنگ و شۆڕشەوە،

چەند دەوڵەتێکی نەتەوەی لەباکورو ناوەڕاستو خۆرهەڵاتی ئەوروپادا هاتنەئارا، لەم پرۆسەیەشدا (کافورو پسمارك) رۆڵێکی بەرچاویان بینی.

هەستی نەتەوایەتی بەمانای خواستو ئارەزووکردن بۆ یەکخستنی خاكو گەل، بووە حاڵەتێکی باوی سەدەی بیستەم، ئەم خواستو ئارەزووەش بەئاکام گەیشت، کارێك کەبووەمایەی بەهێزبوونی دەوڵەتی نەتەوەیی و گەشەکردنی کلتووری نەتەوایەتی و سەرەنجامیش بووەبەهۆی ورووژاندنی هەستی نەتەوایەتی و دروستبوونی کێشەو ململانێ لەنێوان نەتەوەکاندا.

بەو پێیەی نەتەوایەتی خەسڵەتی تایبەتی دایە یەکێتی و یەکگرتوویی و تایبەتمەندی، بۆیە بووە مایەی سەرهەڵدانی شەڕانگێزی، نەتەوایەتی ئامانجی ئەوەبوو سەرجەمی کاروچالاکییەکان لەچوارچێوەیەکی نەتەوەییدا کۆبکاتەوە، هەروەها دەیویست دەوڵەتی نەتەوە والێبکات کەتوانای هەموو شتێکی هەبێت و کاریشی بۆ ئەوە دەکرد تا یەکەیەکەی هاووڵاتیان والێبکات بەوپەڕەی دڵسۆزییەوە کار لەپێناو ئەودا بکەن.

کارکردن لەکۆمەڵگەی نوێی پیشەسازیدا وەك ئەوەی (مارکس و ئنگلز) پێشبینیان دەکرد نەبووە مایەی ئەوەی کرێکار دەستبەرداری هەستی نەتەوایەتی بێت، بەڵکو زۆرجاران تەواوی چین و توێژەکان لەپشتیوانیکردنی سەرکێشییە نەتەوەیی و کۆلۆنیالییەکاندا دەستیان هەبووەو بەشداربوون.

*ناسیۆنالیزم ئومێدبوون بەئایندەی بۆ تاکەکەس دەستبەرکرد، وەك چۆن هەستی پەیوەندی بەگروپ و شانازیکردن بەخۆیەوە بۆ فەراهەمکردو کەوتە ئامادەکردنی ئەو ئامێرو ئامرازانەشی کەمەترسی لێدووردەخەنەوەو ناهێڵێن هیچ دەست درێژییەکی بکرێتەسەر.*



ناپلیون

ئیتر ئەوەبوو لەئەمریکا و ئەوروپا ئەو رێکخراوانە روو لەزیادبوون بوون کەئامانجی نەتەوایەتیان هەبوو، ئەمانە زۆریان بۆ حکومەتەکانیان دەهێنا تابودجەی تایبەتی بۆ کەرتی سەربازی تەرخانبکەن و هەروەها داواشیان دەکرد کەکرێکارو مامۆستایانی بیانی لەوڵات دەربکرێن و لەناوەندەکانی خوێندنیشدا بەتەنیا زمانی نیشتمانی بخوێنرێت.

کێشە کۆمەڵایەتی و ئابووری و کلتوورییەکان بەڕادەیەك زۆرو ئاڵۆز بووە، بەتەنها دامەزراوەیەك دەتوانێت چارەسەریان بکات کەهێزو توانایەکی زۆری هەبێت و تەواوی ئەندامانی کۆمەڵگەیشی گوێڕایەڵی بن، بۆ ئەمەش دەوڵەتی نەتەوە دروستبوو کەکارو چالاکییە یاسایی و کردەییەکانی لەسەر خواستی تەواوی چین و توێژەکانی کۆمەڵگە پەرەپێداو فراوانتر کرد، بەمجۆرە هەموو شتەکان کەوتنە دەستی

حکومەتەوەو بەڕادەیەکی زۆر پرەنسیپە سەرەکییەکانی ئازادی فەرامۆشکرا، بەتایبەتی لەماوەی هەردوو جەنگی جیهانیدا.

ناسیۆنالیزم وەکی هەر ئایدۆلۆژیایەکیتر، ناتوانێت بەتەواوەتی خۆی بسەپێنێ و بۆ هەمیشەیی بمێنێتەوە، لەبەرئەوەی بەپێی هەلومەرج و بارودۆخ و ئەو گۆڕانکارییانەی روودەدات رەنگە هەیمەنە پەیدابکات و رەنگە پاشەکشە بکات و ئاوابێت، یان لەوانەیە هەندێکجار بەهێزبێت و هەندێکجاری دیکەش بێهێزو لاواز بێت، (تەنانەت لەناویەك میللەتدا ناسیۆنالیزم نابێتە دیاردەیەکی گشتی، ئەگەرچی لەساتەوەختی شەڕو نەهامەتییەکانیدا تۆختر دەبێتەوە، بەڵام کەسی ئاسایی ئەوەندەی بەکارە تایبەتییەکانی خۆیەوە خەریکە ئەوەندە گرنگی بەنەتەوەکەی نادات و هیچ بایەخێکیش بەو شتانە نادات کەنەتەوەپەرستە توندڕەوەکان باسی دەکەن).(7)

پەیوەندی چینە کۆمەڵایەتییەکان بەنەتەوەوە لەسەردەمی ئەمڕۆماندا، وەکی سەدەی پێشوو روون و ئاشکرانییە، توێژینەوەی زانستی وردو تاوتوێکردنی بەڵگە مێژووییەکان و مۆدێلە سیاسییە جۆراوجۆرەکان، بەشێوەیەکی حاشاهەڵنەگر ئەوە دەسەلمێنن کەپەیوەندی لەنێوان ناسیۆنالیزم و سەرمایەداریدا پەیوەندییەکی پێویست یان حەتمی نییەو لەڕاستیشدا ناسیۆنالیزم هاوشانی سەرجەم قۆناغە ئابوورییەکان بووەو بەبۆچوون و ئاراستەگەلێکی سیاسی وەهاوە پەیوەست بووە، جیاواز لەوەی چینی وردە بۆرژوا هەڵگری بووە.(8)

بەڵگەش بۆ ئەمە ئەوەیە کەهەندێ کرێکاری نەتەوەپەرستی توندڕەو لەو وڵاتانەی لەڕووی ئابوورییەوە پێشکەوتوون، داوای سەپاندنی تاریفەیەکی گومرگی بەرزدەکەن بەسەر ئەو شمەکانەی لەدەرەوە دێتە وڵاتەکەیان، هەروەها داوادەکەن رێگەنەدرێت بەکرێکاری بیانی بچنە وڵاتەکەیانەوەو کاربکەنەسەر دابەزینی ئاستی کرێی کارو ئیشکردنیان.

هەرچی پەیوەندی بەوڵاتە دواکەوتووو تازەپێگەیشتووەکانیشەوە هەیە، ئەوا ناسیۆنالیزم لەو شوێنانەدا نوێنەرایەتی هیچ چینێك لەچینەکانی کۆمەڵگە ناکات، بەڵکو ئەوانەی تەبەنی ئەو ئایدۆلۆژیایە دەکەن بیریاران و ئەفسەرانی سوپاو بیرۆکراسییەکانن و مەبەستیشیان رزگاربوونە لەدەست ئیستعمارو هەیمەنەو دەسەڵاتی داگیرکاران.

سەبارەت بەخەسڵەتی ناسیۆنالیزمی هاوچەرخ و داهاتووی ناسیۆنالیزم، ناکرێن بڕیارێکی تەواو یەکلاییکەرەوە بدرێت، کەسیش نکۆڵی لەوە ناکات کەناسیۆنالیزم بەشێوەیەکی مێژوویی پەرەی سەندووە، واتە ناسیۆنالیزم هەر بەتەنها پەیوەندییەکی بایەلۆژی نییەو بەردەوامیش یەك رووی نەبووە، بەڵکو پێدەچێت لەئایندەدا وەرگۆڕێت و ببێتە جۆرە ئایدۆلۆژیایەکیتر یاخود رەنگە لەشتێکی تازەی چاوەڕواننەکراودا بتوێتەوەو رەنگ و رووی نەمێنێت.

ناسیۆنالیزم خەسڵەتێکی دینامیکی هەیەو وەکی سەرجەم دیاردە ئینسانییەکانیتر چەندین ئاسۆو دەرکەوتەی هەیە.

پێکهاتەی ناسیۆنالیزم لەگۆڕانی بەردەوامدایەو لەگەڵ کات و رۆژگاردا دەجولێت، بەم پێیەش پێویستە وەسفە زانستییەکانی بەتێپەڕبوونی کات و سەردەم بگۆڕێت و گۆڕانی بەسەردابێت.[9]


رۆسۆ

ئەگەرچی لەنێوان رەگەزو جۆراوجۆرەکاندا جیاوازییەك هەیە، بەڵام بوونی ئەم جیاوازییە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو هەلانەی لەناوەندێکی کلتووری و بەرەوپێشچوونی مێژووییدا بۆیان هەڵکەوتووە، بەردەوامیش رەگەزەکان تێکەڵ بەیەکتری بوون، بەڕادەیەك هیچ رەگەزێك وەك خۆی و بەپاك و بێگەردی نەماوەتەوەو هەر هەوڵێکیش بۆ پۆلێنکردنی نەتەوەکان بەپێی خەسڵەتە بایەلۆژی و خەسڵەتە ئەقڵییە بۆماوەکان کارێکی هەڵەیە، لەبەرئەوەی تیزێکی لەمجۆرەو بۆچوونی مێژوونووسانی سەردەمی رابردووەو لەوانەوە پێمانگەیشتووە، کەئەڵبەتە مەبەستسیان پڕوپاگەندەکردن بووە بۆ رەگەزێکی تایبەت و هاوکات قەناعەتێکی لەو جۆرەش لەڕەگەزپەرستی خاڵی نەبووە.

لەسەدەی نۆزدەهەمداو لەو کۆمەڵگەیانەی پێشتر لەسەر ئاستی نەتەوەیی یەکیانگرتبوو، نموونەکانی وەك (فەرەنساو بەریتانیا)، فکری سیاسی بەرەو ئەوە دەچوو تاتەعبیر لەکێشەو گرفتەکانیان بکات لەچوارچێوەی نیشتمانەکەیاندا، بەڵام لەو کۆمەڵگەیانەی دیکەی کەپارچە پارچەبوون و یەکێتی نەتەوەییان بەخۆیانەوە نەبینی بوو وەك (ئەڵمانیا)، ئەوا فکری سیاسی لەو شوێنانەدا بەکێشەگەلێکی ترەوە سەرقاڵ بوو.

مەسەلەی دابەشبوونی کۆمەڵگەی ئەڵمانی بەسەر چەند هەرێم و ناوچەیەکدا بیریارانی ئەو وڵاتەی بەخۆیە خەریککردبوو، ئەو بیریارانە یەکبوونی گەلی ئەڵمانیان (کەئاری نەژادە) بەکارێکی پێویست دەزانی، هاوکات سەرکەوتنی شۆڕشی فەرەنسی و تەشەنەسەندنی بیروباوەڕەکانی و پاشان ئەو شەڕانەی دروست بوون و وایکرد دەسەڵاتە لۆکاڵییەکانی ئەڵمانیا تەسلیم بەسوپای فەرەنسییەکان بن، هەموو ئەمانە دەستیان لەبێدارکردنەوەی هەستی نەتەوایەتی لەناو ئەڵمانەکاندا هەبوو. هەروەها بووەمایەی دەوڵەمەندکردنی فکری سیاسی کەئەڵمانەکان فەلسەفەی نەتەوایەتی تیۆریای سیاسی دیکەیان سەربار خست و کاریگەری گەورەشی لەتەواوی کیشوەری ئەوروپادا هەبوو.

یەکگرتنی نەتەوەیی ئەڵمانیا لەچوارچێوەی دەوڵەتێکی نیشتمانی یەکگرتوودا، ئامانجێك بوو کەدەوڵەتی والێکرد ببێتە بابەتێکی پیرۆزو باشترین کەسێکیش تەعبیر لەم واقیعەی ئەڵمانیا کردبێت (هیگڵ)ی فەیلەسوف بوو کەدەوڵەتی پیرۆزکرد، بۆئەوەی پاساو بۆ مەبەستەکەی خۆی بێنێتەوەو یەکێتی نەتەوەیی ئەڵمانیا بەدیبهێنێت. وەك راستییەك دەبێت ئەوە بزانین کە(هیگڵ) وەك (فێختە) لەلایەنگرانی نەتەوایەتی نەبوو، تەنانەت فەلسەفەکەشی دوورونزیك بەشێوەیەکی گشتی لەگەڵ بیروباوەڕە سەرەکییەکانی نەتەوایەتیدا ناگونجێت. ئەو بۆخۆی وەکی (ف.هرتز) دەڵێت:

بەخواستە نەتەوایەتییەکانی سەردەمی خۆی نامۆبوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بیروبۆچوونەکانی دەستیان لەهێنانەئارای فەلسەفەیەکی سیاسیو کۆمەڵایەتییدا هەبوو کەجەوهەرێکی تایبەتی بەناسیۆنالیزمی ئەڵمانی بەخشیو ئەمەش پلەوپایەیەکی تایبەتی لەفیکری نەتەوایەتی ئەڵمانیادا پێبەخشی، بەڕادەیەك توانی پێش (کانت)و (فێختە) بکەوێتو ببێتە فەیلەسوفی رەسمی پروسیاو بزوتنەوەی یەکێتی خاکی ئەڵمانیا.

(هیگڵ) بەستایشکردنی رۆڵی دەوڵەتو شکۆ پێبەخشینو بەپیرۆز سەیرکردنی پەیامەکەی کەتارادەیەکی زۆر وەکی پەرچەکردارێك وەهابوو لەبەرامبەر ئەو ئاقارە لیبرالیزمە خۆرئاواییە باوەی دەیویست جڵەوی دەوڵەت بکاتو لەئاستی کەمبکاتەوە، توانی لەو کاتەوە کاریگەرییەکی روونو ئاشکرای لەسەر پێکهاتەی ئەقڵییەتی ئەڵمانیو فەلسەفەی سیاسی هەبێت.

هەندێك نووسەر وای بۆدەچن کەئەگەرچی ناسیۆنالیزمی ئەڵمانی یەکەمین تیۆرییای لە(فێختە)وە بەچنگکەوت، بەڵام (هیگڵ) تەنها لەو خاڵەدا نەوەستا کە(فێختە) بۆ دەوڵەتی نەتەوەی دیاریکرد بوو، بەڵکو لەبەر رۆشنایی میسالیەتێکی رەهادا ئەو مەسەلەیەی گەیاندە کۆتایی لۆژیکی خۆی.

فەلسەفەی دەوڵەتی نیشتمانیی پیرۆز کەلەناو کۆمەڵگە پەرت پەرتو دابەشکراوەکانی ئەوروپادا باوبوو، لەسەر جۆرە نەتەوایەتییەك دامەزراوە کەهاووڵاتی بەگروپی سیاسییەوە گرێدەدات بەرلەوەی ببەستێتەوە بەدەوڵەتەوە، ئەم فەلسەفەیە پێی وایە کەنەتەوە نوێنەرایەتی گروپی سیاسی دەکات، بەجۆرێك دەوڵەتیش لای خۆیەوە نوێنەرایەتی نەتەوە دەکاتو بەشێوەیەکی یاسایش تەعبیری لێدەکات.

ئەم فەلسەفەیە زۆر بەخێرایی گەشەی کردو تا وایلێهات بوو بەبناغەیەك بۆ تەواوی ئەو بزوتنەوە فاشیزمو نازیزمانەی لەنیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا سەریان هەڵداو هەتا ئەمڕۆش سەرچاوەیەکە بۆ سەرجەمی ئەو گروپو بزاوتە ناسیۆنالیستانەی لەسەرتاسەری جیهاندا درێژە بەکارو چالاکی خۆیان دەدەن.

## پەراوێز سەرچاوەکان

1-جریده (السفیر)، 1994/1/6، ص11.

-هەروەها بڕوانە: روجیة غارودی، الاصولیات المعاصرة (اسبابها ومظاهرها، تعریب: د.خلیل احمد خلیل، دار عام الفین، باریس، الطبعة الاولی، 1992، ص11.

2-جریده (السفیر)، 1993/12/29.

3-بوید شیفر: القومیة عرض وتحلیل، ترجمة د.جعفر حضباك وعدنان الحمیدی، دار مکتبة الحیاة، بیروت، ص17.

4-د.عبدالکریم احمد، القومیة والمذاهب السیاسیة، الهیئة المصریة العامة للتألیف والنشر، 1970، ص6.

5-بوید شیفر، سەرچاوەی پێشوو، ص19.

6-سەرچاوەی پێشوو، ص31.

7-سەرچاوەی پێشوو، ص39.

8-د.عبدالکریم احمد، سەرچاوەی پێشوو، ص7.

9-بوید شیفر، سەرچاوەی پێشوو، ص76.

## سەرچاوە

د.موسی ابراهیم، معالم الفکر السیاسي الحدیث والمعاصر، مؤسسة عزالدین للطباعة والنشر، بیروت، الطبعة الاولی، ص229-235.

# بێردیاییڤی بیرمەند

• جیۆرجی ڤیدوتۆڤ
▪ لە ئینگلیزییەوە: سەدرەدین عارف

ئەلیکساندەر، ئەلیکسەندرۆ مێچ بێردیاییڤ، فەیلەسووفی ئاینی ڕووسی، ڕۆژی *24* ئازاری *1948*، لە ماڵەکەیدا لە کلارما، نزیک پاریس، کۆچی دوایی کرد. کۆمەڵگای ڕووسی زۆر ئاگاداری ئەو کارانەی نەبوون کە بەرهەمی بیرێکی تیژ و ماندوونەناس بوون. ئەو کۆمەڵگایە ناکۆک بوون لەگەڵیدا و زۆرجار بە سەرسامی و بە توندییەوە دژی هێرشە سیاسییەکانی دەوەستان. ئەوانەی کە دەیانناسی و وەکو مرۆڤێك خۆشیان دەویست کەم بوون. بەڵام لە هەموو جیهاندا وەکو فەیلەسووفێکی ئاینی ناسراو بوو، لە ئەمریکا و


بێردیاییڤ

ئەورووپا بە گەرمییەوە ڕێزیان لێ دەگرت، تەنانەت زیاتر لە خەڵکانی ناو ڕووسیا و پەنابەرەکانی دەرەوەدا. ڕەنگە لەبەرئەوەش بێت چونکە بیردیاییڤ –فەیلەسووفی کەسایەتی و ئازادی و داهێنان– زیاتر پەیوەندیی ڕۆحی بە ڕۆژئاواوە هەبوو نەك بە ڕووسەکانەوە؛ بەڵام لە هەمان کاتدا، لە ناخیدا زۆر ڕەگەزی بەنرخی جیهانبینیی ڕووسی (لە ڕێی دۆستۆیڤسکی و خۆمیاکۆڤ و سلۆڤێوڤەوە)، هەڵگرتبوو، کە ئاشکرابوونی (*revelation*) نوێی بۆ ڕۆژئاوا دەردەخست. ڕۆژئاوا هەڵەی کرد کاتێك کە

بیردیاییڤی بە دەربڕی نموونەیی ئەرسۆدۆکسیی ڕووسی دانا -ئەم لە یەکنەگەیشتنە بەردەوامە تەنانەت خودی بیردیایێیڤیشی بێزار کرد. فەرامۆشکردنی ئەم بیرمەندە مەزنە تاوانێکی زۆر ناڕەوایە، بیرمەندێك کە نووسینەکانی نەخراونەتە ناو کتێبی قوتابخانە و نامەی ئەکادیمیاکانەوە، بەڵکو لاپەڕەی پڕ لە ژیان و لە زانیاریی قووڵی دەروونین کە ئاراستەی هەموو کەسێك کراون.

بیردیاییڤ بە گەرمی دەینووسی و زۆر جار لەگەڵ زۆر بەرەدا ناکۆك بوو، نە لە زێدەکاری (مبالغە) دەترسا و نە لە ناکۆك بوون. "درەوشانەوەی ڕۆحی بەبێ ئازارچەشتن نابێت"، لە دوا کتێبیدا دەنووسێت. ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ ئەم ناکۆکییانەدا زیاتر نەبوونی یەکێتی لە بیریدا دەردەخات. بەڵام، ئەم ڕایە بە تەواوی هەڵەیە. ئەم ناکۆکیانە تەنها لە سەرەوە، لە کاردانەوەکانیدا، کۆدەبنەوە، نەك لە باوەڕەکانیدا، چونکە بەوەفا بوو بۆ تێگەیشتنە بنەڕەتییەکانی خۆی، کە لە یەکەم کتێبە گرنگەکانیدا "فەلسەفەی ئازادی" (*1911*) و "واتای داهێنان" (*1916*)، ئاوێتەی جیهانبینییەکی میتافیزیکی کردبوو.

لە سەردەمی لاوێتیدا، بیردیاییڤ زۆر مامۆستای دوور لە یەك و جیاوازی هەبوو، لەناو "باوکە" ڕۆژئاواییەکانیدا ئەوەندە بەسە کە ناوی یاکوب بۆهمە و کانت و مارکس و نیچە ببەین. لەم کەسایەتییە نەگونجاوانەوە بیری لە پێکهاتەیەکی هەڵبژاردەی پێکهێنا کە تیایدا ناکۆکییەکان گونجێندران بەلام ڕەنگە بە دەستکارییەوە، پاشان لە بۆتەقەی ئەزموونی کەسیدا داڕێژرانە نێو جیهانبینییەکی نوێ و ڕەسەن. فەلسەفەی بیردیاییڤ دوژمنی هەموو جۆرە شێواز وەرگرتنێك (سیستەماتیزم) بوو، لە جەوهەر و دەربڕیندا، بە شێوەیەکی نائاسایی، بنەڕەتی بوو، بەلام هەڵقوڵاوی یەکێتیی ژیان و ئەزموونی ئاکاری بوو. ئێمە هەوڵ دەدەین کە جەخت لەسەر ئەم یەکێتییە بکەین لە چەند ئاڕاستەیەکی زۆر پتەو و جیاوازدا.

دەرککردنی سروشتیی بیردیاییڤ لە بارەی ژیانەوە ئەوە بوو کە هەستێکی بەربڵاوی خراپە (*evil*) دەسەڵاتی بەسەر جیهاندا گرتووە. لەم دەرککردنەدا، بیردیاییڤ نەك هەر لەسەر نەریتی دۆستۆیڤسکی (ئیڤان کرامازۆڤ) دەڕوات بەڵکو ڕۆشنبیرە شۆڕشگێڕە ڕووسەکانیش، کە لەگەڵیاندا زۆر نارێك بوو لە سەردەمی باوەڕی ئایدیالیستیدا (قۆناغی ڤێخی/ "لافیتەکان")، خەباتکردن دژی خراپە -کە هەڵوێستێکی جومێرانە و شۆڕشگێڕانەیە لە پەیوەندی لەگەڵ جیهاندا- بیردیاییڤ جیادەکاتەوە لە زۆر بیرمەندی بووژانەوەی ئەرسۆدۆکسیی ڕووسی. بناغەی سەرەکیی داهێنانەکەی لە ململانێکردن لەگەڵ جیهاندا بوو بە ناوی سروشتی مرۆڤ و کۆمەڵەوە، نەك سادەیی و بێفیزی لە بەرامبەریدا و قایلبوون بە جوانیی جیهان وەکو یەکێتییەکی گشتگیری خوایی (کە بناغەی "سۆفیگەرایی" ڕووسی بوو). بێردیاییڤ بەردەوام پێویستی بەوە هەبوو کە قێزی لە درۆیەك بێتەوە بۆئەوەی لێی بکۆڵێتەوە و ڕاستییەکەی دەربخات. بە ئاشکرا خۆی وەکو لایەنگری دوانەیی (دوالیزم) دەخستە ڕوو. یەکباوەڕی (*monism*) کە زۆربەی

فەیلەسووفەکان -بە تایبەتی ڕووسەکان- مەیلیان دەکرد، لای ئەو هەمیشە شتێکی نامۆ بوو. هەر ئەمەشە هۆی ئەوەی کە یەکسەر ئەفلاتۆنی ڕەت کردەوە و هەتا دوایی دڵسۆزی (کانت) بوو، سەرەڕای ئەو جیاوازییە سەرنجڕاکێشەی کە لە جۆری ڕۆحییاندا هەبوو. لە نێوان جیهانی ڕاستەقینە (شتەکان- لە خۆیاندا) و جیهانی ڕووکەشەکان دەبێت قوڵاییەکی بێبن (*abyss*) هەبێت بۆئەوەی بردیایێڤ باوەڕ بە سەرچاوەی خودایی جیهان بکات. جارێك کەوتە ژێر کاریگەریی فریودانێکی مانەوەییەوە (*Manichaean*) دەربارەی بوونی کردگارێکی خراپەکار. بەردەوامیش بوو لە لێکۆڵینەوەدا دەربارەی تووشبوونی گوناه *The Fall- into- sin*. ئەنجامەکانی گوناه زۆر کاری لێ دەکرد. ئەنجامەکانی لە سرووشتدا، نەك لەسەر مرۆڤ. بێردیاییڤ خراپەی سروشتی نەك بە تەنها لەو خەباتە سەختەی کە لە ئارادایە لە پێناو مانەوەدا و لە ئازارچەشتن و مردندا دەبینی، بەڵکو لە خودی حەقیقەتی پێویستی و نەبوونی ئازادی کە گەوهەری مەسەلەکە پێکدێنێت. مرۆڤ، کە شیاوی ئازادیی ڕۆحییە، فڕێ دراوەتەوە ناو ئەم جیهانە ئامێرییە بێهەستەوە کە مرۆڤ دەکات بە کۆیلە و لەناوی دەبات. لە دوا ساڵانی تەمەنیدا، پاش ئاشنابوونی بە فەلسەفەی بوونخوازی ئەڵمانی، بیردیاییڤ پەرەی دا بەم بینینە نەگەتیڤەی بۆ جیهان. خراپە لە خودی بە بابەتکردنی جیهاندایە، لەو شتەدایە کە وەکو هەڵبژاردەیەك لە شت یان بابەت خۆی دەردەخات. بەڵام ئەمە مۆتەکەیەکی بەدی خەوە پڕ گوناهەکەمانە. لە ڕاستیدا بە تەنها ڕاستییە خودییەکان هەن، واتا ڕۆحە ئازادەکان، ڕزگاربوون لە دەسەڵاتی جیهان و شتەکان بەهای ژیانی مرۆڤ پێکدەهێنێت.

بە هۆی ئەو هەستپێکردنە بەهێزەی کە هەیبوو دەربارەی بوونی بەدی (*evil*) لە جیهاندا، بێردیاییڤ نەیتوانی ماوەی هیچ جۆرە گەشبینییەك بدات لە لێکۆڵینەوەکانیدا دەربارەی دادپەروەریی خودایی (*theodicy*)، خودا فەرمانڕەوایەکی تاکسالاری (ئۆتۆکراتی) جیهانی نییە. خودی بیرۆکەکە، واتا دانانی خودا بە بەرپرس لە دروستکردنی بەدی، بیردیاییڤی ناچاری یاخیبوونێکی پرۆمسیوسی کرد. بە ناوی سۆز و دادپەروەرییەوە، وای بە چاك زانی کە ببێت بە بێباوەڕێکی سەرسەخت نەك باوەڕدارێك بە هێزێکی خودایی خاوەنی هەموو دەسەڵاتێك. بیردیاییڤ باوەڕی بە خودا هەیە. ئەو خودایەی کە جیهانی دروستکردووە واز لە دەسەڵاتە بێسنوورەکەی دەهێنێت لە پێناوی سەربەستیی دروستکراوەکانیدا -تەنانەت ئەگەر ئەم سەربەستییە زیانبەخشیش دەرچێت. خۆشەویستی خودا لەوەدایە کە خوداوەند بەشداری ئازاری ئەو مرۆڤانە بێت کە بەدکارانە سەربەستییەکانیان بە خراپی بەکارهێناوە. لە ڕێی سۆز و بەرجەستەبوونەوە (*incarnation*) خوداوەند وا دەکات کە خۆشەویستی لە وەڵامدانەوەی مرۆڤدا هەبێت. بەڵام خوداوەند بێدەسەڵات نییە. خودا لە ڕێی مرۆڤەوە لە جیهاندا کاردەکات. سرووشی پێ دەدات و میهرەبانیی خۆی بۆ

دەنـێرێت، بـەڵام ئـەم میهرەبانییـە ناسـەپێنرێت بەسەر مرۆڤدا.. مرۆڤ دەتوانێت شوێنی بكەوێت یان ڕەتی بكاتەوە. بەڵام بـەبێ ئـەم میهرەبانییـە، بەبێ خودا، مرۆڤ بێتوانا دەبێـت و كردارەكـانی بێئومێد دەبن. بیردیاییڤ زۆر جەختی لەسەر ئەم ڕاستییە دەكرد لە سـەردەمی لاوێتیـدا كـاتێك لـە دژی ڕۆشـنبیرە بێباوەڕەكـان خـەباتی دەكـرد. بیردیاییڤ باوەڕی بـە هاوكـاریی و هاوكۆششـیی خـودا و مـرۆڤ هـەبوو لـە یـەكگرتنێكی خـودا– مرۆڤدا، كە چەمكێك بوو لە ڤلادیمێر سۆلۆڤیۆڤەوە وەریگرتبوو. بیردیاییڤ باس لە مەملەكەتی خودا، وەكـو نموونەیـەكی تـەواو، دەكـات، بـەڵام ئـەم مەملەكەتە بە تەنها خوداوەند دروستی نەكردووە، بەڵكو مرۆڤیش لە دروستكردنیدا هەوڵی داوە. ئەم جۆرە فەلسەفە ئاینییەی بیردیاییڤ بە تەنها لەسەر فێركردن لە بارەی خوداوە دانەمەزراوە، بەڵكو لە بـارەی مرۆڤیشـەوە، واتـا، مرۆڤناسـییە (*anthropologic*) لـە بـیرێكی خوداناسـیدا (*theologic*).

گرنگیی ئاینیی مرۆڤ لەوەدایە كە سەرەڕای ڕووخـانی (دەركردنـی لـە بەهەشـت) هێشـتا هـەر سـەرچاوەی "وێنـەی ئەندێشـەیی خودایە" كـە لـە ڕۆحیدا ماوەتەوە، لە كەسایەتیدا، جەستە و گیانی (*soul*) نوقمـی جیـهانێكی ڕووخـاو دەبێـت و بـە كۆیلـەی دەكـات، بـەڵام ڕۆحـی (*Spirit*)، یـان كەسـایەتیی وەكـو هـەڵگری ئـازادی دەمێنێتـەوە. بیردیاییڤ بـە چـاوی سـووكەوە سـەیری جەسـتە ناكـات وەكـو ئەفلاتوونییـەكان -كـە لایـان وابـوو جەستە ئەندامێكە بۆئەوەی گیان بۆ دەرەوە خۆی دەربخـات. ئـەوەی بیردیـاییڤ لـە سۆفیسـتە هاوچەرخـەكان جیادەكاتـەوە ئەوەیـە كـە ئـەم بایەخی زۆر بە ڕۆحی مرۆڤ دەدات. چوار چەمكی بنچینـەیی، كە لـە چـەند لایـەنێكی جیـاوازی یـەك بیرۆكـەدا ئاوێتـە ببـوون، دەستنیشـانی بابـەتی ئاینی بیردیاییڤ دەكەن: كەسایەتی، ڕۆح، ئازادی و داهێنـان. بێـهۆ نییـە كـە هـەندێك لـە كتێبـە گرنگـەكانی ئـەم ناونیشـانانەیان هەیـە: "واتـای داهێنـان"، "فەلسـەفەی ڕۆحی ئازاد"، "دەربـارەی چارەنووسی مرۆڤ".

كەسایەتی (*personality*)، لە هزری بیردیاییڤدا بە تـەواوی جیاوازە لە تاكێتی (*individuality*) كـە بریتییـە لە تێكـەڵبوونی هەڵەشـەی ئەدگارەكان لـە خـەیاڵی خـوددا. تـاكێتی دەگـەڕێتـەوە بـۆ دنیـای سروشـتی و بەشـداره لەگـەڵیدا لـە كۆیلەیـەتی و مردنـدا. بیردیـاییڤ دوژمنـی تاكێتییـە، دوژمنـی بنیاتنانی جیهانە بـەپێی پێوەرە بۆرجوازییـەكان، لەبەرئەوە حەز دەكات فەلسـەفەكەی بە فەلسـەفەی كەسێتی وەسف بكات -ئەم زاراوەیە– كە لەوانەیە لـە بنچینـەدا ئـەڵمانی بێـت - لـەژێر كاریگـەریی بیردیـاییڤ و شـاگردەكانیدا گوێزرایـەوە بـۆ فەرەنسا. لە زمانی ئینگلیزیدا ڕەوتەكەی، بە هۆی هـەندێك كێشـەی سـەرەكییەوە، تەگـەرەی هاتـە پێش.

كەسـایەتیی داهێنـەر و ئـازاد سـەرچاوەی یاسـای ڕۆحییـە لـە مرۆڤـدا لەبەرئـەوەی پێناسەكردنی ڕۆح (*Spirit*) ئاسان نەبوو، هەر ئەو پێناسـەیەی بـەكارهێنا كـە لـە قوتابخانـەكاندا بەكاردەهات، كە ڕۆح لە بەرامبەر (لە دژی) گیـان

(*soul*) دادەنرا. بیردیاییڤ پێناسەی ڕۆح ناکات. ئەو ڕۆح وەکو بەشێکی جیاواز لە مرۆڤی گیانلەبەر دادەنێت وەکو سەرچاوەی ئازادی لە دنیای پێویستیدا، بەڵام ڕۆح سنووردار ناکات بە دەرکەتنەکانی لە ژیانی ئاینیدا. زانست، هونەر، پەیوەندییەکانی مرۆڤ –ئەمانە هەموویان گۆڕەپانی رووحانییەتن. لە کوێدا ڕۆح هەبێت، لەوێدا ئازادی هەیە. بەڵام لە مەملەکەتی خودادا بە تەنها ئازادی فەرمانڕەوایی دەکات. ئەم ئازادییە لە ژیانی ڕۆژانەماندا، ناوبەناو، بواری چەند چرکەیەکی درەوشانەوە و دەربازبوون لە جیهانی سروشتی دەدات. مرۆڤ، لە خەباتیدا دژی کۆیلەیەتی سروشتی، خودای هەیە وەکو ڕابەر و هاندەر. ئازادی مرۆڤیش لە پەیوەندی لەگەڵ خودادا دەپارێزرێت. بیردیاییڤ ئاشکرابوون (*Revelation*) وەکو ڕێگایەك دادەنێت کە بە ئازادی هەڵبژێردرابێت، نەك وەکو دەسەلاتێکی دەرەکی، ڕێگایەك کە لەگەڵ ئەزموون و پێویستییە باڵاکانی کەسایەتیدا بگونجێت. بیردیاییڤ بێت بە کۆیلەی خودا و هەموو جۆرە خوداپەرستییەکی کۆیلانەی بە نامۆ و قێزەوەند دادەنا.

بیردیاییڤ تیۆرێکی ڕەسەن دەکاتە بناغەی میتافیزیکیی ئەم ئازادییە کە لە (یاکۆب بۆهمە)وە وەری گرتووە کە سۆفییەکی ئەڵمانیی سەدەکانی شانزە و حەڤدە بوو. بەپێی بۆهمە، لە لایەن هەبوونزانییەوە (ئۆنتۆلۆجییە) شتێك هەیە کە لە هەموو شتێك سەرەتاترە (*Primordiol*) کە بریتییە لە قووڵاییەکی بێبن *(Ungrund) abyss*. لە ناوەوەی ئەم قووڵاییەدا هەموو ئەگەرێك هەیە، کە وەکو مادده (*matter*) لای ئەرستۆییەکانە. ئەم شتە، بە ڕای بیردیاییڤ، ئازادییەکی پەتییە. بە واتایەکی دیکە، خوداوەند ئازادیی دروست نەکردووە، بەڵکو خۆی لەم ئازادییەوە هاتووە نەك لە سیستەمی کاتدا، لەم ئازادییەوە، لەم شتەوە کە هەموو شتێك دەگرێتە خۆی خوداوەند جیهانی دروست کردووە. لەوێوە، هەتا دروستکردنی جیهان و مرۆڤ، ئازادی هەبووە. ئەم ئازادییەش هەر بۆ چاکە (*good*) نەبووە، بەڵکو بۆ خراپەش (*evil*). ئەم بیرۆکەیەی (بۆهمە) خزمەتێکی دیکەی بیردیاییڤی کرد: ئەویش ڕاڤەکردنی هەبوونی خراپە لە جیهاندا، واتا ئەگەری دادپەروەریی خودایی (*theodicy*) هێنایە ئاراوە. هەروەها دەستنیشانی ئازادی مرۆڤ دەکات، نەك هەر لە پەیوەندی لەگەڵ جیهاندا، بەڵکو لەگەڵ خوداشدا. بەڵام، ئەم جۆرە بیرۆکەیە لەبارەی ئازادییەوە دژوارییەکە کە دەبێت بیگونجێنین لەگەڵ هزری مەسیحیدا کە خوداوەند وەکو بوونێکی ڕەها دەبینێت. ئەم مەسەلەیە لە فەلسەفەی بیردیاییڤدا خاڵێکە کە بە ئاسانی ڕەخنەی لێ دەگیرێت.

چەمکێکی ڕەسەنی دیکەی بیردیاییڤ مەسەلەی داهێنانە (*creativity*). ئەم داهێنانە ئامانجی ژیانی مرۆڤە لەسەر زەوی–خوداوەندیش هەر بۆ ئەوەی دروستکردووە. تووشبوونی بە گوناه ئەو پەیامەی هەڵناوەشێنێتەوە، چونکە ئازادییەکەی دەپارێزێت. ئەگەر مەسیحییەت ئاینی ڕزگاربوون بێت، ئەم ڕزگاربوونە دەبێت لە ڕێی داهێنانەوە بێت، نەك لە ڕێی پاکبوونەوەی ڕەبەنی (*ascitic*) لە گوناه. بەڵام، هەندێك جار،

بیردیــــاییڤ داهێنـــــان لــــە دژی ڕزگـــاربوون و قەشـــەگەری، وەكـــو ڕێبـــازێكی دیكـــە لـــە ژیـــاندا دادەنێـت. نكوڵـی لـە پێویسـتیی زوهـد و ڕەبـەنی ناكات، وەكو ڕێگایـەك بـۆ زاڵبـوون بەسـەر خـۆدا، بەڵكو بەرەنگاریی زێد هەڵسەنگاندنی دەكات، كە لە هۆیەكەوە دەیكات بە ئامانجێك. تەنانەت مرۆڤی گوناهكـاریش دەشـێت داهێنـانی هـەبێت. گونـاه هـەموو داهێنـانێكی مـرۆڤ دەشـێوێنێت، بـەڵام بەهاكەی لانابات.

هـەموو ئـەو سیستەمانەی ئاكـار و جوانناسـی كـە لـە ئەفلاتۆنـەوە وەرگـیراون، واتـا سیسـتەمە ئایدیالیسـتەكان، چـەمكی داهێنـان لـە بینـین و دواكەوتنی (لاساییكردنەوەی) نموونـەی خودایـی یان بیرۆكەكان (ئایدیاكان) دەبینن، كە لە بنیـاتی جیـهانی دروسـتكراودا هـەن. ئایدیـالیزم وەكـو كاردانەوەیەك دژی ڕیالیزم هاتە ئاراوە -كە لاسایی سروشـت و ژیـان دەكاتـەوە- بـەڵام ئـەمیش داهێنانـەكانی مـرۆڤ سـنووردار دەكـات لـە لاساییكردنەوە، یان دووبارە بەرهەمهێنانەوەی ئەو شـتانەی كـە دراون یـان شـاراونەتەوە لـە دنیـای بیرۆكەكاندا. بێردیاییڤ دەیـەوێت جەخت لەسـەر ئەوە بكات كـە لـە داهێنـاندا ئەگـەری شـتی تـازە هەیـــە. خوداوەنـــد دەیـــەوێت مـــرۆڤ داهێنانەكــەی تــەواو بكــات، بــۆ ئەمـــەش بناغەیـەكی بـە مـرۆڤ بەخشـیوە (كـە ئـەویش وێنـەی خۆیـەتی). لەمەشـدا واتـای ئەزموونـە تراجیدییـەكان دەردەكـەوێت، كـە لـەو داهێنانـەدا مرۆڤ بوونی ئازادی خۆی بۆ خوداوەند ئاشـكرا دەكات.

گونـاه ڕێ لـە داهێنـان ناگرێت، بـەڵام نـاهێڵێت جێبەجێ بكرێت. ئەنجامی هەموو داهێنانێك كە لە جیهانێكی ڕووخاودا ئەنجام دەدرێت سەرنەكەوتن و نائومێدییـــە. لـــە ســـەرووی هـــەموو نائومێدییەكانەوە، بە ڕای بیردیاییڤ، بابەتیكردنی كردەی داهێنانـە، واتـا گۆڕینـی بـۆ بەرهـەمێك كـە پابەندی یاسای پێویستی بێت. كتێبێك، كەڤاڵێك و تەنانـەت سـیمفۆنیایەكیش خـۆڵاوی دەبێـت و لـەژێر قورسـایی بـاری دنیـادا نرخـی دادەبـەزێت: تەنها لە دوورەوە لەگەڵ ئەو وێنەی داهێنانـەی كە هەیـە دەربـارەی بـیر و ژیـانی تـەواو ئـازاددا دەگونجێن. تەنانەت ئەو شتانەش كە زۆرتر بابەتی كـراون، وەكـو ئـەو هەوڵـە نائازادانـەی كـە لـەو دەزگایانـــەدا دەیدەیـــن كـــە مـــرۆڤ خـــۆی دایمـەزراندوون، ئـاگری داهێنـان، وەكـو بـەردی گڕكانەكان، سارد دەبێتـەوە و دەبێتە كۆسپێك لـە بـەردەم داهێنـاندا. واتـا، بـەلای بیردیاییڤـەوە داهێنانەكـە گرنگـە نـەك ئەنجامەكـەی- نـەك "بەرهەمە" هونـەری یـان هزرییەكـەی. لەمەشـەوە ئاشـكرا دەبێـت كـە بیردیـاییڤ دوژمنـی مـەیلی شـێوازی نموونەییـە و دوژمنـی هـەموو جـۆرە كلاسیكییەتێكە. لەم "بیرۆكە ڕووسییەدا" پۆشكین نـاتوانێت جێگایـەك بـۆ خـۆی بدۆزێتـەوە. ئـەم گوێنەدانە بە شتی بێخـەوش و نموونـەیی ڕاڤـەی شێوازی بیردیاییڤ دەكات. وەكو دوژمنی هەموو جۆرە سیستەمێك و وەكو یەكێك كە باوەڕی نەبوو بە هەبوونی هیچ بیرێك بەبێ ناكۆكی، بیردیاییڤ هەوڵ دەدات ئازادیی تەواوی هەڵچوونەكانی و بیرە وروژاوەكـەی بپـارێزێت لـە نووسـینەكانیدا.

پێویست بەوەش ناکات کە خۆی نزم بکاتەوە بۆ سەلماندنی شتەکان. ئەو بە پەلە شتەکان دەگەیەنێتە دەربڕینێکی نوێ کە چەمکەکەی بە تەواوی ڕاڤە نەکراوە و تووڕی دەدات و دەیکات بە دەزوویەکەوە و، پاشان بۆی دەگەڕێتەوە. بێردیاییڤ وەستای دەربڕینی گونجاو و سەنجراکێشە بەڵام لەناو ڕەشنووسی ناڕێکدا نوقم دەبن. مرۆڤ هەست بە بەهرە پرشنگدارەکەی دەکات کە لە باخچەیەکی کۆنی ڕووسی دەچێت: جوان، بەڵام درك و گژوگیا داییپۆشیوە.

لەبەرئەوەی هەموو داهێنانێکی مرۆڤ سەرنەکەوتووە، بیردیاییڤ زاراوەیەك بۆ بڕوا بە ڕۆژی کۆتایی (قیامە) *escatology* دادەنێت. ئەمە، نیشانەی کۆتاییە، دوا تخووبە، بنەمای ئاکاریی دنیا و مرۆڤە. بەڵام، ئەمە کۆتایی نییە و سەرنەکەوتن دوا ئەنجام نییە. خوا داهێنەریی مرۆڤ دەپارێزێت و مرۆڤ لەودیوی سنووری مێژوودا دەبووژێنێتەوە لە مەملەکەتی خودادا. بیردیاییڤ بە ئاسانی دەخرێتە ڕیزی گێرەشێوێنە ڕووحییەکانەوە، بەڵام ئەمە هەڵەیە.

بە هۆی (شتێرنەر)ەوە گۆڕا. وەکو سوشیالیستێك و، بە یارمەتی (خۆمیاکۆف) هاتە سەر ئەو باوەڕەی کە کەسایەتی، بە خۆجیاکردنەوە لە "من"ێکی دیکە ناتوانێت لە خۆی بگات. تەنیایی کاول و نابووتی دەهێنێت. من خۆم لە تۆدا دەدۆزمەوە، نەك لە کاریگەریی دوانەی ڕۆمانتیکیدا، بەڵکو لە "ئێمە"شدا و لە کارلێکی زۆرینەی خەڵکدا. بیردیاییڤ چارەسەری ناکۆکیی نێوان تاك و کۆمەڵگا لە کاری کۆمەڵایەتی و خۆشەویستی و سۆزدا دەبینێت. لە هەمان کاتدا ئەو داوانە دەستنیشان دەکات کە هەڕەشە لە کەسایەتی دەکەن کاتێك کە دەچێتە بواری کۆمەڵایەتییەوە کە بریتین لە داوی بابەتیکردن *objectification* و پەروەردەی دەزگاکان و دانانی شێوە ساردوسڕەکان لە بری هەبوونی هاوبەشیی ڕاستەقینە. پێداگرتنی بیردیاییڤ لەسەر هاوبەشێتی بیردیاییڤی بەرەو بەرەنگاربوونەوە لەگەڵ کۆمەڵگادا برد. بەڕای ئەو، وشەی "کۆمەڵایەتی" واتای بیرۆکەیەکی خراپە (بەدی *evil*)ی تێدایە. بێجگە لەو هەموو گوناه و بەدییەی کە سەرباری ژیانی کۆمەڵایەتی بووە، خودی کەسایەتیی کۆمەڵایەتی، کە شتێکی بە گشتی بازارییە، کەسایەتییەکی بەدە. بەهێزترین گوناهەکاری خۆی لە دەوڵەتدا دەنوێنێت -هەر هەموویان، نەك بە تەنها زۆردارەکانیان. تەنانەت هاوسەریکردنیش گێلێتییەکی بێبایەخە کە خۆشەویستی دەکوژێنێتەوە. کەنیسەش، وەکو دەزگایەك، بابەتیکردنێکی کۆمەڵایەتییە، واتا شێواندنی کەنیسەیە کە دەبێت هاوبەشییەك بێت لە ڕۆح و خۆشەویستیدا. بیردیاییڤ، ئەگەرچی پابەندی ئەرکە مەسیحییەکانی بوو، بەڵام بەردەوام بەربەرەکانیی گوناهە مێژووییەکانی کەنیسەی دەکرد، بە هەمان شێوەی بەربەرەکانیکردنی گوناهەکانی دەوڵەت. حەزی دەکرد کە ئەم کارەی بە ئەرکێکی "پەیامبەری" ناوببات. بە خۆدوورخستنەوە لە هەموو جۆرە پیشەیەکی ئاینی و بە لکاندنی جۆرە ناوزڕانێك بە خودی ئاینزانییەوە، بیردیاییڤ ببووە خاوەن

وشیارییەکی بەرزی پەیامبەرانەی مەسیحی لەسەر وێنە و شێوازی ڕۆژنامەنووسە هاوچەرخەکان. لە هەموو ئەمانەشدا لە کارکردن بۆ کەنیسە هەر بەردەوام بوو.

بێردیاییڤ ڕازی بوو بە کۆمەڵایەتیبوون *sociality* و، بە درێژایی تەمەنی وەکو سوشیالیستێك مایەوە. بەڵام هیچ کاتێك مارکسییەکی تەواو نەبوو چونکە هەرگیز باوەڕی بە مەتریالیزم نەبوو. لەگەڵ مارکسیشدا بە تەواوی دانەبڕا. لە کاتی ئاوارەبووندا بەرەبەرە گەڕایەوە بۆ وانەکانی سەردەمی لاوێتی. لە مارکسدا، لە هەموو شتێك زیاتر، ڕەخنەی سیستەمی سەرمایەداریی بەرز دەنرخاند، کە بێبەزەییانە درۆ و دەمامکەکانی ئاشکرا دەکرد. ئەم مەیلە مرۆڤدۆستانەی بە خەباتێك دادەنا دژی کاری نامرۆڤانەی ئامێرەکان و ڕژێمی موڵکدارێتی و سەندنەوەی کەسایەتیی مرۆڤ *depersonalisation*. بڵاوکردنەوەی نووسینە سەرەتاییەکانی مارکس وای لێ نەکرد کە بە هزری مارکسدا بچێتەوە ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە مارکس بە مرۆڤدۆست دابنێت و بیری بچێتەوە کە چۆن مارکس بەشداربووە لە کەسایەتی نەهێشتن و بە ئامێرکردنی پرۆلیتاریا و بزووتنەوەی کرێکاری. بە باوەڕی بیردیاییڤ، سۆشیالیزم بنەمایەکی کەمی بەزەیی و خۆشەویستی دەردەبڕێت. ئەو دەربڕینە کەمەش خۆی شاردۆتەوە لە پشتی ئەو ناڕەزاییانەی کە دەری دەبڕێت بەرامبەر چەوساندنەوەی مرۆڤ. گرنگیی سۆشیالیزم لەوەدایە کە لە کۆمەڵگای بێ چینایەتیدا کەسایەتی مرۆڤ ڕزگار دەکات. ئەم سۆشیالیزمەی بێردیاییڤ پێشنیازی زاراوەی پێرسنالیزم (کەسایەتیخوازی) دەکات. بیردیاییڤ هەندێ جار پشتگیریی کۆمەڵگای هاوکاری، لە جۆری سۆشیالیزمەکەی برۆدۆن و لایەنگرەکانی، دەکات نەك سۆشیالیزمی دەوڵەتی مارکس و لایەنگرەکانی، چونکە کەسایەتیی مرۆڤ ئازادییەکی زیاتری هەیە. بەڵام، لەوانەیە بنەمایەکی بەهێزی کەسی دیکە هەبێت لە سۆشیالیزمەکەی بیردیاییڤدا، ئەویش ئەو قینە زۆرەی بوو لە چینی بورجوازی. ئەم قینەش بە زۆری ئاڕاستە نەکرابوو دژی چینی بورجوازی وەکو چینێکی دەسەڵاتدار لە کۆمەڵگای هاوچەرخدا، بەڵکو دژی بورجوازییەت وەکو تایپێکی دەروونی: "بورجوازی" بە واتا فەرەنسییەکەی: کە مرۆڤێکی چاوچنۆکی چێژخواز (*hedonist*) کە نە باوەڕی بە هیچ بەهایەکی ڕەسەن ماوە و نە بە هیچ لێشاوەییەك بۆ بەهای قارەمانێتی. ئەم هەڵوێستەی بیردیاییڤ بەرامبەر چینی بورجوازی پەیوەندیی بەو ئیرەییەی چینی پرۆلیتاریا نییە، بەڵکو زیاتر لە قێزلێکردنەوەی هونەرمەندی شێوەکار و بۆهیمییەکان دەچێت، تێکەڵ بە لووتبەرزیی چینە خانەدانەکان لە بەرامبەر دوکاندارەکان و تازەپێگەیشتووەکاندا کە جێگریانن و هیچ بەهانەیەکی ئاکاری بۆ بوونیان نییە. لەم سوشیالیزمەی بیردیاییڤ جۆرە خانەدانییەك هەیە، هەروەکو چۆن لە ئەنارکیزمەکەی تۆلستۆدا هەبوو. بیردیاییڤ بە ڕادەیەك پەرەی بە قینەکەی دژی چینی بورجوازی

دا کـە تەنانـەت نەیدەویسـت لـە ڕابـوردووی ئـەم چینــەدا هیــچ جــۆرە بەشــدارییەکی مێژوویــی ببینێت. بە بۆچوونی بێردیاییڤ چینی بورجوازی هیـچ پەیوەندییـەکی بـە ڕووداوە مێژووییەکانــەوە نییە، نە بە زانستی سەردەم، نە هونەری هۆڵەندی، نە ڕزگارکردنی کۆیلەکان لە سەدەکانی ناوەڕاستدا و هــەتا دەگاتــە شۆڕشــی فەرەنســی. بیردیــاییڤ کۆیلەیـــەتی ســـەدە کۆنـــەکان و ســـەدەکانی ناوەڕاستی لا باشتر بوو لـە ڕژێمـی سـەرمایەداری. ئاشــکرایە کــە هــەڵبژاردنی ئــەم هەڵوێســتەش پەیوەندیی بە بارودۆخی چینی کرێکاران و ڕادەی چەوساندنەوەیانەوە نەبوو.

هاوسـۆزییەکەی بیردیـاییڤ بـۆ سۆشــیالیزم چــەند جێگــیر بــوو، ئــەوەندەش لــە بەرامبــەردا بۆچوونە سیاسییەکانی شلۆق و شل بوون. شتێك لای ئەو لەوپەڕی گرنگیدا بوو ئەویش بەرگریکردن لە کەسایەتی مرۆڤ و ئازادییەکانی بوو کە لە هزر و هۆشیاری و وشەدا خۆیان دەنواند. لە بەرامبـەر شێوە سیاسـییەکاندا کەمتەرخـەم بـوو و زۆرجـار ڕای دەگۆڕی. ئەمـەش، تـا ڕادەیـەك، لـە ئـەنجامی ڤینـی لـە بنـەما ڕەسمییـەکاندا بـوو، لـە ژیـاندا بـە گشتی و لە بارەی یاسا و ژیـانی کۆمەڵایـەتی بـە تایبـەتی. لـە سـاڵانی پێداچوونـەوەی بۆچوونـە سیاسـییەکاندا (ساڵانی *1900–1910*) بێردیـاییڤ زۆر سادە و بێفیز بوو. قایل بوو بە شانشینێکی دەستووری و دانی بەوەدا نا کە دیموکراتییەت تا ڕادەیـەك لـە دەسـتە سیاسـییەکاندا (حزبـەکاندا) باشـتر دەردەکـەوێت. لەگـەڵ گۆڕانـی هـەندێك لـە خووەکانیدا، ڤینەکەشی لە دیموکراسی گـۆڕا بـە ڕەخنـەگرتن لێـی، بـە تایبـەتی لـەو سـاڵانەی کـە ڕووبـەڕووی کۆمـاری سـێیەمی فەرەنسـا بـووەوە. هــۆی ســەرەکیی ســاردیی بیردیــاییڤ، تەنانــەت ڤێزلێکردنەوەشــی، لــە دیموکراســییەتی ڕۆژئــاوا بونیـادە چینایەتییەکـەی بـوو: چینـی بورجوازیـی ڕزیو کە بێتامی و چەپەڵیی چێژ و هەڵبژاردنەکانی کۆمەڵگایەك بەڕێوە دەبات کە عـەودالی چەپـەڵترین خۆشییەکانن و بە بەها و واتـای ژیـانی دادەنێـن. دابەزین بۆ پێوەرەکانی مرۆڤی هاکەزایی لە بارەی بەهاکان زۆر ڤـێزەون بـوون لای بیردیـاییڤ و ئـەو ڕۆحــە خانەدانــەی کــە هــەیبوو. ئــەوەی کــە بــە تایبـەتی تووشـی خورپـەی دەروونـی (*Shocking*) دەکـرد، وەکــو فەیلەســووفێك، ئــەو ســووکردنە فەلسـەفییە تازەیـەی دیموکراسـییەت بـوو بـە نـاو ڕێژەگەراییـەوە. دیموکراسییەتی هاوچەرخ، پـاش وازهێنــان لــە ئایدیــالیزمی مەســیحی ســەردەمی لاوێتـی و عەقڵانییـەتی سـەردەمی پێگەیشـتن، بـە دوای بەهانــە دەگــەڕێت لەســەر بنــەمای حوکمــی زۆرینە لەناو ڕێژگەرایی هەموو ڕاستییەك و هەموو بەهایەکدا. بەڵام، ئەم جیهانبینییە فەرهەنگ لەناو دەبـات و کەسـایەتی مـرۆڤ نـاهێڵێت. کـەچی بــاوەڕی سیاســی گەردیلــەیی (*atomism*) کــە کەسـایەتیی جیاکردۆتـەوە لـە دیموکراسـییەکانی سـەردەمدا (ڕاسـتترە بڵێـین لـە سـەدەی *19*دا) و تانوپۆی ئاڵۆزی کۆمەڵگا کۆنەکانی تێکداوە، هیچ جـۆرە ناڕەزاییـەك نـاوروژێنێت لای بیردیـاییڤ، هەرچـەند کـە بـاوەڕی بـە کۆمـەڵگای نموونـەیی هــەبوو. لەگــەڵ ئەوەشــدا، ئــەو هــەموو بنــەما گونجاوانـــەی کـــە بیردیـــاییڤ هـــەیبوو بـــۆ

ڕەتکردنەوەی دیموکراسی چارەی ئەو سەفسەتەیەی نەکرد کە ڕۆژ بە ڕۆژ زیاد دەبوو لە مشتومڕەکانیدا. ئەم بنەمایەش فۆرمالیزمی دیموکراسییە. خۆی دەیگوت شێوەخوازی (فورمالیزم) واتا خەیاڵ. ئەمەش بەو مانایەیە کە ئازادی دەربڕین و ڕۆژنامەگەری، هتد، کە زۆر گرنگن بۆ فەیلەسووفێك، لەپڕ دەبن بە شتێکی پووچ و بێتام و مەسەلەیەك کە تەنها پەیوەندیی بە کۆمەلانی خەڵکەوە هەبێت.

لێرەدا بیردیاییڤ زمانی پێوەنان و زلکردنی سەرەتای بزووتنەوەی سۆشیالیزم هەڵدەبژێرێت کە نەگونجاوە و هی سەدساڵ لەوەوپێش بوو.



جۆزیف ستالین

بیردیاییڤ هەموو سەرکەوتنەکانی بزووتنەوەی کرێکاران و یەکێتییە بەهێزەکانی و کاریگەرییە سیاسییەکەی و تەنانەت ئەو تۆزە گەشەکردنەشی فەرامۆش دەکات. لای ئەو، پرۆلیتاریا هەر ئەو خەڵکە نەفام و برسییەیە کە هەتاهەتایە هەر وا دەمێنێتەوە و تەنانەت لە پێویستیی هەبوونی ئازادیش تێناگات. ئازادی بۆ ئەوان ئازادیی ئەو عەرەبانەچییە بەرەڵلایەی چیرۆکە بەناوبانگەکەی بڕۆدۆنە. تەنها بە دابڕانی تەواو لە چینی کرێکار دەشێت مرۆڤ ڕاڤەی ئەو گومڕاییەی فەلسەفە بکات.

لە دوو خاڵی گرنگ و کردەییدا بیردیاییڤ لە دیموکراسیی هاوچەرخ جیادەبێتەوە و ڕوودەکاتە فاشیزم، لە شێوە ڕووسییەکەی یان ڕۆژئاواییەکەی. یەکەمیان ڕەتکردنەوەی ڕەهای ئازادیی ئابوورییە. بێگومان، ڕاست دەکات کە سۆشیالیزم بەبێ تەسکردنەوەی ئازادی لە بواری ئابووریدا ناشێت. بەلام خۆی و چەند سۆشیالیستێکی هاوچەرخ -کە نەیاندەویست بە دوای تێکەڵکردنی بنەمای ئازادی کەسی و یاسای کۆمەلایەتی بکەون- یەکسەر بە ڕەوای دەبینێت کە دەوڵەت هەموو شتێك بێت. بەم کارەش جوتیارەکان و خاوەن پیشە بچووکەکان بێبەش دەکات لە هەموو جۆرە موڵکایەتییەك و لە وەرگرتنی بەشی خۆیان. دەوڵەت ناهێڵێت کەس خاوەنی چارەنووسی خۆی ببێت، تەنانەت پیشەوەرە "ئازادەکانیش". ئەوەی کە دەمێنێتەوە لە ئازادیی ڕۆحی دەدرێت بەو کەسایەتییە کەمانەی کە لەسەر دروستکردنی بەها ڕۆحییەکان دەژین -ئەوانن کە دورگەی ئازادی بنیات دەنێن بۆ بیرمەندان و شاعیران لە ئۆقیانووسی کۆیلایەتیی گەردوونیدا.

ئەگەر لە ڕەتکردنەوەی تەواوی ئازادیی ئابووریدا بیردیاییڤ لە کومیونزم نزیك بووبێتەوە، لە ڕێکخراوی دەستەیی دەوڵەتدا بنەماکانی سۆڤیەتی ڕۆژهەلات و فاشیزمی ڕۆژئاوایی لە یەك جیادەکاتەوە. لە پۆلێنکردنی "ڕەسمی" خەڵکیدا بە پێی ناوچە و حیزبەکاندا جیاوازی لە

ڕێكخستنیاندا دەردەخات لە ڕێكخراوە پیشەییەكاندا. بیردیاییڤ لای وایە كە پەیوەندیی نێوان كرێكاران لە پەیوەندیی ناوچەیی و حیزبی بەهێزترە. ئەمە لەوانەیە لە سەردەمی بووژانەوەی هەڵوێستی ئاكاری و داهێنەرانەی سەدەكانی ناوەڕاست لە بەرامبەر كار و هەروەها لە بەردەم هونەر و ئەركی مرۆڤدا ڕاست بووبێت. لە سیستەمی فەلسەفەی سوودگەیەنەری (*utilitarian*) سەردەمدا، بە تایبەتی لە پەیوەندیدا لەگەڵ ڕووخاندنی سیستەمی فرەحیزبیدا، ئەم سیستەمە هاوبەشییە (*corparate*) بناغەی زۆرداری دادەنێت. بەمجۆرە، بیردیاییڤ لە شێوەكانی سۆشیالیزمدا لە هەموو شتێك زیاتر قینی لە دەوڵەت بوو و لە هەموو بەرەكاندا لە بەردەمیدا پاشەكشەی دەكرد – بە هۆی ئەو دوژمنایەتییەی كە هەیبوو بەرامبەر تایپە ڕۆحییەكەی چینی بورجوازی.

هاوكات لەگەڵ ئەو ڕاراییەی كە هەیبوو لە هزری سیاسیدا، هەڵوێستی لە بەرامبەر بۆلشیفیزم لە ڕووسیادا گۆڕی. سەردەمانێك هەبوو (ساڵانی *1917–1922*) كە ڕق و كینەی لە بەرامبەر كۆمیونیستەكاندا بێسنوور بوو. خۆی لە وڵاتی شۆڕشی پرۆلیتاریا ژیابوو و خەڵكەكەی، نەك بیروباوەڕەكانی، بە چاوی خۆی دیبوو. تەنانەت ئەو سەردەمانەش بە هەندێك شت قایلبوو، وەكو ئاشناكردنی كۆمەڵانی خەڵك بە فەرهەنگ و تەنانەت ئەو سزایانەش *retribution* كە ڕەوا بوون. لە ڕاستیدا، بیردیاییڤ باوەڕی بەو بیرۆكەیەی دی مێستر (*de-maistre*) هەبوو كە دەیگوت: شۆڕش حوكمی خوداوەندە بەسەر میللەتاندا. لەم بیرۆكە مەسیحییەوە (كە نەبەستراوەتەوە بە هیچ بۆچوونێكی تایبەتیی ئەوەوە) بیردیاییڤ گەیشتە ئەو ئەنجامەی كە مرۆڤ ناشێت لە دژی حوكمی خودایی بوەستێت: هیچ جۆرە دژە شۆڕشێك سەرناكەوێت؛ شۆڕش تەنها لە ناوەوە دەبەزێت، لە پەرەسەندنی بەردەوامیدا. ئەمە بوو هۆی ئەو هەڵوێستە نێگەتیڤەی لە دژی بزووتنەوەی ڕووسە سپییەكان و زۆربەی پەنابەرە سیاسییەكان، لەوپەڕی باڵی ڕاستەوە تا دەگاتە ئەو سۆشیالیستانەی كە دژی بۆلشەفیكەكان دەجەنگان و هێزی بیانی و دوژمن سەیری دەكردن كە دەیانەوێت كۆیلەیەتی بەسەر ڕووسیادا بسەپێنن.

كاتێك كە خۆیشی ناچار كرا كە ئاوارە بێت (بێردئاییڤ لە یەكێتی سۆڤیەت دەركرا)، ناچار بوو كە لە دوو بەرەدا خەبات بكات: لە دژی سەرمایەداری و لە دژی كۆمۆنیزم، لە هەمان كاتدا. ئەمەش هەڵوێستێك بوو كە، وەكو فەیلەسووفێك و وەكو مەسیحییەك، شایانی ئەو بوو. یەكێك لە نامیلكەكانی كە بە ناونیشانی "ڕاستی و درۆكانی كۆمۆنیزم" بوو بە بەڵگە بۆ ئەم هەڵوێستە دوولایەنەیەی.

بەهەرحاڵ، لە كاتی شەڕی جیهانیی دووەمدا ئەم هاوسەنگییە گۆڕا بۆ بەرژەوەندیی ڕووسیا. بیردیاییڤ خۆی لەناو خرۆشانی ئەو سۆزە نیشتمانپەروەرییەدا بینییەوە كە ڕۆژ بە ڕۆژ لە نێو پەنابەرە ڕووسەكاندا لە پاریس پەرەی دەسەند. هەرچەند كە لەو وتارانەدا كە ئەو كاتە بڵاوی دەكردنەوە بیری سۆشیالیزم و دژایەتیكردنی

سەرمایەداری زاڵبوو، بەڵام بنەماکانی بیری نەتەوایەتی پێش سۆڤیەت نکوڵی لێ ناکرا. سۆڤیەت وەکو ڕزگارکەری جیهان لە فاشییەتی هیتلەر پێناسە دەکرا. ئەو لەیەکچوونەی کە لە نێوان هەردوو ڕژێمی تۆتالیتاریدا هەبوو فەرامۆش کرا. جۆرە باوەڕێك لە ئارادا بوو، بێ بناغەش نەبوو، کە حیزبی بۆلشەڤێك بەرەو گۆڕانێکی گەورە لە سیاسەتی ناوخۆییدا دەچێت. لەو کاتەدا بوو کە بیردیاییڤ دوا کتێبی نووسی بە ناونیشانی "بیرۆکەی ڕووسی" کە تیایدا بە شێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو بڕوایەکی سلاڤی دەربڕی دەربارەی پەیامی یەکتای ئاین و مێژووی ڕووسیا. دەمێك بوو لە خەباتێکی سەختدا بوو دژی بیری نەتەوایەتی و بە ژەهرێکی کوشندەی سەردەمی دادەنا. خۆی و فلادیمێر سۆلۆڤیۆف جەخت لەسەر ئەوە دەکەن کە پەیامێکی ئاینی جیهانی هەیە، بەڵام هەر میللەتە و بە شێوەیەکی جیاواز دەری دەبڕێت. بیردیاییڤ لەسەر ئەو باوەڕە ماوە، بەڵام لای وایە کە ڕووسیا شکۆمەندییەکی تایبەتی هەیە لەنێو دەوڵەتاندا بە هۆی ئەو هێز و جۆرە جیهانبینییە ئاینییەی کە هەیەتی. ئەو دەیگوت: "میللەتی ڕووسیا تایبەتمەندێتی ئاینی هەیە"، "بیری ئاکاریی مرۆڤی ڕووسی جیاوازە لە بیری ئاکاریی میللەتە خۆرئاواییەکان، بەوەی کە بیرێکی زیاتر مەسیحییە". بیری ڕووسی پەیوەندی زیاتری بە کۆمەڵانی خەڵکەوە هەیە چونکە "ڕێگە بەرەو ئۆرشەلیمی نوێ لە ڕووسیادا ئامادەکراوە. شۆڕشی سۆشیالیزم لە ڕووسیادا وێستگەیەکە لەسەر ئەم ڕێگایەدا".

زۆر لە ئاشنایان و قوتابیانی بیردیاییڤ بە تەواوی سەرسامبوون بەم لادانەی مامۆستاکەیان. ئەوەی بە تایبەتی بە لایانەوە سەیر بوو ئەوە بوو بیردیاییڤ، کە هەمیشە لە دژی ئەو تەوژمە سەپێنراوانەی کە دژی بوون ڕاوەستابوو، بگۆڕێت و بچێتە ناو ئەو زۆرینەیەی کە خەریکی تەوژمە هزرییە ڕۆژانەکان بوون. هەندێك دەیانگوت هۆیەکەی پیری و بێهێزبوونی ڕۆحییە. بەهەرحاڵ، سەرەڕای ڕووداوەکان، بیردیاییڤ جارێکی دیکە تووشی نائومێدی بوو لەو چاوەڕوانییانەی کە لە یەکێتی سۆڤیەتی دەکرد. خۆی پێشتر دەنگی ناڕەزایی هەڵبڕیبوو لە پێناو ئازادیی وشە، کە لە ڕووسیا پێشێل دەکرا. هاوڕێکانی لایان وابوو کە دڵگەرمییەکەی جارانی نەماوە. بیردیاییڤ نەیدەویست بە نووسین ناڕەزایی دژی یەکێتی سۆڤیەت دەرببڕێت بۆئەوەی بەڵگە نەداتە دەست ئەوانەی کە لایەنگری شەڕ بوون لە دژی سۆڤیەتدا، چونکە زۆر لە قەومانی شەڕ لە جیهاندا دەترسا.

لە کتێبی "هزری ڕووسیا"دا، کە باسی سیفەتە بێ هاوتاکەی ڕووسەکان دەکات زاراوەی باوەڕ بە ئاخرەت (حشر) *sechatology* بەکاردەهێنێت. ئەو پلانەی کە بۆکتێبەکەی دانابوو دەربارەی بیرمەندە ڕووسە نموونەییەکان جۆرە ناسروشتییەکی تێدایە، چونکە پوشکین و ئەو بیرمەندانەی کە لەسەر ترادسیۆنی مۆسکۆ بوون ناخاتە ناو کتێبەکەی. لە کتێبی "هزری ڕووسیا"دا باس لە بەرپابوونی شۆڕش و

سەردەمێکی زۆر پێش ڕووداوەکەی و گەردەلوولی کاولکاری و باوەڕ بە ئاخرەت، لە بیرۆکەیەکدا ڕاڤە دەکرێت کە واتاکەی مێژووی هەزار ساڵەی ڕووسیا پێکدەهێنێت، بەڵام هەڵبژاردنی بیرۆکەی ئەم ڕێبازە ڕووسییە گرنگیی بۆ خودی بیردیاییڤ هەبوو. ئەو خۆی یەکێك بوو کە لە هەموو بیرمەندە ئاینییە ڕووسەکان زیاتر باوەڕی بە ڕۆژی ئاخرەت هەبوو. وەکو زۆر لە هاوتەمەنەکانی، بیرۆکەی ڕۆژی ئاخرەتی مەسیحی گواستەوە بۆ مەزاجی شۆڕشگێری سەردەم. ئەم باوەڕەی بیردیاییڤ ڕەگوڕیشەیەکی ئاینی -سایکۆلۆجیی زۆر جیاوازی هەیە لەوەی مەسیحییەتی باستانی، بە تایبەتی مەسیحییەتی ئۆرتۆدۆکسی. ئەم پەرۆشییەی بۆ هەبوونی کۆتاییەك نە بە هۆی دوورکەوتنەوەی بوو لە مێژوو و نە بە هۆی ئاگاداربوونی لەوەی کە کردەی فەرهەنگیی مرۆڤ هیچیان نەبوو. قایلنەبوونی شۆڕشگێڕانەی بەو شتانەی کە هەن و پەرۆشیی دەربارەی هەندێك گۆڕانی بناغەیی لە جیهاندا پەرە دەدات بەم هەستەی. ئەم باوەڕەی بە ڕۆژی ئاخرەت ڕەتکردنەوەی مێژوو نییە، بەڵکو تەواوکەرییەتی.

بیردیاییڤ خۆی بە فەیلەسووفی مێژوو دادەنێت. هەڵوێستی لە بەرامبەر شێوە بنچینەییەکانی ڕووخانی جیهان -لە شوێن و کاتدا- وەکو یەك نین. دنیای شوێن، کە لە مادەدا خۆی دەنوێنێت مرۆڤ بە کۆیلە دەکات. دنیای کات، کە ئەگەرەکانی مێژوو پێکدەهێنێت، گۆڕەپانی داهێنانی دەستەجەمعیی مرۆڤە. ڕاستە کە بەشێکی توانای داهێنەرانەی مرۆڤ لە مێژوودا دێتە دی، بەڵام نوشستییەکان و تەنانەت مردنیشی وا لە مێژوو ناکات کە پڕوپووچ (*absurd*) بێت، بەڵکو، بە شێوەیەکی تراجیدییانە، ناتەواو. هەر شتێك کە هەیە دەبێت لە ئاگری کارەساتە کەسی و مێژووییەکاندا لەناو بچێت. بەڵام ئەو کۆتاییەی کە بیردیاییڤ بە پەرۆشە بۆی بە تەنها لەناوبردنی شتە کۆمەڵایەتییەکان نییە، بەڵکو بەدیهێنانی مەملەکەتی خودایە. حوکمدان و تاوانبارکردنی خراپە تەنها چرکەیەکی لاوەکییە لە سەرکەوتنی مەملەکەتی خودادا. بیردیاییڤ ئامادەبوو دان بە تیۆری ڕزگارکردنی مرۆڤ لە لایەن مەسیحەوە (*apo katatasis*) بنێت بە مەرجێك دژی بەها بنەڕەتییەکانی دەربارەی ئازادی نەبێت. دۆزەخ (*Hades*) سزادانی خوداییە، لە هەمان کاتیشدا مافی ئازادیی دروستکراوەکەیەتی. باوەڕی بیردیاییڤ بە ڕۆژی ئاخرەت بە تەواوی گەشبینە، سەرەڕای کارەساتەکەی. بێگومان، کارەساتەکە خۆی سەرچاوەی خۆشییە بۆ ڕۆحێکی شۆڕشگێڕ، وەکو شانۆگەرییەکی تراجیدی وایە بۆ نیچە.

بەهەرحاڵ، بینیمان چۆن جیهان لە دیدی ئەم باوەڕە گەردوونییەوە بە ڕۆژی ئاخرەت بەسەر هەموو داهێنانی مرۆڤدا دادێت و وا دەکات هیچ جۆرە سەرپاکییەکی (*perfection*) بەردەوام نەبێت.

لەگەڵ ئەوەشدا، لەسەر ڕووی مێژوو (واتا: باوەڕ بە ئاخرەت) دوا فریودان (*temptation*) چاوەڕوانی بیردیاییڤ دەکات. دەزانێت و حەز دەکات ئەوە دووبارە بکاتەوە، کە هەموو مێژوو بە کۆمەڵێك تاوانکاری (*transgression*) چنراوە. دوا

هاواری (خوا گەورەیە *Hosanna*) ناچاری دەکات ئەوەی لەیاد بچێت کە مێژوو مەیدانی ئازادی و خەباتە. چاکە و خراپە لە ڕێگەی پرۆسە دنیاییەکانەوە و لە ڕێگەی مرۆڤە لە تێکۆشاندان. لەم تێکۆشانەدا کەسایەتیی مرۆڤ زۆرجار دەبێتە قوربانیی هێزی کۆمەڵایەتیی پڕوپووچ. نەک بە تەنها سروشت ئەم کەسایەتییە دەشێلێت و لەناوی دەبات، بەڵکو مێژووش. خودا چاوەڕوانی دەکات کە بەرگریی هێزی خراپە بکات لە مێژوودا. فریودان لای بێردیاییڤ ئەوەیە کە دان بە عەقڵانییەتی مێژوو، وەکو یەک کۆمەڵە *en bloc*، بنێن و کەسایەتی مرۆڤ ناچار بکەین کە لە بەردەمیدا نووچ بدات. خودا لە مێژوودا دەدوێت، نەک بە تەنها لە زمانی پێغەمبەرەکانە کە کاری پاقژکردنەوە دەکەن، بەڵکو بە هۆی سەرکردە گوناهکارە کاتییەکانیشەوە. ئەمە فریودانێکی هیگڵی گەشبینە و زۆر کوشندەیە بۆ ڕۆشنبیرە ڕووسەکان، هەر لە (بێلینسکی)یەوە، هەتا دەگاتە مارکسییەکان و هەموو جۆرە "شۆڕشگێڕەکان".

باوەڕ بە یەکتایی (*Monism*) کە بێردیاییڤ وەکو فەیلەسووفێك خۆی لێ لادەدا، لە مەسەلەی مێژوودا خستیە داوەوە. لەبەرئەوەی نەیدەویست گوێڕایەڵی نە یاساکانی سروشت و نە هی مرۆڤ و تەنانەت یاساکانی خوداش بێت، بێردیاییڤ سەرو لووتە بەرزەکەی لەبەردەم مێژوودا شۆڕکرد لە یەکێك لە ناخۆشترین و قێزەوەندترین سەردەمەکانیدا، لەبەردەم شۆڕشی کۆمیونیزم.

با ئەم دوا گوناهەی وامان لێ نەکات کە نرخی ئەم ژیانە، ئەم ڕۆحە جوان و ڕەسەنە لەیاد بکەین. کات بە خێرایی چارەسەری برینە ڕامیارییەکان دەکات. چامەکەی بلۆك "دوانزە کەسەکە" نامانجوولێنێت کە ڕێزی شاعیری وەکو پوشکین بگرین کە خۆشەویستی هەموومان بوو. سەرەڕای کتێبی "ناو ڕزێنەکانی ڕووسیا"، نیکۆلای بێردیاییڤ، بەبێ هیچ گومانێك دەچێتە مێژووی ڕووسیاوە، وەکو نموونەی مرۆڤێکی زەحمەتکێشی ئاینپەروەر، کە بۆ یەکەم جار ئەو ئاڵۆزییە و دەوڵەمەندییەی ژانری ئاینی ڕووسیای بۆ ڕۆژئاوا ئاشکرا کرد.

**سەرچاوە**

*Novil Zhurnal. New York*

# ڕەخنەو لێکۆڵینەوە

| | |
|---|---|
| • لە نێوان فەلسەفەی هونەر و جوانناسیدا | د. زەکەریا ئیبراهیم |
| • ڕۆشنبیر و.. بازاڕی ڕۆشنبیریی لە مەغریب | د. محەمەد شەقرون |
| • تایبەتمەندییەکانی ڕۆمانی پۆست مۆدێرن | بهار رهادوست |

# لە نێوان فەلسەفەی هونەر و جوانناسیدا

# سۆریۆ/ بایێر

• د. زەکەریا ئیبراهیم
▪ لە عەرەبییەوە: شاهۆ سەعید



ئەوانەی کە سەرقاڵی لێکۆڵینەوەی فەلسەفین، زانستی جوانناسی (ئیستاتیکا) دەخەنە خانەی بابەتە پێوەرییەکان، واتە دەیخەنە پاڵ "زانستی لۆجیك" و "زانستی ئاکارناسی"، تاوەکو هەرسێ "زانستە پێوەرییەکان" پێکەوە گرێ بدەن کە دەربارەی (ڕاستی، خێر و جوانی) دەکۆڵنەوە. ئەندرێ لالاند *Andre Lalande* کارێکی لەم جۆرەی کرد کاتێ جیاوازی خستە نێوان زانستە پێزەتیڤیستەکان (العلوم الوضعية) کە لە فاکتەکان، واتە شتە واقیعیەکان دەکۆڵنەوە، زانستە پێوەرییەکان (العلوم المعيارية) کە لە بەهاکان دەکۆڵنەوە (واتە ئەو بەهایانەی پێوەرگەلێکن بۆ حوکمدان لەسەر ئەوەی دەبێ شتەکان چۆن بن؟ نەك شتەکان چۆنن؟). بەڵام پێڕەوانی پۆزەتیڤیزم دژی چەمکی (زانستە پێوەرییەکان)ن، چونکە ئەوان پێیان وایە ناکرێ زانست ببێتە پێوەری حوکمدان لەسەر بەها، بەڵکو تەنها گوزارشتێکە بۆ حوکمدان لەسەر

واقع. هەر بۆیە هەندێ لە فەیلەسوفەکان ناچار بوون چەمکی (زانستی پێوەری) هەموار بکەن و بیگۆڕن بە چەمکێکی تازە کە بریتییە لە (زانستی پێوەرەکان). زانستی پێوەرەکان یان زانستی بەهاکان لە ڕووی میتۆدەوە جیاوازیی لەگەڵ زانستی واقعدا نییە، بەڵکو تەنها لە ڕووی بابەتەوە لێی جیا دەبێتەوە. واتە لە زانستە پێوەرییەکاندا خودی پێوەر دەبێتە واقع، ئیدی ئەوە ئەرکی زانای بواری لۆجیك نییە کە یاساکانی بسەپێنێ بەسەر دەرەوەدا، بەڵکو ئەرکی کورت بۆتەوە بۆئەوەی لەو هەنگاوانە بکۆڵێتەوە کە زاناکان پێڕەوی دەکەن. بە هەمان شێوە ئیدی زانای جوانناس ناتوانێ ماف بدا بە خۆی ئاراستەی هونەرمەند بکا یان ئامۆژگاری بکا، یان ناچاری بکا چەند یاسایەکی دیاریکراو پێڕەو بکا، بەڵکو ئەرکەکەی تەنها ئەوەیە کە گوزارشتمان بۆ بکا کە لە واقعی جوانی، نەك بەو جۆرەی کە هونەرمەند لەگەڵیدا دەژی یان بینەر لێی ورد دەبێتەوە و پەی پێ دەبا، بەڵکو بەو جۆرەی کە شێوازە زانستییەکان ئاشکرای دەکەن، چونکە (جوانناس)یش زانایەکی بابەتییە و خاوەنی شێوازی کار و میتۆدی خۆیەتی. ڕەنگە فەیلەسووفێکی فەرەنسایی وەك باسچ *Basch* مەبەستێکی لەمجۆرەی هەبووبێ کاتێ دەیوت: "زانای جوانناس کەسێك نییە تەنها ڕابمێنێ و هەستەکانی بۆ ناسینی جوانی بەگەڕ بخا، هەروەها هونەرمەندێك نییە کە لە کارەکانیدا پەنا بۆ سروش -ئیلهام بەرێ، بەڵکو ئەو زانایەیە کە کار بۆ تێگەیشتنی دیاردەی جوانی و ڕوونکردنەوەی ئەو تێگەیشتنەی خۆی لە زەینی ئێمەدا دەکا".

بە ڕاستیش زانستی جوانناسی -هەروەك هەردوو زانستی لۆجیك و مۆراڵ (ژیربێژی و ئاکارناسی)- پشت ئەستوورە بە هەستێکی خۆڕسکی (حدسی *Intuitive*)، بە جۆرێك خود هەست دەکا ناچارە بەدوای جوانیدا بگەڕێ وەك چۆن بە دوای ڕاستی یان خێردا وێڵە، بەڵام هەر زانای جوانناسیشە کاتێ واقعی پێوەرەکان پۆلێن دەکا یان گوزارشتی لێدەکا و شی دەکاتەوە، تەنها پەنا بۆ هەستی ئیستاتیکی- جوانناسی نابا کە سروشتێکی حەدسی پێوەریی هەیە، بەڵکو پەنا بۆ کۆمەڵێك شێوازی ئەنجامخوازی و کۆمەڵێك میتۆدی ئەزموونگەریی دەبا (کە کەرەستەی لێکۆڵینەوەکەی پێکدێنێ) لە پێناو شیکردنەوەی واقعە ئیستاتیکییەکەدا، لێرەوە بەو پێیەی تەنها ئارەزوو بۆ گەیشتن بە حەقیقەت بەس نییە بۆ دامەزراندنی زانستێکی وەك فیزیا یان گەردونناسی یان بایۆلۆجیا، بە هەمان شێوە تەنها هەستکردن بە جوانی بەس نییە بۆئەوەی ئەو هەستە ببێتە بابەتی زانستی جوانناسی (یان ئیستاتیکا)[1]. هەرچەندە هەستکردن بە جوانی مەرجێکی پێویستی بایەخدانە بە لێکۆڵینەوەی ئیستاتیکی، بەڵام ئەو هەستکردنە تاقە مەرجی بنەڕەتیی دامەزراندنی زانستی ئیستاتیکا نییە. ڕاستە پێویستە زانای جوانناس خاوەنی هەستیارییەکی ناسك بێت بۆ ناسین و چێژوەرگرتن لە جوانی، بەڵام ئاشکرایە کە تەنها هەستکردن بە جوانی کەسێك ناکاتە زانای

جوانناس. لێرەوە دەکرێ لەگەڵ زانای جوانناسی فەرەنسی هاوچەرخ (سۆریۆ) بڵێین: ئەگەر جوانی مۆرکێکی تایبەت بێت بە ئیستاتیکا و ببێتە هۆی ژیاندنەوەی لێکۆڵینەوە ئیستاتیکیەکان، ئەوا ناکرێ (بڵێین) هەر جوانیشە بابەتی زانستێکی وەك ئیستاتیکایە(2).

بەڵام چەند زانایەکی جوانناسی وەك چارلس لالۆ *Charles Lalo* (*1877-1953*) سوورن لەسەر هێشتنەوەی چەمکی "بەهای جوانی"، بەڵام دوو زانای ئەڵمانی وەك ماکس دێسوار *Mat Dessoir* و ئی. ئوتیتس *E. Utitz* و زانایەکی فەرەنسی وەك ئیتین سۆریۆ *E. Souriou* چەمکی "بەهای جوانی"یان بە تەواوی لە لێکۆڵینەوەکانیان دوور خستۆتەوە. ئەوانەی سەر بە ئاراستەی یەکەمن پێیان وایە واقعیەتی ئیستاتیکی ڕاستەقینە بریتییە لەو "کارە هونەر"یەی کە لە هەناوی هەستپێکردنی ئیستاتیکی ئێمەدایە، بۆیە ناکرێ حوکمی خۆمان بەسەر کارێکی هونەریدا بە کەم بگرین، بەڵکو دەبێ بڵێین بابەتی ئیستاتیکا بریتییە لە "بەها"ی کاری هونەری، هیچ کارێك بەبێ هونەر بوونی نییە، یان (ڕاستتر) هیچ کارێك بەبێ بەها بوونی نییە. ئیدی هەروەك چۆن لەسەر دەستی کەسێکی وەك جۆبۆلت *Goblot* زانستی لۆجیك (المنطق) بووە لێکۆڵینەوە لە سایکۆلۆجیای زانا، لەسەر دەستی کەسێکی وەك لیڤی بریل-یش ئاکارناسی (مۆراڵ- الاخلاق) بووە لێکۆڵینەوەیەکی پۆزەتیڤیستی لە خووڕەوشت و نەریتەکان، ئەوا ئیستاتیکا-ش لەسەر دەستی یەکێکی وەك لالۆ بووەتە لێکۆڵینەوەیەکی زانستی لە دیاردە ئیستاتیکییەکان. بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە کە چەمکی "بەهای جوانی" وەلانێین، بەڵکو مانای ئەوەیە کە زانا جوانناسەکان لە پێوەرەکان دەکۆڵنەوە هەروەك چۆن سپینۆزا *Spinoza* لە هەڵچوون و ئارەزووەکان دەکۆڵێتەوە(3).

بەڵام پێڕەوانی ئاراستەی دووەم پێیان وایە یەکەمین هەنگاو لە هەنگاوەکانی زانست بڕیاردانە لەسەر "بابەتیبوون"ی ئەو دیاردەیەی کە لێکۆڵینەوەی لەسەر ئەنجام دەدا، واتە ئەوان بیرۆکەی "بەهای جوانی" لە بواری لێکۆڵینەوە ئیستاتیکییەکان دوور دەخەنەوە چونکە پێیان وایە ئەو بیرۆکەیە بیرۆکەیەکی لاوەکیی تایبەت بە خودە. سۆریۆ جگە لەوەی لەگەڵ هەریەك لە دێسوار و ئوتیتس دەڵێ کە پێویستە ئیستاتیکا لە هەموو جۆرە حوکمێکی مەزەندەیی پاك بکرێتەوە، ئەوەش دەڵێ کە زانستی ئیستاتیکا "زانستێکە دەربارەی شت". لێرەدا سۆریۆ هونەر و جوانناسی پێکەوە گرێ دەداو دەڵێ: ئیستاتیکا لێکۆڵینەوەیەکی بابەتییە پەیوەندیی بەو شتانەوە هەیە کە هونەر بەرهەمی دێنێ کاتێ "وێنەیەك" یان شوناس "ماهیەتێك" دەکا بە بەری مادەدا. سۆریۆ بایەخێکی گرنگ دەدا بە چەمکی "شت"، بڕیار دەدا خەسڵەتی جیاکەرەوەی هونەر بریتییە لەو چالاکییە داهێنەرانەیە کە بەر لە هەر شتێك خواستی خوڵقاندنی "شتەکان"ی هەیە. هەروەها ئەوەش دەڵێ کە چەمکی "شت" لەناو کاری هونەرمەندەکەدا هەیە، بەڵام بە شێوەیەکی هەستیاریی تیۆریی فەلسەفی نا، بەڵکو لە شێوەی

هەستکردن بە شتەکان. بەو پێیەی هەستکردن واتە هەستکردن بە شتەکان، ئیدی بیرۆکەی "شت" جیانابێتەوە لە پەیبردن لە ڕێگای هەستەوە. ئەگەر ئێمە چەمکی "شت" شی بکەینەوە دەردەکەوێ کە دوو توخمی سەرەکی لە پێکهاتەکەیدا هەن: توخمی وێنەیی یان ئەو ماهیەتە هەستییەی کە پەیوەندییان بە هەستپێکردنی شتەکەوە هەیە، لەگەڵ توخمی مادی کە بریتییە لەو پێداویستییە ڕێکوپێکانەی کە شتە هەستپێکراوەکە بەرهەم دێنن.

ئەم جیاکردنەوەیە کە سۆریۆ لە نێوان "وێنە و مادە"دا دایدەمەزرێنێ جیاکارییەکی ناوەکییە لە کرۆکی ئەزموونندا، واتە پەیوەندیی بەو جیاکارییە میتافیزیکییە ئایدیاڵەوە نییە کە "ئەمانوێل کانت" لە فەلسەفە ڕەخنەییەکەیدا دایمەزراند کاتێ وێنەی کردە ئاستێکی بەرایی بەر لە (قۆناغی) ئەزموون.

سۆریۆ جیاوازییەك ناخاتە نێوان "وێنە" و "مادە"، بەڵکو پێی وایە "وێنە" چۆنایەتییەکی ناوەکییە لەناو خودی شتەکەدا، بە جۆرێك دەشێ بڵێین "وێنە" خودی ئەو "شت"ەیە کە بریتییە لە بابەت، نەك درێژبوونەوەیەکی پەتی. لێرەوە زانای جوانناس وێنە بەتاڵەکە پشتگوێ دەخا و مادە پەتییەکە ناسەلمێنێ، بەڵکو هەمیشە ئەو بڕیارە دەدا کە مادە لە وێنە جیانابێتەوە و سیفەتی جیهانیش بریتییە لە سیستم و پڕاوپڕی. وێنەکان چەند نیشانە و چەند هێمایەك نین بەڵکو چەند واقعێکی پڕ و خاوەن ژیانی سەربەخۆن. ناوەڕۆکی بنەڕەتیی وێنە "ناوەڕۆکێکی ڕووکەشییە"، بەو مانایەی وێنە تەنها پۆشاکێکی دەرەکی یان بەرگێکی لاوەکی نییە کە بکرێ بە بەری بابەتێکی نامۆدا، بەڵکو بریتییە لە "فۆرم"ێکی جەوهەری کە شتەکە پەنای بۆ دەبا، هەر ئەو فۆرمەشە سروشت و ماهیەتی شتەکە دیاری دەکا. ئەرکی زانستی جوانناسی شتێك نییە جگە لە لێکۆڵینەوە دەربارەی "جیهانی وێنەکان"، واتە ئەو واقعە بابەتییانەی کە لە بەردەم هونەرمەندا ئاشکرا دەبن کاتێ پەی بە جیهانی هەستپێکراو دەبا، یان کاتێ هەندێ شت دەخولقێنێ. ئەگەر هونەرمەند بتوانێ وێنەکان پێکەوە بلکێنێ بەبێ ئەوەی شارەزای یاساکانی بێت، هەروەك چۆن مرۆڤی سەرەتایی ئاگری کردۆتەوە بێئەوەی شارەزای نهێنییەکەی بووبێت، ئەوا ئەرکی زانای جوانناس –بە شێوەیەکی دیاریکراو بریتییە لە گۆڕینی ئەو مەعریفە ئەزموونییەی کە هونەرمەندی داهێنەر هەیەتی بۆ زانستێکی بابەتی یان مەعریفەیەکی تیۆری. پەیبردنی هونەرمەند بە وێنەکان لە قۆناغی داهێناندا پەیبردنێکی نائاگایانەیە، بەڵام دواتر زانستی جوانناسی (ئیستاتیکا) دێت و مەعریفەی ناوەکی لە کرۆکی چالاکی هونەرییەوە دەگوێزێتەوە بۆ بازنەی هۆشیاری یان هەستیاری. کەواتە ئیستاتیکا بۆ هونەر وەك زانستی تیۆری وایە بۆ زانستی پراکتیکی، وەك پەیوەندیی نێوان فیسیۆلۆجیا و زانستی پزیشکی، یان پەیوەندیی نێوان ئەندازەناسی و پێوانەسازی.. هتد. هەروەك چۆنیش فیسیۆلۆجیا و ئەندازەناسی ئەو یاساپێوەریانە نین کە پیشەی پزیشك یان پێوانەساز دیاری دەکەن و هەروەك چۆنیش ئەو

دوو زانستە لەو مەرجانە ناکۆڵنەوە کە لە ڕێگایەوە ئەو دوو کەسە پیشەکانیان جێبەجێ دەکەن و سۆراخی مێژووی دەستپێکردنی ئەو دوو پیشەیە ناکەن، بە هەمان شێوە زانای جوانناسیش نابێ خۆی تەرخان بکا بۆ دەستنیشانکردنی یاسا پێوەرییەکانی پیشەی هونەری، یان لێکۆڵینەوە لە مەرجە دەروونی و سایکۆلۆجییەکانی داهێنانی هونەری.. هتد)[4].

لە ڕاستیدا زانستی جوانناسی گوزارشت لە باری سەرنجی مرۆڤ دەکا لە ئاست جیهاندا، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نییە کە جوانناسی زانستێکی زەینییە، بەڵکو زانستێکی گەردوونی "کۆسمۆلۆجی"یە. واتە بابەتی ئیستاتیکاش – وەك بابەتی هەموو زانستەکانی دیکە– خودی گەردوونە، هەرچەندە ئەم زانستە چوارچێوەیەکی دیاریکراوی لەناو گەردووندا هەیە بۆ لێکۆڵینەوە، کە ئەویش چوارچێوەی وێنەکان (فۆرمەکان)ە کە زانستەکانی تر گرنگی بە لێکۆڵینەوەی نادەن. بەو پێیەی ناسینی وێنەی شتەکان ئەو مەعریفە چۆنایەتییە تایبەتەیە کە هونەر دەیخوازێ، ئیدی زانستی جوانناسی کە لێکۆڵینەوەکانی بە ئاقاری ئەو جیهانە هەستپێکراوەدا دەبا ئاراستەی وزە هونەرییەکە دەکا. کاری هونەرمەند هەڵگری مۆرکێکی تایبەتە بریتییە لەو دیدە رووکەشییەی کە لە لایەن خۆیەوە بە تەنها لە ئاست شتێکدا هەیەتی، بەڵام ئەرکی زانای جوانناس بریتییە لە لێکۆڵینەوە لە ڕەگەزە گشتییەکان. ئیستاتیکا مەعریفەیەکی ئەقلیی ڕێکوپێکە لە ئاست پرەنسیپە رووکەشییەکانی گەردووندا. واتە پێویست ناکا زانای جوانناس کەسایەتی هونەرمەندمان بۆ شیتەڵ بکا، یان باسی دۆخەکانی چالاکی داهێنەرانەی ئەو هونەرمەندەمان بۆ بکا، بەڵکو ئەرکەکەی تەنها بریتییە لە دارشتنی ئەو مەعریفە تایبەتانەی کە چالاکی هونەریی لەسەر بنەمای چەند ڕەگەزێکی گشتی لەخۆ دەگرن. کەواتە ئامانجی جوانناسی بریتییە لە وەستان لە ئاست وتەزا بنەڕەتییەکان و پرەنسیپە وێنەییە گەوهەریی و جێگرەکان کە لە ڕێگایەوە سەرجەم دیاردە ئیستاتیکییەکانی ئەم گەردوونە ڕێکوپێکەی لە سایەیدا دەژین دەچنە دۆخی پێکەوەگونجان[5].

ئەمە هێڵە گشتییەکانی ڕێچکەی سۆریۆ–یە لە ئیستاتیکادا کە ناوی دەنێ "زانستی وێنەکان". گومان لەوەدا نییە ئەم بیریارە گەورەیە تا ئاستێکی زۆر سەرکەوتوو بوو لەوەی چەمکی "بەها" لە پێناسەکردنی زانستی جوانناسی وەدەرنێ، هەر ئەویش بوو بۆ یەکەمین جار چەمکی "شت"ی خستە بواری لێکۆڵینەوە ئیستاتیکییەکان، بەوەش ڕێگەی خۆش کرد لە بەردەم زانا جوانناسەکاندا بۆ چارەسەرکردنی چەند کێشەیەکی کۆنی هونەر، بە تایبەتی کێشەی پەیوەندیی نێوان وێنە و مادە، بەڵام ئێمە بە جۆرێك لە جۆرەکان پێمان وایە نەیتوانیوە چارەسەری ڕاستەقینە بۆ کێشەی بابەتیبوونی ئیستاتیکا بدۆزێتەوە، ئەو تەواوی فەلسەفە ئیستاتیکیەکەی خۆی لەسەر بنەمایەکی فەلسەفی ئاشکرا دامەزراند، لە ڕێچکەکەیدا دیدێکی ئەفلاتۆنی ئاشکرا بەدی دەکرێ، بە تایبەتی کاتێ

بە شێوەیەکی ڕیالیستی دەڵێ ماهیەتی شتەکان خودی شتەکانن. ئێمە ئەوە تێناگەین کە چۆن دەکرێ ئیستاتیکا ببێتە زانستێك بە مانای وشە، لە کاتێکدا ئەو چەمکە بنەڕەتیانەی لە سەری دامەزراون (وەك چەمکی وێنە یان چەمکی شت) چەمکگەلێکی فەلسەفیی پەتین. تەنانەت کاتێ سۆریۆ دەربارەی هونەرمەند قسەمان بۆ دەکا بەوەی ئەفرێنەری شتەکانە، ئەوەش دەڵێ کە ڕۆحی هونەرمەند نێوەندێکە لە نێوان مادە و وێنەدا. ئەڵبەتە ئەو حوکمە میتافیزیکییەی کە بوون دەکا بە دوو بەشەوە: جیهانی مادە و جیهانی وێنە، "ڕۆح"یش دەکاتە ئەڵقەی پەیوەندیی نێوانیان، لە کرۆکدا دیدێکی خودگەرییە کە هەرگیز زانست قبووڵی ناکا. ئێمە لێرەدا لە ئاست فەلسەفەیەکی جوانناسیداین کە بێوچان هەوڵ دەدا دیاردەی ئیستاتیکی بکاتە واقعێکی بابەتی، بەڵام دواجار تێکەڵاوییەك لە نێوان فەلسەفە و هونەردا دەسازێنێ و ڕێچکەیەکی میتافیزیکیمان پێشکەش دەکا دەربارەی بونیادی ئیستاتیکی بوون.

بەڵام گەورەترین کۆشش کە لە بواری لێکۆڵینەوە ئیستاتیکییەکاندا خراوەتە گەڕ بۆئەوەی ئیستاتیکا بکاتە زانستێکی بابەتی، ئەو کۆششەیە کە زانای گەورە ریمۆن بایێر *Raymond Bayer* (*1898–1959*) خستیە گەڕ. بایێر پەی بە زۆر لەو ئاستەنگانە برد کە دەبنە ڕێگر لە بەردەم دامەزراندنی زانستێکی بابەتی بۆ جوانی و لەم بارەیەوە وتی: ئیستاتیکا بەر لەهەر شتێك "زانستی چۆنایەتی"یە، لە کاتێکدا تەواوی زانستەکانی تر "زانستی چەندایەتی"ن، هەروەها ئیستاتیکا زادەی چەند فاکتەرێکی خودییە، بەڵام تەواوی زانستەکانی تر بابەتین، دواجار ئیستاتیکا خاوەنی مۆرکێکی "تاکەکەسی" یان "تایبەت"ە، بەڵام هەموو زانستەکانی دیکە خاوەنی مۆرکێکی "گشتی"، یان "تایبەتی"ن. بەڵام هەموو ئەم ئاستەنگانە لادەچن گەر بزانین چۆن لە "بابەتی ئیستاتیکی" دەکۆڵینەوە بە پێڕەوکردنی میتۆدێك کە لەگەڵ سروشتی تایبەتی بابەتەکەدا بگونجێ، گەر لێکۆڵینەوە ئیستاتیکییەکان تاوەکو ئێستا شکستێکی گەورەیان خواردبێ، دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە توێژەرەکان میتۆدی نەشیاویان بۆ خوێندنەوەی "بابەتی ئیستاتیکی" پێڕەو کردووە، وەك: میتۆدی میتافیزیکی، میتۆدی سایکۆ-فیزیکی، میتۆدی سایکۆلۆجی، دواتر میتۆدی کۆمەڵایەتی، بێ ئەوەی بزانن کە پێویستە بۆ ئەم زانستە میتۆدێکی سەربەخۆی تایبەت لە ڕووی چۆنایەتییەوە پێڕەو بکرێ کە گرنگی بە سروشتی خودی "بابەتە ئیستاتیکی" بدا.



سپینۆزا

لێرەوە بایێر بڕیار دەدا كە پێویستە میتۆدی ئیستاتیكی پشت ئەستوور بێت بە "میتۆدی ڕیالیستی ڕەفتارئامێز *Realisme Operetoire*" كە تەنها گرنگی بە دەركەوتەكانی هونەر و پرەنسیپی كاریگەرییەكانی و بەرهەمی ڕەفتارەكانی دەدا. میتۆدی ئیستاتیكی پێویستە هاوتای بابەتەكەی بێت، (جوان) شتێكی واقیعییە كە پێگەی بۆ خۆی لە ژێر خۆردا كردۆتەوە، یان دیاردەیەكی بینراوە كە لە جیهانی واقعدا تۆمار كراوە. بەم پێیە بایێر بڕوای بە هیچ ئیستاتیكایەكی زەینی نییە، بەڵكو دەخوازێ ئیستاتیكا ببێتە زانستێك كە لەسەر تێبینی كردن دامەزراوە. بەوپێیەی هەموو شتێكیش لە "كرداری هونەری"دا وەك بابەتێكی ئیستاتیكی تۆمار كراوە، ئیدی پێویست ناكا زانای جوانناس دەسبەرداری شیكردنەوەیەكی وردو بەهێزی كردار و جێشوێنەكان ببێت، بە تایبەتی هەموو ئەو شتانەی كە تۆمار نەكراون بایەخێكی ئەوتۆیان لە هونەردا نییە.

لە واقعدا "كاری هونەری" –وەك بایێر دەڵێ– بریتییە لەو بابەتە ئیستاتیكییەی كە پێویستە زانای جوانناس وەك شتێكی هەستپێكراو و ڕوون لێی بكۆڵێتەوە. لێرەوە پێویستە لێدوانی هونەری شوێن پەنجە جێبهێڵێ، بە جۆرێك ناكرێ ناوی بنێین ئیستاتیكا گەر لە پشتیەوە هەست بە ڕەفتارێكی ڕاستەقینە لە ڕەفتارەكانی هونەرمەند نەكەین. واتە ئەو بیرۆكەیەی شوێنەوار لە دوای خۆی بەجێی نەهێڵێ لە بنەڕەتدا بوونی نییە، چونكە پێویستە هەر جووڵەیەكی هونەرمەند لە شێوەی "كاریگەرییەكی هەستیار"دا تۆمار بكرێ.

پێویستە بڕوانینە كار هونەرییەكان بۆئەوەی كاریگەرییەكی وەستاوی جوڵەیەك بدۆزینەوە یان كاریگەری چالاكییەك دەستنیشان بكەین كە تەواو بووە، شوێن پەنجەی ئەو كاریگەرییەش تاقە دەركەوتێكی ئیستاتیكییە كە پێویستە زانای جوانناس سەدان حسابی بۆ بكا. بۆ نموونە دەكرێ بڵێین: هونەری نیگاركێشان ڕێچكەیەكی سیحریی هەنووكەیی هەیە لای نیگاركێشە مەزنەكان بەدیی دەكرێ، بە جۆرێك وەرچەرخانێكی سەیر دەبینین كە وەك سیحر ڕوو دەدا، لە بابەتەوە بۆ چاو، ئینجا لە چاوەوە بۆ قەڵەم! ئیدی هیچ هونەرێك نایەتە ئاراوە گەر دەست جووڵە نەكات، جا ئەگەر بۆ نوسینی وشەگەلێك بێت، یان بۆ بەرهەمهێنانی ڕیتم، یان بۆ نەخشاندنی شوێن پەنجەیەك، یان بۆ تێكەڵاوكردنی چەند ڕەنگێك.. هتد. لە هەموو ئەم دۆخانەدا پێویستە دەست (شوێن پەنجەیەك) بەجێ بهێڵێ تا بابەتی ئیستاتیكی وەك بەرهەمی چالاكییەك یان وەك ئەنجامی پرۆسەیەك یان وەك شوێنەواری چالاكییەك دەربكەوێ. بەڵام ئەوەی گرنگە ئەو "شوێنەوارە تۆماركراو"ەیە یان ئەو "كارە جێبەجێ كراو"ە، یان ئەو "باباتە ئیستاتیكی"یەی كە لە جیهانی بووندا دەركەوتووە[6].

كاتێك چەمانەوەی هونەرێكی سیحری لە هەستەكانەوە دەگوازرێتەوە بۆ دەست، ئیدی پێویستە جوان لە وێنەی "بەرهەمێك"دا خۆی تۆمار بكا وەك بەرجەستەبوونی سەركەوتنی دەست و پەنجە یان وەك سەركەوتنێكی پیشەیی.

واتـە هەرچـەندە ئەوانـەی بانگەشـە دەکـەن بـۆ شۆفیگەری و نەرێخوازی و نابینایی خوازی (واتە ئەوانەی بڕوایان بە چاوی دڵ هەیە- وەرگێڕ). لە قسـەکانیاندا بـە بابەتگـەلێکی وەك حـەدس و ئیشراق و بینینـی دڵ-دا ڕۆدەچـن، بـەلام بابـەتی ئیسـتاتیکی دواجـار پێویسـتە لـە وێنـەی جـێ پەنجەیـەکی هونـەریدا بەرجەسـتە ببـێ، چونکـە مەحاڵە جوانبوونـی هـەبێ گـەر بەرجەسـتە نـەبێ. کاتێك باییر دەڵێ: "لە هونەردا نێرگسیەت نییـە"، دەیـەوێ بڵـێ هونەرمـەند وردبوونـەوەی سـلبی نـازانێت، هەسـتی هونـەری مـاندوبوون ناناسـێت، دیدی هونەریی هەرگیز لە کار ناکەوێ. هەرچەندە هـەندێ لـە فەیلەسـوفان هـەوڵ دەدەن هونـەر و وردبوونـەوەی فەلسـەفی تێکـەڵ بکـەن، بـەلام ئـەوە کارێکی بێهودەیە چونکە سیحری کاری هونـەریی خـۆی لـە خۆیـدا گورزێکـی لەناوبـەرە، دژی هیچگـەری (عـەدەم)ە، هـەموو بانگەشـەکانی ئیسـتاتیکای سـەلبی و پـەتی بـەدرۆ دەخاتـەوە. هەرچـەندە هـەندێك کـەس حـەز دەکـەن هونـەر و فەلسـەفە تێکـەڵ بکـەن، بـەلام بـاییر بـڕوای وایـە هونـەر فەلسـەفە نییـە، یـان ڕاسـتتر دەبـێ بوتـرێ: "گەر هونەر ڕێچکەیەکی فەلسەفی بێت، ئەوا شتێك نییـە جگـە لـە فەلسـەفەی سـەرکەوتن". بـەمجۆرە دەبینـین ئـەوەی کـە هونـەر شـی دەکاتـەوە ئـەو واقعیەتـە چالاکەیـە کـە سـەرلەبەری کـارە هونەرییـەکان ئاراستە دەکا. دەشێ بڕوانینـە هـەر کارێکی هونـەریی بەرجەستە، تاوەکو بـە ئاشـکرا تێبگەین کە چۆن لـە کرۆکدا هـەموو ئایدیالیزمێك ڕەت دەکاتـەوە. "جـوان" نموونەیـەك نییـە بـە ئاسمانی شتە پەتییەکاندا بفڕێ، بـەڵکو شـتێکی هەسـتپێکراوە کـە مەحاڵـە بـەر لـە پرۆسـە هونەرییـەکان بێتـە ئـاراوە. واتـە بـە مانایـەکی تـر "جـوان" لـە کرۆکـی ئـەو پرۆسـانەوە سـەرچاوە دەگرێ کە هونەرمەند هەوڵ دەدا جێبەجێی بکـا. زانای جواننـاس ناتوانـێ شـتێك دەربـارەی کـاری هونـەری بڵـێ کـە بابـەتی بێـت و پـەیوەندیی ڕاستەوخۆی بەو واقعیەتە ئیستاتیکییەوە هـەبێت کە لەبەردەمیایەتی، مەگەر توانیبێتی پەی بەرێ بە ڕەفتارێك لە ڕەفتارەکانی هونەرمەند یان جوڵەیەك لە جوڵەکانی لە کاتی ئیش کردنیدا. بەلام هەرچی لـەو سـەرنجە ورد و یەکلاکەرەوەیـە بـترازێ زانـای جوانناس هیچی لەسەر شان نییە جگە لە قڕوقەپ، چونکە هـەر شتێك نـەبینراو بێت دەچێتە خانـەی "داهێنـانی پـەتی"یـەوە. ئیسـتاتیکای زەینـی بـە جیهانی خەیاڵدا دەفڕێ، جلەو بۆ خۆی شل دەکا و دەکەوێتـە قسـە دەربـارەی ئیلـهامی قـووڵ و داهێنـانی پـەتی و بینینـی (نـاوەکی) ڕاستەوخۆ، بەلام ئیستاتیکای زانستی ڕازی نابێت خۆی بدا لە دەریایـەك کـە کـەنارێکی تێـدا شـك نـەبا بـۆ لەنگەرگرتن، ڕازی نابێت بە ئاخاوتنێکی شیعریدا ڕۆبچـێ کـە ئەمسـەر و ئەوسـەری نییـە و لێـی دەرناچێ. بەمجۆرە زانای جوانناس خۆی لەو کارە هونەرییەدا بەند دەکا کە لێی دەکۆڵێتەوە، هەندێ جار شان بە شان و هەندێ جار ڕووبەڕوو لەگەڵی دەمێنێتـەوە، ئیـدی لـە بـەردەم ئـەو بابەتـە ئیسـتاتیکییەی لێـی دەکۆڵێتـەوە جیهانـە تایبەتەکـەی خـۆی لـەیاد دەکـا کـە لێواولێـوە لـە خولیا و بیرۆکە و هەست!".

بەڵام ئەگەر کەسێك ڕەخنە لەم میتۆدە بگرێ بە بەهانەی ئەوەی کە دواجار ئیستاتیکای سۆز یان ویژدان لەناو دەبا، ئەوا بایێر وەڵام دەداتەوە و دەڵێ: ئەڵبەتە ئێمە ڕاست ناکەین گەر تووشی ئەو وەهمە ببین کە تێگەیشتنی بابەتی ئیستاتیکی، یان پەیبردن بە کاری هونەریی بە بەرچاوڕوونی و ئەقڵێکی سافەوە، هەست و سۆز و ویژدان لەخۆ ناگرێ. لە ڕاستیدا هەڵوێستی زانای جوانناس لە ئاست بابەتەکەیدا زیاتر لە هەڵوێستی عاشق دەچێ لە ئاست مەعشووقەکەیدا، ئەو هەموو شتێك دەربارەی دەزانێ: پێکەوەگونجان لە نێوان بەشەکانی ڕوخساریدا، چەمانەوەیەکی ورد لە چەناگەیدا، خاڵێك لەسەر گۆنای، شوێنەواری برینێکی وێڵ لەسەر گەردنیو... هتد. بە هەمان شێوە زانای جوانناس ڕووبەڕوو لە ئاست بابەتەکەیدا دەوەستێ: لێی ورد دەبێتەوە، لێکۆڵینەوەی لەسەر ئەنجام دەدا، پرسیار دەربارەی دەکا، تاووتوێی دەکا، چێژی لێ وەردەگرێ و هەست بە ڕۆڵێکی ڕۆشن دەکا کە بریتییە لە ڕوون و ئاشکرایی (کارە هونەرییەکە)، واتە زانای جوانناس ناتوانێ لەبری قسەکردن لە کارە هونەرییەکە قسە لە سێبەر و تارمایی و خەیاڵەکانی بکا، بەڵکو پێویستە هەمیشە ڕووبەڕووی خۆی بیهێڵێتەوە. ڕیمۆن بایێر دژی هەموو جوانناسییەکی زەینییە، چونکە ئەو پێی وایە جۆرێکە لە دەریاوانی بەڵام بەبێ بەلەم و پەرچەم، جیهانی هونەریش وەك زەریایەکی تاریك وایە کە بێ کەنار و بێ بنە! ئەو کاتەیشی کە دەگەینە کەنار ئەوا پێویستە ئیستاتیکا ببێتە لێکۆڵینەوەیەکی بابەتی کە پشتئەستوورە بە وردەکارییەکانی کاری هونەری و وەستان لەسەر سروشتی سەربەخۆی ئەو کارە و ڕۆچوون بە قووڵاییەکانیدا و پەیبردن بە هەموو ئاستەکانی کەسایەتیی هونەرەکە.

بێگومان کاتێ مرۆڤ بە باشی سەیردەکا، هەموو شتێك لە بەرچاویدا وێنەی "نیشانە"یەك، یان "ئاماژە"یەك، یان "بەڵگە"یەك وەردەگرێ. لێرەوە زانای جوانناس لەوە دەکۆڵێتەوە کە هەموو کارێکی هونەریی ڕووداوێکە ئایندە و ڕابردووی هەیە، ئیدی بە وردی سۆراخێکی ڕاستەقینەی ئەو کارە دەکا و هەوڵ دەدا ئاستە جیاوازەکانی پێکەوە بگونجێنێ و پێشبینی ئایندەکەی بکا، پێشبینییەکی زانستی ڕاست. کاتێکیش زانای جوانناس دەتوانێ لە هەموو خاڵ و جووڵەیەکدا، حەقیقەتی بابەتەکە و واقعیەتی ببینێ بەو پێیەی ئەو کارە هونەرییە "شت"ێکە، ئیدی دەگاتە ناسینی ئەو سیستمە ئیستاتیکییەی کە لە پشتی ئاستە جیاوازەکانی کارە هونەرییەکەوە خۆی پەنهان داوە. واتە ئەرکی زانای جوانناس سۆراخکردن و شوێنپێکەوتنی (بیرۆکە)یە، لە نیشانەیەکەوە بۆ نیشانەیەك و لە ئاماژەیەکەوە بۆ ئاماژەیەکی تر. بەو پێیەشی هونەر پێویستی بە بیرۆکەیەك هەیە بۆ تۆمارکردن یان بابەتێك کە قابیلی سڕینەوە نەبێت، ئەوا پێویستە (چاو) سۆراخی هەموو شوێنەوارە تۆمارکراوەکان بکا، نەك بە شوێن بیرۆکە پەرت و ونەکاندا بفڕێ! کەسێکیش خاوەنی چاوێکی شارەزا و وردبین بێت، لە ڕێگای زمانی "دەست"ەوە بیرۆکەکانی

"زەین" بەرجەستە دەکا، بەو جۆرەش پرۆڤە دەکا لەسەر خوێندنەوەی ئەو زمانە تایبەتەی کە کاریگەرییەکانی بابەتی ئیستاتیکی دەیدرکێنن[7].

هەندێ کەس وا دەزانن لە بابەتی ئیستاتیکیدا شتێك لە ئارادا نییە، جگە لەوەی کە چاو دەیبینێ و خەیاڵی بە بەردا دەکات، واتە ئەو شتەی کە خود بە بابەتەکەی دەبەخشێ، بەڵام ڕیمۆن بایێر پێی وایە ئەرکی زانای جوانناس ئەوەیە بۆمان ڕوون بکاتەوە کە "خود" هەموو شتێك نییە لە حوکمی ئیستاتیکیدا، بەڵکو شتێك لە دەرەوەی خود دەمێنێتەوە کە بریتییە لەو هاوسەنگییەی لە بنیاتی ئیستاتیکی بابەتەکەدا هەیە، ئەو شتەش بە دیاریکراوی بریتییە لەو فاکتەرەی کە هەموو حوکمێکی ئیستاتیکیی پێوە بەندە. کەواتە هەر کارێکی هونەریی سیستمێکی تایبەتی شتە پێویستەکان لە هەناوی خۆیدا هەڵدەگرێ، چۆنایەتی ئیستاتیکی ئەو کارەش لەو سیستمەوە پەخش دەبێتەوە. ڕەنگە تووشی ئەو وەهمە ببین کە هێزی نامۆی دەروونی، یان چەند هەرێمێکی تاریکی قووڵاییەکانی خود مۆرکی ئیستاتیکی تایبەت لە ڕێگای دۆخە دەروونییەکانمانەوە دیاری دەکەن، بەڵام ئەوەی کە ئەو مۆرکە دەستنیشان دەکا خودی ئەو شتەیە کە لێی ڕادەمێنین، بەوپێیەی یاسایەکی تایبەت لە هەناوی خۆیدا هەڵدەگرێ کە دەستەبەری شیکردنەوەی دەرکەوتەکانی خۆی دەکا[8].

بەهەر حاڵ ئێمە نکوڵی لە بایەخی تێگەیشتنی هەڵوێستی خود ناکەین لە ئاست بابەتی ئیستاتیکیدا، هەروەها نکوڵی لە تێگەیشتنی ئەو فاکتەرە کاریگەرانە لەسەر حوکمە ئیستاتیکییەکان و ناسینی کۆڵەکەکانی چێژی هونەریی تایبەت ناکەین، بەڵام ڕاوەستانمان لەسەر سروشتی "بنیاتی ئیستاتیکی" کە پێکهێنەری کرۆکی بابەتەکەیە، تەنها شتێکە کە یارمەتیمان دەدا بۆ تێگەیشتن لە حوکمەکە بەو پێیەی ئەنجامێکە پێوەی بەندە و لەوەوە سەرچاوەی گرتووە. لێرەوە ڕاستی ناپێکین گەر بڵێین: هەر حوکمێك لە لقە حوکمەکانی ئێمە لە ئاست بابەتێکدا شتێك نییە جگە لە دیدێکی تایبەت بۆ بنیاتی گشتی کارە هونەرییەکە. واتە "بابەتی ئیستاتیکی" ئەو بەردە جێگیرەیە کە هەموو حوکمە ئیستاتیکییەکانی ئێمەی بەردەکەوێ، وەك ئەوەی چەند شەپۆلێکی یەك لە دوای یەك بن کە لە زەریایەکی هەڵچووەوە دێن و بەر کەنار و بەردەڵانی کەنار دەکەون. بابەتی ئیستاتیکی هێڵی هاوبەشی هەموو ئەو حوکمە شیاوانەیە کە ئێمە دەربارەی دەری دەکەین؛ چونکە پێویستە شیکردنەوە فەرعیەکانی ئێمە و حوکمە ڕێژەییەکان و دیدە تایبەتەکانمان دەربارەی کاری هونەری پێکەوە بگونجێن، وەك ئەوەی زنجیرەیەك دەسڕێژی یەك لە دوای یەك بن هەوڵی پێکانی نیشانەیەك بدەن، تەنگی پێ هەڵچنن، بەڵام نەتوانن بە تەواوی بیبڕن و بگەنە شوێنی مەبەست. ئێمەش زۆر جار لایەنگری پێشوەختی حوکمە ئیستاتیکییەکانی خۆمانین، لەبەرئەوەی ئێمەش دابەش بووین و ناتوانین بابەتە ئیستاتیکییەکە وەك خۆی و بە تەواوی ببینین، بەڵام ڕێبەر و ڕێنیشاندەری حوکمەکانی

ئێمە خودی ئەو شتەیە کە پەی پێ دەبەین. واتە حوکم نهێنییەکی ئاڵۆزی ئەوتۆ نییە کە لە شتی سەیر و سەمەرەوە پێچرابێت، بەڵکو تەنها شتێکی بینراوە کە لە ڕێگایەوە هەوڵ دەدەین شارەزایی لە وردەکارییەکانی بابەتەکە پەیدا بکەین. ئەگەر حوکمەکانمان زۆر جار ڕێژەیی بن، ئەوە مانای ئەوەیە پرۆسەی "وردبوونەوە" ناچارمان دەکا پێکهاتەکانی کاری هونەری پێکەوە بلکێنین. بەڵام چەندین فاکتەری تر هەن کە حوکمەکانمان دەکەنە حوکم گەلێکی ڕێژەیی گۆڕدراو، ڕەنگە لە پێش هەموویانەوە جیاوازییەکانی نێوانمان بێت لە پسپۆڕیدا، جیاوازییەکانی نێوانمان لە هەست ناسکی و دۆخی سایکۆلۆجی و مێژوویی و وردەکارییەکانی کەسایەتی و ئەو شتەی کە ناوی دەنێین "قابلیەتی گەیاندن" لە بواری ئیستاتیکیدا.

دەکرێ بگەڕێینەوە بۆ ئەزموونەکان تا لەوە بگەین کە پەروەردە و پرۆڤە کاریگەرییەکی ئاشکرایان لەسەر توانای تایبەتی تاك هەیە لە دەرکردنی حوکمی ئیستاتیکیدا، بە بەڵگەی ئەوەی کارلێکی درێژ لەگەڵ کارە هونەرییەکاندا گەشە بە زەوقی تاك دەدا و هەستی ئیستاتیکی بەخێو دەکا و هەستیاریی ناسك دەکا. پەروەردەی هونەریی کاری خۆی لە دەروونی تاك دەکا و وای لێ دەکا لەوە بگا کە حوکمێکی ئیستاتیکی ڕاستگۆیانە هەیە کە دەکرێ بە تەرجەمەیەکی ڕەخنەیی یەکلاکەرەوەی بابەت لە قەڵەم بدرێ، وەك ئەوەی ئێمە لە ئاست ئاوێنەیەکی ڕاستگۆدا بین کە وێنەی کاری هونەری بە وردی و ڕوونی و ئەمانەتەوە دەگەیەنێ. ئەگەر هونەر بەبێ پسپۆڕی نەتوانێ بژی، یان ئەگەر هونەر (بە مانایەك لە ماناکان) جیهانی پسپۆڕەکان بێت، ئەوا لە خۆڕا نییە ئەرکی پەروەردەی هونەریی بە تایبەتی و ئەرکی ڕۆشنبیریی جوانناسی بە گشتی بریتی بێت لەوەی ڕامان بهێنن لەسەر چۆنیەتی بینینی "کاری هونەری". بۆ نموونە دەکرێ بڵێین: گریمان ئێمە گوێ لە سیمفۆنیایەك دەگرین لە هۆڵێکی مۆسیقاژەنیدا؛ کاممان توانامان زیاترە لە چێژوەرگرتنی ئەو کارە هونەرییە؟ پیاوێکی ئاسایی و بێ سەواد کە ڕانەهاتووە لە بیستنی ئەو کارە هونەرییە؟ یان پیاوێکی پسپۆڕ کە خاوەنی ڕۆشنبیرییەکی مۆسیقی بەرفراوانە؟ کەواتە ئایا ڕاست نییە لەگەڵ (بابیێر)دا بڵێین: کاری هونەریی ئەو شتەیە کە هەنگاوی بۆ دەنێین و بەرەو ڕووی دەڕۆین. کاتێکیش زیاد لە جارێك دەڕۆین بۆ بیستنی سیمفۆنیایەك، یان کاتێك زیاد لە جارێك ئۆدیسە دەخوێنینەوە؛ داخۆ هۆکاری ئەو گەڕانەوە بەردەوامە چییە بەرەو کارە هونەرییەکە؟ هۆکارەکە ئاشکراکردنی چەند لایەنێکی تازەیە لە هەموو گەڕانەوەیەکی تازەدا، وەك ئەوەی بزانین کە پێویستە خاوەنی دیدێکی ڕەوا بین دەربارەی تەواوی ئەو مەرجە تەکنیکی و ئیبداعیانەی کە پەیوەندییان بە دروستبوونی کارە هونەرییەکەوە هەیە[9].

هەندێك پێیان وایە حوکمی جوانناسی تەنها هەڵسەنگاندنێکی یەکلایەنەی پەتی یان هەرەمەکییە، بەڵام زانای جوانناس باش دەزانێ کە حوکمێکی لەوجۆرە حوکمێکی بابەتییەو

پشتئەستووره بە هۆکارێکی شەرعی کە خودی کارە هونەرییەکەیە. کاتێک سۆراخی چیرۆکی کارێکی هونەریی دەکەین و هەوڵ دەدەین شارەزای وردەکاریەکانی بین یان لەسەر هەموو لایەنەکانی بوەستین؛ ئەوا دەکرێ بگەینە حوکمی هاوتا یان حوکمێکی ڕاستەقینە کە بەسەر تەواوی بابەتەکەدا جێبەجێ دەبێ.

بەمجۆرە بایێر پێی وایە "بابەتی ئیستاتیکی" دەتوانێ خۆی لە خۆیدا ڕووبەڕووی هەموو ئەو حوکمانە ببێتەوە کە لەسەری دەوترێن، بە مەرجێ گەڕانەوە بۆ بابەت ببێتە ڕێبەری ڕاستکردنەوەی حوکمەکان. ئەم زانا جوانناسە جەخت لەسەر ڕەگەزی بابەتیبوونیش دەکاتەوە لە پێناو حوکمی ئیستاتیکیدا و بە ڕوونی دەڵێ: "حوکمەکەی من هێندەی پەیوەندی بە خۆمەوە هەیە پەیوەندی بە کارە هونەرییەکەوە نییە"(10)، واتە حوکمە ئیستاتیکییەکانی ئێمە دیدی ئێمە ئاشکرا دەکەن و هەموو ئەو هەوا و ئارەزوو و گروپبەندی و دەمارگیری و بەدحاڵیبوونەش ئاشکرا دەکەن کە لە دیدەکانی ئێمەدا هەن. بەڵام کاتێک سەرکەوتو دەبین لەوەی شارەزایی لە تەواوی بابەتە ئیستاتیکییەکەدا پەیدا بکەین، یان کاتێک خۆمان لە هەموو ئەو دیدە تەسکە تایبەتانە ڕزگار دەکەین کە ستەمکاری و هەڵچوونیان پێوە دیارە، ئیدی دەتوانین لەو بابەتە حوکمێکی ئیستاتیکی ڕاست دروست بکەین کە هاوتای تەواوی بابەتەکە بێت. بەمجۆرە (بایێر) دەگاتە ئەو دەرەنجامەی کە بڵێ تێگەیشتنی ئێمە بۆ کاری هونەری پەیوەستە بە توانای ئێمەوە لە بەزاندنی کورتبینی و داپڵۆسینی خۆپەرستیمان، بۆ ئەوەی گوێ ڕادێرین بۆ بابەتە ئیستاتیکییەکە و لە دیدی خودی بابەتەکەوە حوکم بدەین نەک لە دیدی خۆمانەوە! یەکێکیش لە خوێندکارە زیرەکەکانی بایێر کە ناوی (مایکل دۆفرین)ە قسەیەکی لەمجۆرەی کرد کاتێ وتی: "مرۆڤ بۆئەوەی خاوەن زەوق بێت دەبێ توانای خۆڕزگارکردنی هەبێت لە هەموو زەوقەکان، بەو مانایەی توانای ئەوەی هەبێت (کەرت) بکا بە گشت"(11). واتە زەوق (چێژی جوانناسی) بریتییە لە خۆڕزگارکردن لە هەموو توخمە کەرتییەکان (العناصر الجزئیة) و هەموو فاکتەرە تایبەتەکان، لە پێناو بڵندبوونەوە بەرەو ئەو ئاستە جوانناسییەی کە مرۆڤ دەتوانێ توخمی گشتگیر لە شتە مرۆییەکاندا ئاشکرا بکا.

ئێستا کاتێ تەماشای ئەو کۆششە جدییەی ڕیمۆن بایێر دەکەین بۆ دامەزراندنی زانستێکی جوانناسی پشتئەستوور بە چەند بنەمایەکی زانستی بابەتی، دەبینین ئەم بیریارە مەزنە ویستوویەتی لە ڕێگای شیکردنەوەی زانستییانەوە بگاتە ناخی بابەتی ئیستاتیکی، بۆئەوەی تەواوی ئەو هاوسەنگییەمان نیشان بدا کە دەستەبەری شیکردنەوەی وتەزاکانی دەکا، چونکە هەموو بابەتێک خۆی یاسای خۆیەتی. لێرەدا بایێر لەو "خود"ە دەبورێ کە لە ڕێگای بابەتەوە گوزارشت لە خۆی دەکا و تەنها تەماشای جیهانی کاری هونەری دەکا بەو پێیەی تەنها کاری هونەری ئەو دیاردە ئیستاتیکییەیە کە دەکرێ گوزارشتی لێ بکرێ و شی بکرێتەوە و ڕەخنە بکرێ. هەروەکو چۆن ئێمە مرۆڤ لە ڕێگای کردەوە و هەڵسوکەوتییەوە دەناسین نەک لە ڕێگای نیەت و مەبەستەکانییەوە، بە هەمان شێوە دیاردەی ئیستاتیکی لە ڕێگای ڕووکەش و

شوینەوارەکانییەوە دەناسین نەك لە ریگای خولیا و هەست و سۆزی خاوەنەکەیەوە. لیرەوە باییر گرنگی بە لیکۆلینەوە لە لایەنی گەردوونی (کۆسمۆلۆجی) وتەزا ئیستاتیکییەکان دەدا، بەلام هەموو دەرکەوتیکی بوونگەریی –وجودی ئەو وتەزانە پشتگوێ دەخا. بەمجۆرە باییر وا هەست دەکا کە گوزارشت لە "جیهانی کاری هونەری" دەکا، لە کاتیکدا ئەوەی پیشکەشی کردووین شتیك نییە جگە لە دەستنیشانکردنی بنیاتی بابەتی کاری هونەری. ئەلبەتە ئیمە نالیین لیکۆلینەوەیەکی ئیستاتیکی لەمجۆرە کە بنیاتی بابەتی کاری هونەری ئاشکرا دەکا بایەخی نییە، بەلکو دەمانەوێ بلیین لیکۆلینەوەیەکی رەخنەیی لەمجۆرە کە گرنگی بە بنیاتی بابەتی ئیستاتیکی دەدا نامانگەیەنیتە تیگەیشتنی سروشت "شارەزایی ئیستاتیکی" کە ئەزموونیکی راستەوخۆیە و ویژدان تیای دەژی. لیرەوە دەخوازین جیاوازی بکەین لە نیوان "وتەزا بنیاتییەکان- ستراکتۆریەکان" و "وتەزا ویژدانییەکان"، یەکەمیان لە هەناوی بابەتدایە، بەلام دووەمیان پەیوەندی بەو چۆنایەتییە بەراییانەوە هەیە کە بەشداریکردنیکی تایبەت لە لایەن خودەوە دەخوازێ. واتە خویندنەوەی گوزارشتی هونەری جۆریك لە مەعریفەی تایبەت لە خود دەخوازێ بۆ ناسینی حەقیقەتی ئەو شتەی کە هەستی پیدەکا. ئەگەر نا، ئەوا کاری هونەری تەنها بابەتیکی دەرەکییەو خودیش کەسیکی نامۆیە کە بە خالیکی نادیاردا هەنگاو دەنێ بیئەوەی هیچ رینیشاندەریکی هەبێ(12).

لە راستیدا "بابەت" شتیکە بۆ خاتری "خود": واتە ناتوانین کاری هونەری لە چەند رەهەندیکی بابەتی پەتیدا گیربکەین، بە جۆریك ببیتە بابەتیکی هیندە دابراو کە پەیوەندی بە کەسەوە نەبیت و بۆ کەسیش بەرهەم نەهاتبێ! پیویستە لەوە بگەین کە چۆن جوانی دەناسین، تاوەکو بۆمان دەربکەوێ لە بابەتی ئیستاتیکیدا شتیك هەیە تەنها لە ریگای جۆریك لە هاوسۆزی و بەشداریی ویژدانییەوە پەی پیدەبرێ، واتە ئەو کاتەی خود دیت و لە ئاستیدا دەکریتەوە و قبوولی دەکا. گەر بابەتی ئیستاتیکی هەلگری بارگەی ویژدانی و واتای تەعبیری خۆی بیت، ئەوا ناکرێ بیکەینە تەنها بابەتیکی شتئامیز کە نیوەی لە دەرەوەیە و تەنها دەبێ وتەزا بنیاتییەکانی شی بکرینەوە؛ بەلکو دەبێ بیکەینە بابەتیکی خودئامیز یان "نیمچە شت" و هەول بدەین بگەینە چۆنایەتییە ویژدانییەکانی و لە ئاست قەوارەی رۆحی ئەو کارەدا بوەستین. ئەلبەتە پیرەوانی بابەتگەری پەتی رەخنە لەم بایەخپیدانە فەلسەفییەی ئیمە دەگرن لە تیگەیشتنی بابەتی ئیستاتیکدا، بەلام ئەوە سروشتی بابەتە ئیستاتیکییەکە خۆیەتی ناچارمان دەکا کار بۆ تیگەیشتنی بکەین بەو پییەی دیاردەیەکی مرۆییە، نەك تەنها کار بۆ شیکردنەوەی بکەین وەك واقعیکی مادی پەتی.

لە راستیدا کاتێ ریمۆن باییر داوامان لیدەکا لەسەر "بابەت" بوەستین بۆ لیکۆلینەوە لە بنیاتە ئیستاتیکییەکەی، لیمان دەخوازێ کاری هونەری لە خودمان جیابکەینەوە، تاوەکو بیخەینە ژیر تاقیکردنەوەیەکی رەخنەیی و وردبوونەوەیەکی شیکاری. بەمجۆرە زانای جوانناس لە کاری هونەری دەکۆلیتەوە تا بزانی چۆن شت دەسازینێ، یان چۆن کار دەکا بۆ ئاشکراکردنی نهینی پیشەکەی خۆی. بیگومان لیکۆلینەوەیەکی

لەمجۆرەش پەیوەندی بە کاری هونەرییەوە نییە وەك "بابەتێکی ئیستاتیکی"، بەڵکو وەك "شتێکی دروستکراو" کە پێویستە سەرلەنوێ پێکەوەی بلکێنینەوە و سۆراخی هەنگاوەکانی بکەین. کەواتە توێژەر بە جۆرێك لە جۆرەکان لە کاری هونەری جیادەبێتەوە بۆئەوەی جۆرێك لە ناسینی شیکاری قەرەبووی ناسینی گشتگیر بکاتەوە. بەهەرحاڵیش ئێمە نکوڵی لە بایەخی لێکۆڵینەوەیەکی ڕەخنەیی لەمجۆرە ناکەین، بەڵام پێمان وایە ئەوەی کە گرنگە لە جوانناسیدا شیکردنەوەی کاری هونەری و دابەشکردن و ڕەخنەکردن و پەردەهەڵماڵین نییە لە سروشتی بنیاتەکەی، بەڵکو گەیشتنە بە ناوەڕۆکی گوزارشتی ناوەکی و ڕۆچوون بە قووڵاییەکەیدا. هەرچەندە هەندێك سوورن لەسەر ئەوەی کە کاری هونەری بە بابەت یان شت بچوێنن، بەوەی کە دەتوانین پەی بە هەموو لایەنەکانی بەرین هەروەك چۆن پەی بە شتێك دەبەین و گەمارۆی دەدەین؛ بەڵام قولاّیی کاری هونەری جیاوازی دەخاتە نێوان ئێمە و تێگەیشتنی تەواوی کارەکە هەر لە چرکەساتی یەکەمەوە، هەروەك ئەو هوشیارییەی کە هیچ دەرەتانێکمان لەبەردەمدا نییە بۆ گەیشتن پێی. لێرەوە چەند زانایەکی جوانناس بڕوایان وایە کە سروشتی کاری هونەری خۆی لە خۆیدا ناچارمان دەکا ئەو شتانەی ناو ناخی خۆمان بگۆڕین بۆئەوەی لێی تێبگەین: بەو مانایەی ناچارمان دەکا ناخی خۆمان قووڵتر بکەین تاوەکو لە قووڵی ئەو بگەین.

ڕەنگە یەکێك لە کەموکورتییەکانی ڕێچکەی بابەتگەریی پەڕگیر لە زانستی جوانناسیدا ئەوە بێت کە "بابەتی ئیستاتیکی" دەکاتە فەرماندەیەکی ڕەها کە هەموو مەرجەکانی خۆی بەسەر خودی دەرکپێکەر دەردەکا، چونکە تەنها ئەو حوکمی ئیستاتیکی ئاراستە دەکا و هەر ئەویشە ئاراستەی ڕاست دەکاتەوە. ڕەنگە بایێر شتێکی لەمجۆرەی مەبەست بووبێت کاتێ وتی: "حوکم شتێکی نهێنی نییە، بەڵکو تەنها تێڕوانینێکە -یان شتێکی بینراوە". بەڵام پێڕەوانی ئەم ئاراستەیە ئەوە لە یاد دەکەن کە خود لە ناسینی جوانیدا هەڵوێستێکی نێگەتیڤی پەتی نییە، بەڵکو ڕووبەڕووی بابەتی ئیستاتیکی دەبێتەوە بە کۆی شارەزاییە هونەرییە پێشوەختەکانی خۆیەوە، یان بە کۆی بەرهەمە جوانناسییە کەڵەکەبووەکانی خۆیەوە. چونکە ناکرێ بابەتی ئیستاتیکی بە تەواوی بێتە بندەستی من، مەگەر بە هەموو شارەزایی هونەری و هەموو کەلەپووری ئیستاتیکی خۆمەوە ڕووبەڕووی ببمەوە. کاتێك من بە وردی لە کارێکی هونەری ورد دەبمەوە، ڕابوردووم دەچێتە هەناوی هەنووکەمەوە، تاوەکو بە هەموو قولاّیی خۆمەوە پەی پێببەرم. هەر بۆیە مرۆڤ ناتوانێ بە تەواوی لە ئاست جیهانی شکسپیر و بەلزاك-دا ئامادە بێت، مەگەر بە شێوەیەکی کردەیی تیایدا بژی؛ بەو مانایەی بە شێوەیەکی ئەوتۆ ئازارەکانی ژیان ژیابێت کە بتوانێ لە ئەزموونی شکسپیر یان ئەزموونی بەلزاك بگات. لە ڕاستیدا وردبوونەوەی هونەری ناچارم ناکا شوێن خەونەکانم و خولیاکانم بکەوم لە پێناو تێگەیشتن لەو بابەتە ئیستاتیکییەی لەبەردەممدایە؛ بەڵکو ناچارم دەکا بە لانی کەمەوە گوزارشتێکی ئیستاتیکی بخوێنمەوە کە مەحاڵە بۆم ئاشکرا ببێت گەر خاوەنی توانایەکی هونەریی تایبەت نەبم بۆ

کارلێك لەگـەڵ بابەتـە ئیسـتاتیکییەکاندا. چونکـە "کاری هونەری تەنها بابەتێکی وشك و ڕێکخراو و لێکدابـڕاو نییــە، بــەڵکو بابــەتێکی کاریگـــەر و سەرنجڕاکێش و پڕاوپڕە لە بارگەی ویژدانی". گەر منیش تەنها وەك حەقیقەتێکی بابەتی وشك لێـی بڕوانم، ئەوا ناتوانم گوزارشتە هونەرییەکەی وەك حەقیقـەتێکی خودگـەری زینـدو بناســم.. لـێرەوە ڕاسـت ناکـەین گـەر بڵێـین بابەتگـەری لـە کـاری هونەریدا بابەتگەرییە لە گوزارشتێکی مرۆییدا کە بە زمانێکی ڕاستەوخۆی حەدسی بەڵگەنەویسـت لەگـەڵمان دەدوێ. حەقیقــەتی کـاری هونــەریش شـتێك نییــە جگــە لــەوەی ئـامرازێکی کاریگـەرە ڕاپێچی واقعمان دەکا لە ڕێگـای چەند وتەزایـەکی ویژدانییەوە.

لە کۆتاییدا دەکرێ بڵێین زانستی جوانناسـی لێکۆڵینەوەیـــەکی وەســـفییە دەربـــارەی "کـــاری هونـەری" وەك دیاردەیـەکی مرۆیـی. واتـە بابـەتی ئیسـتاتیکی خـاڵی دەسـتپێکردنی چنگکــەوتنی مەعریفەیەکی بابەتگەر نییە دەربارەی واقع، بەڵکو ڕاســـتتر خـــاڵی دەســـتپێکردنی پرۆســـەیەکی ویژدانییــە کــە گوزارشــتێکی مرۆیـــی تیـــادا دەخوێنینـەوە دەربـارەی واقـع، "گوزارشـت"یــش شـــتێك نییـــە جگـــە لـــەو بناغەیـــەی کـــە "بەیەکگەیشـــتن"ی لەســـەر دادەمـــەزرێ، ئـــەو بەیەکگەیشتنەی کە دەکرێ لە نێوان مرۆڤـەکاندا ڕوودا.

## پەراوێزەکان

*1*-وشەی "ئیستاتیکا" لە بنەڕەتدا واتە "هەستیاری" بــە شــێوەیەکی گشــتی و هەســتیاری ویژدانــی بــە تایبـەتی. حاڵی حازر ئەم وشەیە وەك زاراوەیـەکی باو مانای لێکۆڵینەوەیەکی پراکتیکی دەگەیـەنێ دەربـارەی چالاکی ئیستاتیکی.

*2-Etienne Souriau: "L'Avenir de l'Esthaetique u, Alcan, 1929, p. 51.*

*3-F. Feldman: "L'Esthetique Francaise Contemporaine Paris Alcan, 1936, pp 18-19.*

*4*-زکریا ابراهیم: "مشکلة الفن"، القاهرة، مکتبة مصر، *1904*، ص *28*-*29*.

*5-E. Sourian: L' Avenir de l'Esthetique", Alean, 1929, pp. 157-177.*

*6-Raymond Bayer: "Essais sur la Methode en Esthetique? Paris, Flamtion, 1953, pp. 141-142.*

*7-R. Bayer: "Traite d' Esthetique", Paris. Colin, 1956.*

هەروەها بڕوانە: "مشکلة الفن"، زکریا ابراهیم/ الفصل الثامن، ص *268*-*271*.

*8-R Bayer: "Esthetique de la Crace", Paris, Alcan, 1934, Vol. ll. pp. 327-328 & pp. 437-441.*

*9-R. Bayer: "Essais sur la Methode en Esthetique", pp. 190-191.*

*10-Ibid, p. 191.*

هەروەها بڕوانە: "مشکلة الفن" زکریا ابراهیم، ص *267*.

*11-M. Dufrenne: "Phenomenologie de l'Experience Esthetique", Paris, P.U.F, 1953, p. 100.*

*12-M. Dufrenne: "Phenomenologie de l'Experience Esthetique? t. ll, P.U.F, 1953, pp. 554- 545.*

## سەرچاوە

د. زکریا ابراهیم، فلسفە الفن فی الفکر المعاصر.
(مصر: دار مصر، *1966*) ص *350*-*367*.

# ڕۆشنبیرو.. بازاڕی ڕۆشنبیریی لە مەغریب

• د. محەمەد شەقرون(*)

▪ لە عەرەبییەوە: ئاوات ئەحمەد

بەم موداخەلەیە هەوڵ نادەین چەند دراوێکی ئامادەو ورد پێشکەش بکەین. کە هێشتا لەبەردەستماندا ئامادە نین. بۆ بابەتێکی بەرین کە سنوردارکردنی قورسە. ئەم بابەتە بەو سەختییە دەمێنێتەوە کە کاری زانستی لە کایەیەکی دیاریکراودا تووشی دەبێت، کە ئەویش بریتیە لە سۆسیۆلۆجیای ڕۆشنبیریی و ڕۆشنبیران. مەبەست لەم بەشداریکردنە خستنەڕووی چەند گرفتێکە کە پێوەستن بە دیاریکردنی کایەی ڕۆشنبیریی و ستراتیجی ڕۆشنبیران لەو کایەیەدا، هەروەها بەشێوەیەکی کورتیش خۆی بدات لە هەندێك لە مەرجەکانی پێکهاتنی ئەم کایەیە لە مەغریب و مەودای کاریگەریی ئەو مەرجانە لەسەر چەند چەشنێکی دیاریکراوی ڕۆشنبیران. لە کۆتاییشدا، هەوڵ دەدەین چەند پێشنیارێکی میتۆدیی(1) بۆ لێکۆڵینەوەی کایەی ڕۆشنبیریی و ڕۆشنبیران پێشکەش بکەین.

**چەند سنورکردنێکی بەرایی:**

ڕەنگە یەکێك بپرسێت: کایەی ڕۆشنبیریی چ پەیوەندییەکی بە کۆڕی " ئەنتلجنسیای عەرەبییەوە" هەیە. وەڵامی ئەم پرسیارە یەکجار ئاسانە: ئێمە ناتوانین لە ڕووی سۆسیۆلۆجییەوە پێناسەی ڕۆشنبیر بکەین تەنیا بە دیاریکردنی مەرجە بابەتییەکانی بەرهەمەکەی نەبێت. دیاریکردنی ئەم مەرجە بابەتییانە، بێشك دەمانبات بۆ دیاریکردنی کایەی ڕۆشنبیریی پێش دیاریکردنی ڕۆشنبیر. پەیوەندیی سۆسیۆلۆجیاو ڕۆشنبیریی لەکۆمەڵگاکانماندا پەیوەندییەکی ڕێك و پێك نییە، ئەمەش دەگەڕێنەوە بۆئەوەی

ڕۆشنبیران بە زەحمەت شتێکیان پێ قووت دەچێت کە خۆی بدات لەو بیرۆکەیەی خۆیان دەربارەی خۆیان هەیانە: وەکو بۆردیۆ[2] دەڵێت[*1] "جیهانی ڕۆشنبیریی جیهانی باوەڕە" باوەڕ بەبەهرە، بەهەڵکەوتوویی و یەکێتیی ئەو ئەفرێنەرەی کە کەس ئەو نائەفرێنێت. بیرۆکە باوەکە بووە بەوەی سۆسیۆلۆجیا[3] تەنیا لە سەرفکردنی ڕۆشنبیریی دەکۆڵێتەوە، نابێت خۆی بدات لە بەرهەم و بەرهەمهێنەر لە بواری ڕۆشنبیرییدا. مەبەستی ئەم جیاکردنەوە کۆمەڵایەتییە پەتییە بریتییە لە هێشتنەوەی ئەو ڕۆشنبیرە. بەرهەمهێنەی کە هیچ کەسێك ئەوی نەخولقاندووە . لەناو کایەیەکی گۆشەگیرو چەپەك و پیرۆز و مامەڵەیەکی تایبەتیدا. یەکێك لەو بیرانەی لەناو ڕۆشنبیراندا باوە ئەوەیە کە سۆسیۆلۆجیا بە هۆکارە ئامارییەکانیەوە لە پایەی داهێنان و بەرهەمی ڕۆشنبیریی کەم دەکاتەوەو دەیگوشێت و دەیپلیشێنێتەوە، چونکە لە یەك کاتدا مەزنان و بچوکان پێکەوە دادەنێت بەبێ ئەوەی هیچ بایەخێك بە بلیمەتیی مەزنەکان بدات.

ئێمە ئەم چەمکەمان هەڵبژاردووە " کایەی ڕۆشنبیریی" لەجیاتی هەڵبژاردنی " ڕۆشنبیران" لەبەر لاوازیی ڕێژەیی سیستمی پەیوەندییەکانی بەرهەمهێنان و دابەشکردن و سەرفکردنی تایبەت بە کالاّ ڕۆشنبیرییەکان لە لایەنی دەستەی بەرهەمهێنەرانی هاوجووتەوە لەگەڵ ئەم سیستمەدا. کایەی ڕۆشنبیریی مەبەست لێرەدا بریتیە لە کایەی مەغریبی[4]، ئەمەش هەرگیز مانای ئەوە نییە کە ئەوە کایەیەکی تایبەتییە یاخود بە حوکمی ڕەوشە ڕۆشنبیریی و مێژوویی و جوگرافییەکەیەوە، چەند ئیمتیازێکی ئەپستمۆلۆجیی[5] تایبەتی هەیە.

ئێمە لێرەدا وشەی کایەمان لە هەمان ئەو ڕەوتەدا بەکارهێناوە کە بۆردیۆ بەکاری هێناوە، واتە بریتیە لە" بوارێك لەناو جێگەکاندا، یاخود (پایەکان) دا، شوێنی خۆی هەیە، خەسڵەتەکانی لەسەر ڕەوشی لەناو ئەو بوارەدا رادەوەستن، دەشتوانرێت بە سەربەخۆیی لە خەسڵەتەکانی ئەو جێگایانە یان (پایانە) لێیان بکۆڵرێتەوە[*2].

**دەربارەی بابەتەکە:**

دەتوانین بابەتی ڕۆشنبیریی لە کایەی ڕۆشنبیری مەغریبدا لەسەر دوو ئاست بخەینە ڕوو: ئاستی کایەی بەرهەمهێنانی مەعریفی ( عیرفانی) و ئاستی بەرهەمهێنانی فراوان یان جەماوەری.

کایەی بەرهەمهێنانی مەعریفی وەك سیستمێك کە کالاّ ڕۆشنبیریی و فیکرییەکان بەرهەم دەهێنێت (لەگەڵ هۆکارەکانی موڵکایەتیکردنی ئەو کالاّیانە) کە بەشێوەیەکی بابەتی ئاڕاستەی جەماوەرێك لە بەرهەمهێنەرە ڕۆشنبیرییەکان کراوە ئەوانەی کە بەدەوری خۆیان کالاّی ڕۆشنبیریی و فیکریی بەرهەم دەهێنن. کایەی بەرهەمهێنانی مەعریفی ناتوانێت وەکو سیستمێکی بەرهەمهێنان پێك بێت هەتاکو دابڕان نەکات لەگەڵ جەماوەری نابەرهەمهێنەردا. ئەمەش مانای ئەوەیە کە پێکهاتنی کایەکە وەك ئەوەی ئێستا لە مەغریب

هەیە، بەستراوە بە مەودای داخرانیەوە بەسەر خۆیدا.

بەڵام ئاستی دووەم کە بریتیە لە کایەی بەرهەمهێنانی فراوان یان جەماوەریی، ئەوە بە چۆنێتییەکی تایبەتی ڕێکخراوە بۆ بەرهەمهێنانی کالای فیکریی و ڕۆشنبیریی ئاڕاستەکراو بۆ نابەرهەمهێنەرانی کالا ڕۆشنبیریی و فیکرییەکان (جەماوەری بەرین) چ سەر بە چینە بالاکان بن یاخود باقی چینەکانی تر. لەم سالانەی دواییدا، ئەم کایەیە تووشی کێشمەکێشێکی زۆر بووە چ لەلایەنی کالا ڕۆشنبیری و فیکرییە خۆرهەلاتی عەرەبییەکانەوە یاخود کالا ڕۆشنبیریی فیکرییە خۆرئاواییەکانەوە (ڕۆژنامەگەریی، سینەما، تەلەفزیۆن، هتد...) ئەگەر سیستمی بەرهەمهێنانی ڕۆشنبیریی یان جەماوەریی ملکەچ بێت بۆ یاسای ململانێ بۆ ئەوەی چەند بتوانێت بازاڕێکی بەرینتر بباتەوە، ئەوا کایەی بەرهەمهێنانی مەعریفی، هەوڵ دەدات خۆی بەهاو پێوانەکانی هەڵسەنگاندنی بەرهەمەکەی خۆی بەرهەم بهێنێت، لەپێناوی ئەوەدا کە دەستەی ڕۆشنبیران، ئیعتیرافێکی ڕۆشنبیریی و فیکریی پەتییان پێبکەن، ئەوانەی لە هەمان کاتدا هەرخۆیان مەعمیلە بەختەوەرەکان و کێبەرکێکەرەکانیشن و، لەم پێناوەدا ملکەچی یاسای بنەڕەتی کێبەرکێ دەبن.. بە دەسپێك لەم پرەنسیپەوە دەشێت نەك تەنیا لە پەیوەندیی نێوان کایەی بەرهەمهێنانی مەعریفی و "جەماوەری بەرین" و ئەو وێنانە تێبگەین کە ڕۆشنبیران دەربارەی ئەم پەیوەندییە هەیانە، بەڵکو دەشێت بە هەمان شێوە لە ڕەوتی کایەکەو لۆجیکی وەرچەرخانەکانی و، وەرچەرخانی گرفتەکانی و لە هەمان کاتیشدا لە بونیادی ئەو بەرهەمانە تێبگەین کە بەپێی لۆجیکی بەدوای یەکداهاتنی ئەو بەرهەم دەهێنرێت.

ئەوەی باوە لەلای بایەخدەران بە کایەی ڕۆشنبیریی لە کۆمەڵگا عەرەبییەکاندا ئەوەیە ئەوانە مەیلیان لە تێڕوانینێکی میسالییانە یان ڕۆحانییانە یان ئامانجییانە، ئەمەش بەهۆی جیاکردنەوەی بەرهەمهێنەر (بیریار، ئەدیب، هونەرمەند، هتد) لە مەرجەکانی بەرهەمەکەی و بەوەش نکوڵیکردن لە وەزیفەی ئابوریی و بازرگانی بەرهەمی ڕۆشنبیریی و فیکریی. مەبەست لە پشتی هەموو ئەم پێشنیارانەی کە لێرەدا پێشکەشیان دەکەین، بریتیە لەوەی ئەوانە بخەینە ناو کایەی گەمەکەوە کە کۆکن لەسەری، بۆئەوەی گرەوەکانیان لە دەرەوەی گەمەکە جێبهێڵن، ئەوانیش ڕۆشنبیرەکانن. ئەو مشتومڕە گەرمەی دەبارەی ڕۆڵی کۆمەلایەتی و سیاسی و تەنانەت "پێشبینیکەرانە"ی ڕۆشنبیر بەرەوی هەیە، ڕۆشنبیر دەخزێنێتە ناو ڕۆڵی ڕەخنەگرێکی گشتی کۆمەڵگای گشتیی و بەهاکانییەوە، وەك ئەوەی ڕۆشنبیر خۆی لە جێگەیەکی دەرەکیی ئەو کۆمەڵگایەدا بێت. دژی ئەم بەوەهمدا چوونەی کە پێی وایە ڕۆشنبیر ڕەگوڕیشەو پێوەستیی لەناو کۆمەڵگادا نییە، پێویستە بێتەوە یادمان کە ڕۆشنبیران ئیتر هەر ڕەوشێکیان هەبێت و نیەتەکانیان هەرچی بێت بریتین لە دەستەیەك کە لە توێی چینی بالادەستەوە کۆنترۆڵ کراون،

بەوەی سەرمایەی رۆشنبیرییان داگیر کردووە (کە ئامادەشە بۆئەوەی بەردەوام بگۆڕێت بۆ سەرمایەیەکی مادیی و کۆمەڵایەتی)، بەشێکی گرنگ لە هەڵوێستەکانیان ( بۆ نمونە، ئەوەی پەیوەندیی بە رۆشنبیریی یان سیاسەتەوە هەیە) پێوەستە بەو ناکۆکیی رەوشیانەوە وەکو کۆنترۆڵکراوەکان لەنێوانی کۆنترۆڵکەرەکاندا، پێویستە ئەوەشمان لەیاد بێت کە کایەی رۆشنبیریی چەندان بەرژەوەندیی تایبەتی دەگرێتە خۆی، کە تەنیا ناخزێنرێتە ناو پلەوپایە ئەکادیمییەکانەوە یاخود پەیمانەکانی بڵاوکردنەوە یاخود خوێندنەوە یان تەعلیقدان، یا پلەوپایەی ئیداریی و سیاسیی، بەڵکو بەهەمان شێوە نیشانەکانی ستاییش و پیاهەڵدانیش دەگرێتەوە، کە ئەو کەسە سەر بە جیهانی رۆشنبیران نەبێت، ئاگاداری نییە، لە توێی ئەو ئامازانەوە جڵەوی جۆرەها فشارو سانسۆری کاریگەر، دەگیرێت.

پێویستە بابەتی سۆسیۆلۆجیای رۆشنبیریی و رۆشنبیران، خۆی کایەی بەرهەمهێنانی رۆشنبیریی بێت بە هەموو پێکهێنەرەکانییەوە (بواری بەرهەمەکان چ فیکریی بن یان نوسراو بن یاخود بە دەمیی بن، لەگەڵ بواری ئەوانەشی کە بەرهەمیان دەهێنن) لەگەڵ کایەی بەکارهێنەرانی ئەو بەرهەمهێنراوانەو کایەی دەلالەکانی نێوان بەرهەمهێنەران و بەکارهێنەران (بڵاوکەرەوەکان، رەخنەگران،.. هتد)[*3].

### پێکهاتەی عەقڵی سیاسی و ستراتیجەکانی هەژمونی فیکریی

لە قۆناغی یەکەمی سەربەخۆییەوە رۆشنبیرییەك بەسەر کایەی رۆشنبیریی مەغریبیدا بالادەست بووە، کە گرنگترین شت بۆ جیاکردنەوەی ئاماژەی پێبدەین، بریتیە لە مۆرکە دوالیزمییەکەی[6] بە نیسبەتی هەر ئاستێك لە ئاستەکانی بەرهەمهێنانی رۆشنبیرییەوە: دەبینین بە نیسبەتی کایەی بەرهەمهێنانی مەعریفییەوە رۆشنبیریی ریشەگەرایی کۆنینە باڵی کێشاوە، شانبەشانی رۆشنبیرییەکی مۆدێرن، کە لە رۆشنبیریی فەرەنسیدا گوزارشتی لێدەکرێت. ئەم رۆشنبیرییە نوێیە یاخود نوێخوازە زمانی خوێندنی هاوچەرخ و زمانی زانکۆو زانکۆکاران و زمانی پسپۆرییە هاوچەرخەکان بووە کە لە رێگەی دەستەیەکی بچووکی رۆشنبیرانەوە نەبوایە، کە زۆربەیان سەر بە توێژە بالاکانی چینە نێوەندەکانی ئەوکاتە بوون، نەدەناسرا، بەتایبەتی ئەوانەی سەرلەنوێ رەوشە کۆمەڵایەتییەکەی خۆیان لەناو سیستمی خوێندنی نوێدا وەبەرهێنایەوە، بە پێچەوانەی ئەو سیستمی خوێندنەوە کە خۆیان بەرهەمەکەی بوون ( خوێندنی فەندەمێنتالیست و ئاینیی). بەلام بەنیسبەتی کایەی بەرهەمهێنانی جەماوەرییەوە، سەروەریی رۆشنبیریی زارەکی لەرێی جیکایەت و پەندو شەوانی گوێ ئاگردان..هتد ەوە، دەبینینەوە. لەپاڵ رۆشنبیرییەکی تردا کە سەرچاوەکەی خۆرهەلاتییە، بەتایبەتی لە میسر (بەشێوەیەکی تایبەتی لەسەر ئاستی رۆژنامەو

گۆرانـی و سـینەما، دەردەکـەوێت). دواتـر لـە ئـەنجامی ئـەو گۆڕانکارییانـەی بەسـەر بـازاڕی ڕۆشـنبیریی عـەرەبیدا دێـن، لـە ئـەنجامی تـەعریبکردن و بڵاوبوونـەوەی خوێندن، کـە دواتـر هەردوکیان بوونە هۆی زیاتر بوونی داواکاری ئەو کاڵایانـە. هـەردوو پرۆسـەی تـەعریب کـردن و خوێندن بوونە هۆی هەژمونکێشانی ڕۆشنبیریی خۆرهـەڵاتی، نـەك تـەنیا لەسـەر ئاسـتی بەرهەمهێنانی جەماوەریی، بـەڵکو لەسـەر ئاسـتی بەرهەمهێنانی مەعریفییش. ئەم ناکۆکییە لەنێوانی چەشـنی بەرهەمـهێنانی مـەعریفی و چەشـنی بەرهەمهێنانی جەماوەریدا، مانای ئـەوە نییـە کـە هـەردوکیان لەیـەك جیـاوازن، چونکـە بـەهۆی پەیوەندییەکەی نێوانیانەوە نەبێت، سنورەکانیان دیـاری نـاکرێت. بـە جۆرێکـی وەهـا لـەناو هـەر سیسـتمێکیاندا دەلاڵـەکانی نێـوان ئـەو بەرهەمهاتووانەدا کە بەپێی پێوانـە ناوخۆییـەکان بەرهەمهاتوون و ئەو بەرهەمانەشدا کە بەپێی ئەو زانیارییانـە هێنراونەتـە بەرهـەم کـە پێوەسـتن بـە بەرزبوونـەوەی جـەماوەری بەرینـەوە، سروشـتی پـەیوەندیی لـەنێوانی هـەردوو کایەکـەدا، بووەتـە هۆی دروستبوونی دوو کایەی لاوەکی لەناو کایەی ڕۆشنبیریدا لە مەغریب.

**کایەی لاوەکی یەکەم:**

**ڕۆشنبیریی مەغریبی**

ئـەم گرفتـە بـە شـێوەیەکی تایبـەتی لەسـەر ئاستی ئەو بەرهەمە کریستاڵە بووە کە بە زمانی فەرەنسی گوزارشـتی لێدەکرێـت. دەبینـین لەسـەر ئاسـتی ئـەم بەرهەمـە، ڕۆشـنبیریی زارەکـی و ڕەمزەکـانی تێکـەڵاو دەبـن لەگـەڵ ڕۆشـنبیریی بـە زمـانی فەرەنسـی نوسـراودا. هـەروەها ئێمـە بەرهەمێك دەبینین بابەتەکەی بریتیە لە مەغریب لە ڕووی ئابوری و سیاسـەت و کۆمەڵایـەتی و.. هتـد. ئەدەبی مـەغریب کـە بـەم زمانـە نوسـراوە باشـترین گوزارشت لەم کایە لاوەکییەی یەکەم دەکات، لەپاڵ چەندان بەشداری تریشـدا لـە بوارەکـانی زانسـتە مرۆییـەکان و کۆمەڵایەتییـەکاندا، کـە دەبینـین ئاخاوتنەکە دەربارەی کۆمـەڵگای مەغریبیـە، نـەك جیـهانی عـەرەبیی. ئـەمڕۆ بـە دەگمـەن نـەبێت هاوشێوەی ئەمانە لە زمانی عەرەبییدا نادۆزینەوە، لـەم قۆناغەشـدا، واتـە کۆتـایی شەسـتەکان و سەرەتای حەفتاکان، ڕۆشنبیرە شەرعییەکان بریتی بـوون لـە ئوسـتادانی زانکـۆو هـەموو ئەوانـەی پـەیوەندییان بە وانە وتنەوەوە هەیە. بـەڵام بـاقی دەسـتەو تاقمـەکانی تـری وەك دکتۆرەکـان و ئەندازیارەکان و پارێزەرەکان، زۆرینەیان دەکەوتنە دەرەوەی چوارچێـوەی ڕۆشـنبیریە بەرهەمهێنـەرەکان لـە بـواری بەرهەمـهێنانی مەعریفییدا، بە جۆرێك ڕۆڵـی ئەمان بریتی بوو لە گەڕان بەدوای پێوەستکردنی شوناسەکەیانەوە بە دەسـەڵاتی دەوڵەتـەوە. ئـەم کایـە مەعریفییـە لاوەکییـە یەکەمینـەو بەرهەمهێنـەرەکانی ناویشـی، بەشـداری دەکـەن لـە کریسـتاڵەکردنی بیرۆکـەی بوونـی مـەغریب وەك قەوارەیـەکی جوگـرافی ومێژوویی و ڕۆشنبیریی و ژیاریی دەرکـەوتوو، لە کـاتێکدا ئەوسـاو ئێسـتاش گرفتـی لـەناوبردنی ئیمپریالیزم پێوەستە بە عەرەبایەتی و ئیسلامەوە.

لەم قۆناغـەدا گـران بـوو بـە زمـانی عـەرەبی قسـە لەسەر نەبوونی دەوڵەتی نیشتمانیی بکرێت، وەکو قـــەوارەو ڕۆشـــــنبیریی و پاشـــــکۆیەتی و" پاشکەوتوویی مێژوویـی" و داڕمـانی کـەلتوری و ژیـاریی، تـەنیا بـە دەسـتپێکردن لـەو بۆچوونـەوە نەبێت کە باڵی بەسەر کایەی ڕۆشنبیریی عەرەبیدا کێشاوە، واتە بە دەستپێك لە" نەتەوەی عەرەبیی" یـان" ئیسـلامیی" و یـەکێتی عەرەبییـەوە. ئـەم ژێدەرەی دواییـان کـە دواجار هـەموو بەرهـەمێکی ڕۆشنبیریی بە عەرەبیی کراو دیاری دەکات، بریتی بوو لە پێوانەی سەرەکی بۆ نکوڵیکردن لە چەمکی ڕۆشـنبیریی مـەغریبیی یـاخود مەغریبییـەکان، هـەروەها لـەم کایـە ڕۆشـنبیرییە ژێرینەیـە، بـەو حسێبەی کە بە زمانی داگیرکەر بەرهـەم هـاتووەو بەشـداریی دەکـات " لـە چەسـپاندنی هـەژمونی ڕۆشنبیرییانەی خۆرئاوادا" هـەروەها ڕۆشـنبیرانی کایـەی ڕۆشـنبیریی لاوەکـی دووەمـیش نکوڵییـان لێکرد، کە ئەوکاتە بە دوا شـەرعییەتێکدا دەگەڕان کە پێوەست بێت بە هیواو بەرژەوەندییەکانیانەوە، بە ڕەچاوی ئەوەی کە ڕۆشنبیرییەکی " بژاردەیی" نـــەك " گـــەلیی" بەرهـــەم دەهێنێـــت و " ڕۆشـــــنبیرییەکی هـــاتوو دەچەســـــپێنێت" ڕۆشـنبیرییەك کـە هیـچ پێوەسـتییەکی بـە گـەلی مەغریبییـەوە نییـەو" لێـی تێناگـات"( وەك ئـەوەی لـەوەی تـر تێبگـات)(**) و"سـودی لێ وەرنـاگرێت"، ئەمـە وەك بڵێـی ئـەو ڕۆشـنبیرییەی کـە بـە هـەر زمانێك نوسراوە، دەشیا جەماوەریی تر بێت ئەگەر لـە کۆمەڵگایـەکدا بڵاوبکرایەتـەوە کـە ڕێـژەی نـــەخوێندەواری تێیـــدا دەگاتـــە *65٪* ی دانیشـتوانەکەی. ئـەم نکوڵیلێکردنـە جگـە لـەوەی گوزارشـت بێـت لـە سـتراتیجەکانی ئـەو دەسـتەو تاقمـە کۆمەڵایەتییـە نوێیانـەی کـە بـە هیـوای ژوورهەڵکشـانی کۆمەڵایـەتی و بەدەسـتهێنانی پایەی کۆمەڵایەتی وەها کە گوزارشت لە هیواکانی ئەو دەستەو تاقمە هەڵکشاوانە دەکات، زیاتر لـە وەی گوزارشت لـە بەرژەوەندییـەکانی گـەلێك یـان نەتەوەیەك بکات.

**کایەی لاوەکیی دووەم:**

**ڕۆشنبیریی ڕەسەن و ڕیشەگەرا**

دوای تێپـەڕینی زیاتر لە بیست سـاڵ بەسـەر سەربەخۆیی مەغریبدا و، دوای ئەوەی پرۆسەی بە عـــەرەبیکردنی خوێندنـــی نوێـــی ســـەرەتایی و ئامـادەیی تـەواوکراو بەشـێکیش لـە خوێندنـی زانکۆیـی کـرا بـە عـەرەبی، بەتایبـەتی زانسـتە مرۆییـەکان (زانسـتە یاسـایی و سیاسـیی و فەلسـەفەو سۆسیۆلۆجیاو سایکۆلۆجیا و ئاداب و جوگرافیـاو مێـژوو،..هتـد) کایـەی ڕۆشـنبیریی مەغریبی لافاوێك کاڵای ڕۆشنبیریی لە خۆرهـەڵات بەرهەمـهێنراوی بەخۆیـەوە بینـی (بـە شـێوەیەکی تایبەتی میسر، لوبنان، عیراق). ئەمەش بووە هۆی کێبەرکێیـەکی تیژ لەگـەڵ کایـەی لاوەکـی یەکـەمدا بـەخۆی و بەرهەمـەکانی و بەرهەمهێنەرەکانییـەوە. ڕەوشـەکە وای لێـهات گریمانـەی سـتراتیجی نـوێ بکات، لەلایـەنی ڕۆشـنبیرانەوە. خەسـڵەتی دیـاری ئەم ڕەوشە بریتی بوو لە وەبـەرهێنانی ئەو گرفتـە ئایدیۆلۆجیانەی کە لە ڕەوشی پێش کایەکـەدا بە زمانی فەرەنسی خرابووە ڕوو ( واتە لە سەرەتای

سەربەخۆییەوە) وەك گرفتەکانی رەسەنایەتی و شوناس و تایبەتمەندێتی کە دەبوو لەبەر کۆتایی هاتنی رەوشی شەرعیانی خستنە روویانەوە لێیان تێبپەڕێنرێت، کە بریتیە لە رەوشی ئیمپریالیستییانە.

لافاوی کالاّ رۆشنبیرییەکان تەنیا لایەنی نوسراوی ئەم رۆشنبیرییەی نەگرتەوە (کە مەرجەکانی بەرهەمهێنانی دەگەڕێتەوە بۆ بونیادەکردنی کایەی رۆشنبیریی میسری، بەتایبەتی دوای شۆڕشی ناسرییەکان) بەڵکو لەوەش تێپەڕی بۆ لایەنە بینراوو بیستراوەکانی تریش وەك سینەماو تەلەفزیۆن بەتایبەتی. دەشێت ئەوەی لەم ئاستەدا لە مەغریب ئەنجامدرا، بەنیسبەتی سەرباقی هەرێمەکانی تری مەغریبی عەرەبییەوە تێبینی بکرێت، بەرادەیەك لەوێدا هاوکێشەیەك دروست بوو بۆ تێگەیشتنی باو کە بەپێی ئەوە بەرهەمی جەماوەریی خۆرهەلاّتی، مەبەستی لە خۆرهەلاّتی عەرەبییە و بە تایبەتی میسری، بەرامبەری بەرهەمی عەرەبی دەوەستێتەوە، بە جۆرێك کە دەتوانرێت جەماوەری سەرفکار وا ناو ببرێت کە ئەوەی میسرییە عەرەبییەو ئەوەی عەرەبییە میسری. ئەمە لەسەر ئاستی بەرهەمهێنانی جەماوەری، وەڵێ لەسەر ئاستی بەرهەمهێنانی مەعریفی، پرۆسەی بەعەرەبیکردنی هەندێك لە زانستە مرۆیی و کۆمەلاّیەتییەکان بووە هۆی باڵکێشانی بەرهەمی خۆرهەلاّتی و بە تایبەتی میسری (چونکە ئەو بەرهەمەی لە لوبنان خرایە بەردەست هەتا حەفتاکان پەرەی نەسەند) لە تویّی کتێب و نوسراوە درێژە زانکۆییەکانەوە ( وەرگێڕان یان پێشکەشکردن یان رانانی بیردۆز و پێڕەوەکان و پرۆگرامەکان هتد...) قەبارەی بەرهەمی میسریی بە بەراورد لەگەڵ بەرهەمی هەندێك لە دەوڵەتە عەرەبییەکاندا شایەتی ئەمەیە. بڕوانە خشتەی ژمارە (1)..

خشتەی ژمارە ( *1* ):

بڵاوکردنەوەی کتێب: ژمارەی کۆپییەکان بە پێی پۆلاندنی دەیی کۆکراوە ریز کراوە

| وڵات | ساڵ | سەرجەم | گشتی | فەلسەفە | ئایین | زانستە کۆمەڵایەتییەکان | زانستە پەتییەکان | زانستە پراکتیکییەکان | هونەرە جوانەکان | ئەدەب | جوگرافیاو مێژوو |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| مــیسر | 1978 | 53000 | 945 | 115 | 8669 | 6864 | 12372 | 1581 | 308 | 17685 | 3461 |
| کوێت | 1980 | 359 | 10 | – | – | 184 | – | 20 | 144 | 1 | – |
| لیبیا | 1978 | 2045 | 25 | 15 | 35 | 950 | 155 | 355 | 65 | 580 | 225 |
| قەتەر[1] | 1980 | 2205 | 75 | – | 554 | 29 | – | – | – | 10 | 4 |
| سودان[2] | 1979 | 12905 | 899 | – | 3093 | – | 2487 | 64 | 40 | 4152 | 2170 |
| سوریا[3] | 1979 | 283 | – | 11 | – | 64 | 8 | 4 | 11 | 55 | 8 |
| تونس[4] | 1979 | 2600 | – | – | 10 | – | 850 | 20 | – | 1480 | 240 |
| ئیمارات | 1979 | 35 | 10 | – | – | 15 | – | – | – | 5 | 5 |

*1*، *3*، *4* کتێبەکانی خوێندن و منداڵانیشی گرتۆتەوە.

*2* بەنیسبەتی ساڵانەی ئاماری یونسکۆ ساڵی *1982*، ل، *26* . دیسکی *6* کاری *321*.

تەســـــەورکردنی ئـــــەو کــــارە فیکریـــــی و ڕۆشنبیرییەی لە قۆناغی ناسرییزمدا[7]، لە میسردا بـڵاو بۆتـــەوە . دەوڵـــەت تـــەدارەکی ڕاسـتەوخۆی گرووپــی ڕۆشـــنبیرانی کـــرد، بـــە نوســـەران و هونەرمەندانیشـــــەوە، هتـــــد...) هـــــەروەها چالاکییــــەکانیانی تــــەوزیف کــــردو چــــاودێری بەرهەمەکانیشـیانی کـرد . پەرچدانــەوەی لەســـەر بونیـادەکردنی کایـەی ڕۆشـنبیریی لـە مـــەغریب هــەبوو، بەتایبــەتی لـــە حـــەفتاکاندا. ئــەم کایــە بەعەرەبیکراوەی دووەم بوو بە پاشکۆو ملکـەچی ئەو گرفت و مەسـەلانەی لـە خۆرهـەڵات دەخرێنـە ڕوو، هـەروەها شـێوازی چارەسەرکردنیشیان. ئـەم بونیادەکردنـــە هـــەمان ئـــەو پێوانانـــەی بەســـەر ڕۆشنبیرە مەغریبییـــەکاندا سـەپاند کـە کۆنـترۆڵی بازاڕی ڕۆشنبیرییان کردبوو: ئاخاوتن دەربـارەی شـتە گشـتییەکان و ئـەو وتـارو بانگەشـانەی کـە نـــاتۆرەی "عــــەرەبی" یــــان" ئیســــلامی" یــــان هەڵگرتبوو، بۆ نمونە ( گرفتەکانی ئۆمەتی عەرەبی . گرفتەکانی یەکێتی عەرەبی . ڕۆشنبیریی عەرەبی . کۆمەڵگای عەرەبی یان ئیسلامی... هتد) وایلێهات سەرکەوتنی بەرهەمی بازاڕ پێوەند بێت بە مەودای ڕەهــەندە عەرەبییەکــەی یـــان ئیســـلامییەکەیەوە، تەنانـەت ئەگــەر (ئەمــەش بالادەسـتە) ئاخاوتنەکـە دەربـــارەی ئـــەدگارەکانی هـــەرێمێك یـــان چـــەند هـــەرێمێکی دیـاریکراویش بێـت، بـێ ئـەوانیتر[4*]. ئیـــتر شــــەرعییەتی ڕۆشـــنبیریی بـــە نیســـبەتی بەرهەمهێنـــەری بەعەرەبیکـــەر لەلایـــەنی چـــەند وەســـــیتێکی خۆرهەڵاتییـــــەوە دەبەخشـــــرا ( بەشـێوەیەکی تایبــەتی بڵاوکـــەرەوەو ڕەخنـــەگرە لوبنانییــەکان). بێشـــك نرخـــی شـــەرعییەتەکەش بریتی دەبوو لەوەی چەندی بشێت لە سنورکردنی هەرێمایـەتی بەدووربێت. ئەم ڕەوشە بـوو بـەهۆی ئەوەی تاکە گوتاری[8] ئایدیۆلۆجی بریتی بێت لـە وتـاری ئـایدیۆلۆجی[9] گشـتی و بزریـی کایـــەی زانستیی لە بواری ڕۆشنبیریدا لە مەغریب.

لـە حەفتاکانـەوە بـواری ڕۆشـنبیریی مـەغریبی بـەوە دەناسـرێتەوە کـە لـەوێدا هـەر لقێـك بـەجیا ناکۆکی خۆی دەخاتە ڕوو. بۆنمونە دەربارەی تێزو پێشنیارە ئابوریی و سیاسیی و تەنانـەت فیکریـی و فەلسەفیی و ئەدەبیی و هونەرییەکان، ڕەهـەندی مەغریبیی لە کایەی لابەلای یەکەمدا بالادەستە کـە چـەندان لێکۆڵینـەوەی زۆر پێشـکەوتووی گرتۆتـە خـۆی دەربـارەی واقیعـی مــەغریبی، لــە کـاتێکدا دەبینـین ڕەهـــەندی عـەرەبی یـان ئیسـلامیی لـەناو ئایدیۆلۆجیـا و جۆشـاندنی هەسـت و سـۆزەکاندا نغرۆ بووە، وەك ئەوەی ئـەو ڕۆشـنبیرییە نـەتوانێت ڕەگ لـەناو ئـەو واقیعـەدا دابکوتێـت کـە کۆنـترۆڵی بەرهەمـهێنانی کـردووە، واتــە هەرێمایەتییــەکی ( پێوەسـت بـە خـەم و بایـەخدانێك کـە مـەرج نییــە هەموویان ڕەها بن) بێشك ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ ئـەو پـــەیوەندیی پاشــکۆیەتییەی کـــە ڕۆشـــنبیریی مەغریبیی خۆی تێدا دەدۆزێتەوە، هەروەها بۆ ئەو کاریگەرییەی لەسەر کایـەی مـەعریفی و سیسـتمی بەرهەمهێنانی جەماوەریی، هەیەتی، وەك لە بزریی ڕۆشـنبیرە مەغریبییـــەکان و ئـــەو ستراتیجانەشـــدا دیاریی کرا کە ڕۆشـنبیرە خۆرهەڵاتییەکان هـەڵیان چنیوە، بەتایبەتی میسرییەکان کە دەبینین باڵیـان بەســـەر هـــەموو ئـــەو دامودەزگـــاو ڕێکخراوانـــەدا

کێشاوە کە ڕەهەندێکی عەرەبی یان ئیسلامییان هەیە. لە ڕاستیدا، پێداگرتن لەسەر عەرەبایەتی و ئیسلامێتی، لەڕاستیدا لە یەکێك لەو هۆکارانەی ئەو ڕۆشنبیرانە بەکاریان دەهێنن، شتێکی تر نییە، بەپێی نەریتە ئابورییەکان و دەسەڵاتی ڕەمزیی شاراوە لە پشتی داواکارییەکانیانەوە بە عەرەبایەتی و ئیسلامێتی.

ئیتر بە نیسبەتی ڕۆشنبیرە مەغریبییە بەعەرەبکراوەکان مەشروعییەت لە خۆرهەڵاتی عەرەبییەوە دەهات، چونکە بڵاوبوونەوەی بەرهەمەکانی ڕۆشنبیرێکی مەغریبی لەسەر مەودای قبوڵکردنی ڕادەوەستێت لەلایەنی بڵاوکەرەوەو ڕەخنەگرە خۆرهەڵاتییەکانەوە، ئەوانەی دەسەڵاتی دیاریکردنی ئەو ئیشکالییەت و مەسەلانەیان هەیە کە قابیلی بڵاوکردنەوەو شۆرەت پەیداکردن نین، بێگومان لەنێوانی ئەم مەرجانەدا، یەکێکیان بریتییە لە قسەکردن دەربارەی شتێك کە نازناوی " عەرەبی یان ئیسلامیی" پێوەیە، هەتا ئەگەر ناواخنەکەش بەشێوەیەکی هەرێمایەتی دیاری کرابێت[*5]. یاساکانی داهاتی ئابوریی و ڕەمزیی سیستەمی بەرهەمهێنانیان چڕکردەوە (هەروەك خانەکانی بڵاوکردنەوە لە مەغریب ئاماژەی بۆ دەکەن، هەروەها ئەو تەنگوچەڵەمانەش کە هەندێك لە خانەکانی بڵاوکردنەوە لە مەغریب تووشی هاتوون لە گەیاندنی بەرهەمەکانیان بۆ بازاڕەکانی هەرێمە عەرەبییەکانی تر، هەروەها پاڵەپەستۆی خانەی بڵاوکردنەوەکانی خۆرهەڵات و تەنانەت فەرەنسییەکانیش کە کۆنترۆڵی بازاڕی کتێبیان کردووە) هەروەها بۆ تێکەڵاوکردن ( گەرچی لەتوێی بەرهەمی هاوبەشیشەوە بێت)[*6] لە سەنتەرەکانی بەرهەمهێنانی عەرەبیدا بەتایبەتی ئەوەی دەربارەی ڕۆشنبیریی مەعریفییە کە بەهۆی پێوەستبوونیەوە بە زانکۆو زانکۆکاران و دامودەزگا فێرکارییەکانی ترەوە، تەنیا دەرچووانی ئەو دامودەزگا فێرکارییانە دەگرێتەوە، بەتایبەتی ئەوانەی وەزیفەکانیان ئامادەیان دەکات بۆ سەرلەنوێ بەرهەمهێنانەوەی ڕۆشنبیریی مەعریفیی ( ئوستادەکان، ڕۆژنامەنوسان، تێکۆشەرانی پارتە سیاسییەکان، ... هتد).

3. بەعەرەبیکردن و بەمەغریبیکردن و سەرلەنوێ ڕێکخستنەوەی گەمەی ڕۆشنبیرایەتی:

پەرەسەندنی خوێندنی زانکۆیی نەك لەڕووی ژمارەی خوێندکاران و نەك لەڕووی ئوستادە مەغریبییەکان و بەعەرەبیکردنی خوێندنی ئامادەیی ( بەتایبەتی ئەو مادانەی ناویان لێنراوە کۆمەڵایەتییەکان) و زانستە مرۆییەکان و کۆمەڵایەتییەکان لە کۆلێجەکان و پەیمانگا باڵاکان و سەنتەرەکانی دروستکردنی ئوستادو مامۆستاکان ( جگە لە زانستی ئابوریی) بووەتە هۆی سەرلەنوێ ڕێکخستنەوەی گەمەی ڕۆشنبیریی لە مەغریب. بەمجۆرەو لە ناوەڕاستی حەفتاکانەوە کایەی ڕۆشنبیریی و ڕۆشنبیرگەرایی لە مەغریب چەند وەرچەرخانێکی بەخۆیەوە بینیوە کە پێکهاتەی نوێی مەعمیلەکان (کڕیارەکان) و بەرهەمهێنەرەکان داوای دەکات، ئەوانەی وایان لێهاتووە جەخت دەکەنە سەر داواکردنی ڕۆشنبیرەکردنێکی

مەعریفی بەعەرەبیکراو. ئەم رەوشە نوێیە بووەتە هۆی بەرزبوونەوەی ژمارەی بەرهەمهێنەران و ئەوانەی راسپێردراون بە سەرلەنوێ بەرهەمهێنانەوەو هەروەها سەرفکارانیش.

ئەم گۆڕانکارییە مۆرفۆلۆجییە لە دەستەی وانەبێژان و جەماوەری خوێندکاراندا، کاریگەرییەکی زۆری هەبووە لەسەر سنورکردنی سەرانسەریی کایەی بەرهەمهێنانی مەعریفیی و ئەوەش بە زامنکردنی بەرهەمی ئەوانەی ئامادەیی و توانایان تێدایە بۆ قبوڵکردنی ئەم رۆشنبیرییە بەرهەمهێنراوە لەلایەك و، لەلایەکی تریشەوە زامنکردنی بەرهەمی ئەو بکەرانەی دەتوانن سەرلەنوێ بەرهەمی بهێننەوە یان نوێی بکەنەوە. بەمجۆرە ناتوانین لە رەوت و وەزیفە کۆمەڵایەتییەکانی کایەی بەرهەمهێنانی مەعریفیی تێبگەین هەتا ئەو پەیوەندییانە شی نەکەینەوە کە ئەم کایەیە دەبەستێتەوە بە دەزگا راسپێردراوەکانەوە ( بەتایبەتی سیستمی خوێندن)، بە زامنکردنی سەرلەنوێ بەرهەمهێنانەوەی رەوتێك لە بۆچوونەکانی کارکردن و گوزارشتکردن و پێکهێنان و ئەندێشەکردن و دەرکپێکردن و هەڵسەنگاندن کە لە پێکهاتەی کۆمەڵایەتیی مەغریبیدا دەست دەکەوێت. ئەم رەوشە یاریدەی سەربەخۆییەکی رێژەیی کایەی بەرهەمهێنانی مەعریفیی داوەو ئەمەش وای لە رۆشنبیرە مەغریبییەکان کردووە دەرك بە خۆیان بکەن وەك " داهێنەران" داوای دەسەڵات بکەن بەهۆی ئەو کارێزمایەوە کە وەکو بەرهەمهێنەرانێك هەیانە، کە تێدەکۆشن بۆ سەپاندنی دەسەڵاتێك لە بواری رۆشنبیریدا کە دان بەهیچ پرەنسیپێکی تری شەرعییەتدا نانێت جگە لە خودی خۆی ( یاخود دەسەڵاتی گروپە لێکچووەکانی هاوڕێیان کە ژمارەیان سنوردارە)، وای لێهاتووە پەیوەندیی بابەتیی لە نێوانی کایەی بەرهەمهێنان و سیستمی خوێندندا لەلایەکەوە پشتی گیراوەو لەلایەکی تریشەوە روون نییە بەهۆی چالاکیی ئەو میکانیزمە کۆمەڵایەتییانەی هەوڵ دەدەن بۆدابینکردنی چەشنە سازانێك کە پێشتر لەنێوانی پایەکان و پڕکەرەوەکانیاندا هەبووە ( لابردن و لابردنی خودیی، پێکهاتەی پێشووتر و ئاراستەیەکی خێزانی پێشووتر، پۆڵبەندیی چینایەتی ... هتد) کە یان ئاراستە



پێیر بۆردیۆ

دەکرێت بەرەو ئاسایشی تایبەتی دیاریکەری رەوتی " فەرمانبەری رۆشنبیر" دیاریی دەکات، یاخود بەرەو سەرچڵیی پرشنگدارانە کە پەیوەندییان بە پرۆسێسی رۆشنبیریی یان هونەریی سەربەخۆوە هەیە. بۆیە پێویستە ئاماژە بکەین بۆئەوەی رۆشنبیرە مەغریبییەکان، چ ئەگەر لەلایەنی دەوڵەتەوە بەکارهێنرابن یان سەربەخۆ

بن، لە کایەی دەسەڵاتدا شوێنێك داگیر دەکەن کە کۆنترۆڵی کراوە.

ئەم وەرچەرخانە نوێیانە، بونیادیی و مۆرفۆلۆجیی، دەبنە هۆی ئامادەبوونی چەند نمونەیەك لە ڕۆشنبیران لە کایەی ڕۆشنبیریداو بوونی ستراتیژی نوێ کە پەیوەندیی بەرهەمهێنانی مەعریفی بە کایەی بەرهەمهێنانی جەماوەرییەوە دیاری دەکات. دەشێت گرنگترینی ئەم نمونانە لەم چەشنانەی خوارەوەدا دیاری بکەین:

**-ڕۆشنبیری عەرەبگەرا:**

بریتیە لەو ڕۆشنبیرەی کە یان بەهۆی پێکهاتە خۆرهەڵاتییەکەیەوە یان پێکهاتە لۆکالە بەعەرەبکراوەکەیەوە بەرهەم دەهێنێت، چ بەهۆی کتێب و کۆڕەکانەوە بێت یان ئەو وتارانەی لە گۆڤارە خۆرهەڵاتییەکاندا بڵاو دەبنەوە، بەتایبەتی گۆڤارە عێراقی و لوبنانی و کوێتییەکان. ئەم ڕۆشنبیرە تەنیا دەربارەی ئەوە دەدوێت کە نازناوی عەرەبی یان ئیسلامی یان عەرەبگەرایی، هەروەها ئەم مەسەلە گشتییانەی کە وەڵامی جەماوەری بەرین دەدەنەوە زیاتر لەوەی وەڵامی هاوکاران و کایەی بەرهەمهێنانی مەعریفی بدەنەوە. ئەم قسەیە بە دەستپێك لەو شەرعییەتەوە دەبێت کە سەرلەنوێ بەرهەمهێنانەوەو گشتاندنی زانستە نوێیەکان یان دێرینەکان بۆ وتەکانی خۆیان ( فەتواکانی خۆیان). ئەم گوتارە بە زۆری لە واقیعی بەرهەست دوور دەبێت و بەجۆرێك ئاڕاستە دەکرێت کە گرەوەکە بریتی بێت لە زۆرترین ژمارەی سەرفکاران.

**-ڕۆشنبیری "وەرچەرخاو":**

بریتیە لەو ڕۆشنبیرەی لە بوارێکی ڕۆشنبیرییەوە وەرچەرخاوە بەرەو بوارێکی ڕۆشنبیریی دیکە. لێرەدا سێ چەشنە ڕۆشنبیری وەرچەرخاو دەبینینەوە:

.ئەوانەی پێش ڕوودانی گۆڕانکارییە بونیادی و مۆرفۆلۆجییەکانی کایەی ڕۆشنبیریی بوونیان هەبوو (بەعەرەبیکردنی خوێندن، بەرزبوونەوەی ژمارەی کارگەران و بەرهەمهێنەران و موعیدەکان بۆ بەرهەمهێنانی بەعەرەبیکراوەکان،.. هتد) لەکایەی لاوەکیی یەکەمدا ( بەرهەمهێنان سەرفکردن بە زمانی فەرەنسی) کە دواتر ئاوێتەی کایەی لاوەکی دووەم بوون، بێگومان لەگەڵ دەسبەرداربوونی ئاسۆی فیکریی و بەرهەمی مەغریبی و دەسبەرداربوونی خوێندنی زانستییانەی واقیع وەك تەنازولکردنێك بۆ فشارەکانی یاسای بازاڕی ئەم کایە ڕۆشنبیرییەی دووەم ( لە جەماوەری بەرینی ناتایبەتمەند).

.ئەوانەی لەبەر هەمان ئەو هۆیانەو چەند هۆیەکی تریش لە کایەی فیقهو شەریعەتەوە وەرچەرخان بەرەو کایەی زانستە کۆمەڵایەتی و مرۆییەکان ( زانستە یاساییەکان، زانستە سیاسییەکان و فەلسەفە، سۆسیۆلۆجیا، سایکۆلۆجیا، زانستەکانی پەروەردە، هتد).

.ئەوانەی لە زانستە سروشتی و پەتییەکان و ئۆرگانییەکانەوە بەرەو بواری ئایین و سیاسەت وەرچەرخاون. لەبەرئەوەی ڕۆشنبیریی زانستیی بەهۆی بزریی کایەی زانستیی لە دەمەتەقێ و

گفتوگۆکانی ناو ساڵۆنەکان و بوارو کۆبوونەوە گشتییەکاندا برەوی نییە، بۆیە ناچاربوون بیرکردنەوە گوتاری لەمەڕ فەلسەفەی زانستەکان یان تێرامانی تیۆلۆجیا - یەزدانگەرایی(***) . میتافیزیایی دەربارەی بوونی مرۆڤ لە گەردونداو چارەنوسی مرۆڤایەتی و پەیوەندیی بونەوەر بە خوداکەیەوەو چاکەی جێبەجێکردنی فەریزەتە ئاینییەکان لەرووی زانستییەوە (رۆژو، نوێژ، دەستنوێژ، حەج، ... هتد) وەربچەرخێنن.

چەشنی دووەم و سێیەم لەو رۆشنبیرە وەرچەرخاوانە، لە دەزگا رەسمییەکانی دابەشکردن و بڵاوکردنەوەی رۆشنبیرییدا، شەرعییەتیان وەرگرتووە. ئەم جێگایەی ئێستاشیان وای لێکردوون گرەو بکەن لەسەر کایەی بەرهەمهێنانی جەماوەریی. رۆشنبیریی ئەم چەشنەی دووەم ( لە بواری زانستە مرۆییەکاندا) و چەشنی دووەم ( لە بواری فیقهو شەریعەتدا) رۆشنبیرییەکی خۆدروستکەرە یان نیمچە خۆدروستکەرە، کە لە دەرەوەی بواری زانکۆیی نوێدا دەستیان کەوتووە، چ لە توێی خوێندنەوە بەراییەکانەوە بێت یان لە توێی میراتێکی خێزانیی (ئاینیی) ەوە.

.رۆشنبیر – تۆژەر: ئەم چەشنەی سێیەمی رۆشنبیران تازە پێکهاتووەو زیاتر پێ دادەگرێت لەسەر ئەوەی بە واقیعەوە بنوسێن و بەشێوەیەکی زانستیی لێی بکۆڵنەوە. نیشانەی دەرکەوتنی ئەم چەشنە نوێیەی رۆشنبیران بریتییە لە بەرزبوونەوەی زیاتر و زیاتری ژمارەی کۆمەڵەکان یان ئەو گرووپانەی ناوی کۆمەڵەی لێکۆڵینەوە لە... یان گروپی لێکۆڵینەوە لە... یان کۆمەڵەی مەغریبیی بۆ ... وەردەگرن. ئەم چەشنە رۆشنبیرانە گرەو لەسەر هێنانە کایەی بوارێکی زانستیی دەکەن کە هێشتا لەبەردەمی هەژمونی کایەی ئایدیۆلۆجیدا بزرە، ستراتیجەکانی ئەو رۆشنبیرانە دیاری دەکات لە بەدەستهێنانی دانپیانانی فیکری و زانستیی پەتیدا.

پەیوەندیی نێوانی ئەم هەموو چەشنەی رۆشنبیران بە کێشەو ململانێ لەپێناوی داگیرکردنی چەند جێگایەك ( یان پلەو پایەیەك) دیاریی دەکرێت، کە سەرپشکمان دەکات لە پێناسەکردنی ئەوەدا کە شەرعییەو ئەوەش کە شەرعیی نییە. بۆ نمونە دەشێ لە توێی رەوتی رۆشنبیریی و فیکریی و کۆمەڵایەتیی رۆشنبیرێك لە نمونەی یەکەم " عەرەبایەتی" کە بریتییە لە محەمەد عابید جابری، هەست بەو کیشمەکێشە بکرێت، لەگەڵ رۆشنبیرێك لە نمونەی دووەمدا " وەرچەرخاو" کە عەبدولا عەرەوییە، لەگەڵ ستراتیجە فیکریی و کۆمەلایەتییەکەشیاندا. بەرهەمی هەریەکێکیان تووشی هەمان ئەو مەسەلەو بابەتانە دەبێت، بەڵام هەریەکەیان خۆی لەویتر نەبان دەکات و تەنانەت لەسەرچاوەکانیشیاندا ناوی یەکتری ناهێنن.

ئەگەر پەیوەندییە پێکهێنەرەکانی کایەی هەڵوێستە رۆشنبیرییەکان گوزارشت لە مانای وەزیفەی خۆیان بە تەواویی نەکەن، هەتا نەیانگێڕینەوە بۆ کایەی پەیوەندیی لەنێوانی ئەو جێگایانە (یان پلەو پایانەدا) کە ئەوانە داگیریان دەکەن کە بەرهەمیان دەهێنن و بەرهەمی

دەهێننەوە یان بەکاریان دەهێنن، چونکە وەرگرتنی هەڵوێستە فیکرییەکان یان سیاسییەکان یان هونەرییەکان هەمیشە ستراتیجی نەستیین لە گەمەیەکدا کە گرەوەکەی بریتییە لە بەدەستهێنانی شەرعییەتی رۆشنبیریی یان فیکریی، یان ئەگەر بمانەوێت لە بەرهەمهێنان و بەرهەمهێنانەوەدا قۆرخکردنێك دابین بکەین و کاڵا رەمزییەکان و دەسەڵاتی توندو تیژی رەمزی و شەرعیی پێوەست بەوەوە بخەینە ژێر رکێفی خۆمانەوە. ئێستا شەرعییەتی رۆشنبیریی یان فیکریی وەك "پێوانەی بنەڕەتی" کایەی بەرهەمهێنانی عیرفانی وەهایە، کە خەریکە لە مەغریب بە چۆنیەتیەکی سەربەخۆ دروست دەبێت.

کایەی بەرهەمهێنانی مەعریفی کە چەشنە سەربەخۆییەکی هەیە دەگەڕێتەوە بۆ ئەو دەسەڵاتەی کە پەیدای کردووە بۆ ئەوەی خۆبەخۆ پێوانەکانی بەرهەمەکەی و هەڵسەنگاندنیشی ئەنجام بدات، کردوویەتی بە کایەیەك وەك کایەیەکی داخراو بکەوێتە ڕێ، کێبەرکێکردن لەپێناوی شەرعییەتی رۆشنبیریی یان فیکرییدا، واتە لەپێناوی نرخاندن و نرخانکردنی رۆشنبیرییانەی پەتی و لەپێناوی دەسەڵاتی رۆشنبیریی یان فیکریی پەتیشدا، بۆ پێشکەشکردنی ئەم نرخاندنە یان تەرخانکردنە. ئاراستەی ئەم کایەیە وای لێهاتووە بەوە جیا دەکرێتەوە کە بەرەو سەربەخۆییەك دەڕوات لەوەی وەزیفەی " رەخنەگرەکان" و خوێنەرەکان" (ئەوانەی کە لەناو دەستەی بەرهەمهێنەرەکاندا خۆیان هەڵدەبژێردرێن) چیتر بریتی نیە لە بەرهەمهێنانی هۆکارەکانی موڵکایەتیکردن کە کاری بەرهەمهاتوو داوای دەکات، ئەمەش هەتا زیاتر لە جەماوەری فراوان دوور بکەوێتەوە، بەڵام پێشکەشکردنی لێکدانەوەی "ئەفرێنەر"ی وەها کە قابیلی بەکارهێنان بێت لەلایەنی ئەفرێنەرەکانەوە.

لەم رەوشە نوێیەدا، گروپەکانی " پێکسەرسامبوون" سەریان هەڵداو چەند گۆشەیەکی بچووکی داخراویان بەسەر خۆیاندا داگیرکرد (بۆنمونە، یەکێتی نوسەرانی مەغریب، پاشکۆ رۆشنبیرییەکانی رۆژنامەکان کە تەرخان کراون بۆ خوێنەران.. هتد) لەوکاتەوەی کە نیشانەکانی پشتیوانی نوێ لە نێوانی بەرهەمهێنەرو رەخنەگردا دەستی کرد بە دروستبوون ( ئەو رەخنەیەی وای لێهاتووە لە کایەی رۆشنبیریی مەغریبیدا بە "خوێندنەوە" دەناسرێت، خوێندنەوەیەك لە دەق یان کتێب یان بیری فلاندا...) ئەم زنجیرە خوێندنەوانە بەوە جیادەکرێنەوە کە لایەنگیرییەکی بێ مەرجیان هەیە بۆ خزمەتی دانەر، یان بیریار، یان ئەفرێنەر، یان بانگەشەکەر[7*] ئەوەش بە هەوڵدان بۆ شیتەڵکردنی مەتەڵەکانی مەبەستەکەی دوای ئەوەی هەستی کرد چیتر بواری ئەوەی پێنادرێت بە ناوی رەمزێکەوە کە لەسەری ریککەوتبن، چەند حوکمێك بدات، کە ئەمەش وایلیکرد جەماوەری نابەرهەمهێن لەگەمەکە بکاتە دەرەوە، ئەگەرچی ئەمەش تەنیا بە سەلماندنی ئەوەی کارەکە بەهۆی لیکدانەوەوە یان خویندنەوەوە، قابیلی تیگەیشتنە.

ئەوەی گومانی تێدا نییە پەرەسەندنی یەکە نوێیەکانی بەرهەمهێنانی بەکۆمەڵ نەك تەنیا لە بـــواری رادیـــۆو تەلـــەفزیۆن و ســـینەماو رۆژنامەگەریدا، بەڵکو لە بواری لێکۆڵینەوەی زانستیشدا، هەروەها پاشەکشەکردنی پیشەی فیکریی پێوەست بەم پەرەسەندنەوە لە قازانجی بەکرێداندا، هەموویان لەم ساڵانەی دواییدا بوونەتە هۆی گۆڕانی پەیوەندیی بەرهەمهێن بە بەرهەمەکەیەوە، لە هەمان کاتیشدا گۆڕانی ئەو تەسەورانەی کە ئەم بەرهەمهێنەرە هەڵی گرتووە دەربارەی جێگاو وەزیفەی خۆی لە بونیادی کۆمەڵایەتی و ئەو ئایدیۆلۆجیا فیکریی و سیاسیی و ئیستاتیکیانەشدا کە بانگەشەیان بۆ دەکات. کاری فیکریی(*8) زیاترو زیاتر شێمانەی ئەوەی دەوری خۆی بەو خەرمانە کارێزماییە بگرێت، لەدەست دەدات کە ئەوسا پێوەست بوو بە ئەدیب (یان شاعیر) یان مەلاو زانای تەقلیدییەوە، ئەو بەرهەمهێنەرە بچووکە سەربەخۆیە، کە خۆی خاوەنی هۆیەکانی بەرهەمهێنانی خۆی بوو، کە تائێستاش هەر پێوەستە بە رۆشنبیرە زانکۆییەکانەوە. بەتایبەتی لە کۆلیجەکانی ئاداب و شەریعەت و ئوسوڵەکانی ئایینداْ. لەبەر بزریی ئەو یەکە بەرهەمدارییە گەورانەو ئەو هۆیانەی کارکردن کە پێویستیان پێیانە(*9). ئەو رۆشنبیرانە جگە لە سەرمایەیەکی رۆشنبیریی زیاتر شتێکی تریان نییە کە ئامادەن وەك دیارییەکی یەزدانیی دەرکی پێ بکەن.

رووتکردنەوەی بابەتییانەو خودییانەی چالاکیی فیکریی و رۆشنبیریی پێوەست بەو وەرچەرخانەوە لە مەرجە کۆمەڵایەتییەکانی بەرهەمهێناندا، بە شێوەیەکی تایبەتی ئەوانەی گرتۆتەوە کە پێیان دەوترێت " رۆشنبیرە مولتەزیمەکان" ( یان لێپرسراوەکان وەك حەزدەکەن وا بەخۆیان بڵێن) ئەوانەی خزاونەتە ناو یەکەکانی بەرهەمهێنانی رۆشنبیریی بەرفراوانەوە ( رادیۆ، تەلەفزیۆن، رۆژنامەگەریی، هتد...) هەروەها ئەوانەی ئەم حاڵەتە پاڵیان پێوە دەنێت بۆ هەستکردن بە ناکۆکی لە نێوانی ئەو هەڵوێستە سیاسیی و فیکریی و ئیستاتیکییانەی وەرگیراون و، ئەوانەشی کە واقیعی نزم و پەراوێزیی لە کایەی بەرهەمهێناندا پێویستی پێیانە، هەروەها لەنێوانی ئەو وەزیفانەی بەشێوەیەکی بابەتیانە پارێزگارن (چ لەرووی سیاسیی یان ئاکاریی یان فیکریی یان ئیستاتیکییەتی بەرهەمەکانی چالاکییەکەیان).

قورسایی رێژەیی روو لە زیادبوونی دەستەوتاقمە جیاجیا بەشدارەکان لە سیستمی بەرهەمهێنانی رۆشنبیرییدا، لە سەرەتای هەشتاکانەوە گۆڕانێکی تایبەتی بەخۆیەوە بینیوە: تاقمە تازەکای بەرهەمهێنەرە بەکرێگیراوەکان کە پێوەستن بە بەرزبوونەوەی بایەخی ئیزگەو تەلەفزیۆن و رۆژنامەگەریی، زیادبوونێکی گەورەی بەخۆیەوە بینی. هەمان شتیش لە دەستەی فێرکردن و وانە وتنەوەدا روویدا. ئەم گۆڕانکارییە مۆرفۆلۆجییانە کە هاوشانی گەشەکردنی دەزگای تازەن بۆ رێکخستنی ژیانی فیکریی ( لیژنەکانی بیرکردنەوەو لێکۆڵینەوەو.. هتد) لەگەڵ تەرزە نوێیەکانی پێکەوە بەردەوامبوون (کۆڕ، دیمانە،

دەمەتەقێ، نمایيش.. هتد) هەموويان كاردەكەن بۆ دەركەوتنی چەند چەشنێكی نوێ لە ڕۆشنبیران و هێنانە ناوەوەی تەرزە نوێیەكانی بیركردنەوەو گوزارشتكردن و بابەتی نوێ و شێوازی نوێ بۆ تەسەوركردنی كاری فیكریی و ڕۆشنبیریی و بەهەمان شێوە دیاریكردنی وەزیفەی ڕۆشنبیر لە كۆمەڵگادا. دەشێ ئەم گۆڕانكارییانە (لەپاڵ زۆر زیادبوونی ژمارەی ئەو خوێندكارانەی لە حاڵەتی " ڕۆشنبیری تازە دەستپێكردوو" دان، كاریگەرییەكی سەرەكی هەبوو، ئەویش پەیداكردنی جەماوەرێكی گرنگ بۆ ئەو بەرهەمە" پیشكەوتووە"، جەماوەرێك كە بەشداری دەكات لە پاساودانی گەشەكردن و چالاكیی وەزیفییانەی چەند دەزگایەكی تایبەتیی بەرهەمهێنان و بڵاوكردنەوە، هەروەها بەشدارییش دەكات لەداخرانی كایەی ئەو ڕۆشنبیرانە لەناو هەمان كایەی مەعریفییدا هەن.

كایەی بەرهەمهێنانی جەماوەریی و دەركەوتنی ڕۆشنبیرییەكی نێوەند

كایەی بەرهەمهێنانی جەماوەریی بوارێكی فراوان پێكدەهێنێت بۆ كێبەركێ و قۆرخكردن و لێرەدا بەرهەمهاتووە خۆرهەڵاتییەكان پێشەنگن، چ بەنیسبەتی تەلەفزیۆن یان سینەما یان ڕۆژنامەگەریی یان گۆرانی یان كتێبەوە بێت. دەشێت لە مەرجە ئابوریی و كۆمەڵایەتییەكانی بەرهەمهێنانیانەوە، بونیادی بەرهەمی ئەو كایەیە هەڵبهێنجین. ئەگەر تێگەیشتنە باوەكە بەتایبەتی لای ڕۆشنبیران پێی وابێت كە ئەو ڕۆشنبیرییە بریتیە لە گوتارێكی یەكخراو كە بۆ جەماوەرێكی یەكخراوو ڕێكوپێك بەرهەمهاتووە، ئەوا پێویستە بەپێچەوانەوەی ئەمە ئەم گوتارە وادابنێین كە گوتارێكی تایبەتەو بۆ جەماوەرێكی ناتایبەت لە ڕووی كۆمەڵایەتییەوە، بەرهەمهێنراوە، تەنانەت ئەگەر زەرورەت داواش بكات كە سانسۆرێكی خودی بەرنامەرێژكراو بسەپێنرێت كە ببێتە هۆی سڕینەوەی هەموو نیشانەو فاكتەرەكانی تایبەتێتی. ئەم ڕەوشە ڕۆشنبیرییەكی نێوەندی قوت كردۆتەوە كە لە شێوە ئیدیاڵەكەیدا ئاڕاستەكراوە بۆ جەماوەرێك بەزۆریی بە ناوەڕاست ناودەبرێت. ئەم ڕۆشنبیرییە لە جوانكاریی و بۆچوون و لۆجیك و شەرعییەتیدا ملكەچە بۆ ڕۆشنبیریی نێوەندی تێپەڕی جیهانی عەرەبی یان فرە ڕەگەزنامە ( كە لە میسر یان لوبنان یان لە كەنداوی عەرەبی یان سایبرس یان لە یۆنان یان لە لەندەن یان لە پاریس.. هتد بەرهەمهێنراوە) ئەم ڕۆشنبیرییە تەنانەت ئەو كاتەش كە ئاڕاستە دەكرێت بۆ گروپێكی سنوركراو لە دەرەوەی بەرهەمهێنەرەكان ئەوا بەر جەماوەرێكی لەڕووی كۆمەڵایەتییەوە ناڕێكو پێك دەكەوێت، چ بەشێوەیەكی ڕاستەوخۆ یاخود بە چەشنە جیاوازییەكی زەمەنیی ( ئەمە حاڵی سەرلەنوێ وەبەرهێنانەوەی نوسینە ئیسلامییەكانە بۆ سەرەتای ئیخوان موسلیمینی میسر بۆ نمونە، هەروەها لە مەغریبیش لە كۆتایی حەفتاكانەوە، هەروەها بەنیسبەتی ڕۆشنبیریی خێڵەكی ئەریستۆكراتیشەوە هەر وایە، كە بە شێوەیەكی چڕ وەبەرهێنراوەتەوەو لەتوێی كەناڵەكانی تەلەفزیۆنەوەو لەشێوەی زنجیرەی

ئایینی و مێژوویی و سۆزییەوە بڵاوکراوەتەوە، کە هیچ پەیوەندییەکیان بە واقیعی ئایینی و کۆمەڵایەتی و مێژوویی کۆمەڵگای مەغریبییەوە نییە).

ئەو رۆشنبیرییە نێوەڕاستە مێژووی نییە، تاکە مێژووی ئەو ئەوەیە کە گۆڕانکاری تەکنیك و یاساکانی کێبەرکێ بەسەریدا دەسەپێنێت. لەبەرئەوە توانای نییە داوای سەربەخۆیی خۆی بکات، چونکە (بەنیسبەتی ئەوانەوە کە بەکاری دەهێنن ) بەشێکی گرنگ لە جوانی و فەزیلەتەکەی دەگەڕێتەوە بۆ رەوانەکردن بەرەو رۆشنبیریی جیهانیی کە ئەمی گۆتۆتە خۆی و ڕێگای پێدەدات نوێنەرایەتی ئەو رۆشنبیرییە بکات. دەکرێت ئەمە لەو چەشنە دیارەی رۆشنبیریی ناوەڕاستدا ببینین کە بریتیە لە" خواستنەوە": کاری سینەمایی خواستراو لە شانۆیی مەغریبیی یان عەرەبیی یان جیهانیی، پارچە مۆسیقا یان گۆرانی خواستراو لە مۆسیقای جیهانیی خۆراواییەوە.. هتد.

دەزگا شەرعییەکانی بەرهەمهێنانی ئەو رۆشنبیرییە ناوەڕاستە ( رادیۆ، تەلەفزیۆن، رۆژنامەگەریی، سینەما، بۆنەکان.. هتد) وایان لێهاتووە پەنا دەبەنە بەر دەسەڵات باڵا زانکۆییەکان بەمەبەستی بەرزکردنەوەی پایەی خۆیان و چەسپاندنیان ( بۆنمونە بانگکردنی ئوستادەکانی زانکۆ و پسپۆڕەکان بۆ بەشداریکردن لە بەرنامە ئێستگەیی یان تەلەفزیۆنییەکان یان لەسەر لاپەڕەی رۆژنامەکان یاخود کۆمەڵە سیاسیی یان سەندیکاییەکان.. هتد). ئەم رۆشنبیرییە ناوەڕاستە وای لێهاتووە نازناوە زانکۆییەکانیش بەکاردەهێنێت، لەبەر ئەو کاریگەرییەی ئەو نازناوانە لەسەر ئەندێشەی جەماوەری بەرهەم نەهێن هەیەتی: بۆ نمونە "دکتۆر فلانمان داوات کرد..."، "بە پێنوسی دکتۆر فلان.." هتد، بەکارهێنانی ئەو دەسەڵاتە رەمزییەی کە خوێندنی زانکۆ کەڵەکەی دەکات، دەچێتە چوارچێوەی ئامانجە ستراتیجییە. هەستی و نەستییەکەیەوە، کە ئەویش بریتیە لە ئامادەکردنی جەماوەری مەبەست بۆ دانپیانانی رۆشنبیریی بەواندا. کێشانی شاشەیەك لە شەرعی خۆی لەخۆیدا گەواهیی ئەو نیگەرانییە دەدات کە پەیوەندیی بەو سێنتەرەوە هەیە کە هەژمونی خۆی بەسەر چەشنێکی نوێی رۆشنبیران یان نیمچە رۆشنبیراندا دەکێشێت، ئەوانەی چارەنوسی خۆیان بەستۆتەوە بەو دەزگایانەوە. لێرەدا کار بۆ ئەوە دەکرێت کە بتوانن ئەو نازناوە خوێندگاییانە بەکار بهێنن بۆ خزمەتی خۆیان، تەنانەت لای ئەوانەش کە بەپێی پلەو پایەی خۆیان پێویستییان بەوە نییە. مەبەست لە کەڵەکەبوونی نیشانە راستەقینەکان یان ساختەکانی شەرعییەت بریتیە لە باوەڕکردن بەبەهای ئەوکەسەی بایەخ بە مەسەلەکە دەدات، هەروەها باوەڕکردن بە



جەمال عەبدولناسر

زانیارییەکەی یان ئەو وتانەی کە قازانجیان لێ وەردەگرێت. هەمەچەشنیی بەڵگە پێشکەشکراوەکان (بڕوانامەکان، وەزیفەی جیاجیا، مەدالیاکان، خەڵاتەکان.. هتد) یەکسەری ئەندیشەیەک بۆ شەرعییەتی ڕۆشنبیریی وەکو گروپێکی قەبارە گەورە لە جیاکارییە خۆدەرخەرەکان زیاتر لەوەی وەکو بەهایەک دابنرێت کە پێوەستە بە شارەزاییەکی سەلمێنراوەوە. ئەم نیگەرانییە لەسەر شەرعییەت کە دەشێت هەتا ئاستی تەزویرکردنیش بڕوات[10] بەشێوەیەکی سروشتی هەڵبژاردنی دامودەزگا نێودارەکان دەسەپێنێت. ئەمەش بەڵگەیە بۆ باڵادەستیی ئەو ڕەمزییەتەی کە کایەی فیکریی و زانکۆیی لەناو کایەی ئەو دامەزراوە زانکۆییانەدا، لەسەر ئەم ڕۆشنبیرییە ناوڕاستە مومارەسەی دەکات.

### هەندێك پێشنیاری مەنهەجی بۆ لێکۆڵینەوەی بازاڕی ڕۆشنبیریی و ستراتیجی ڕۆشنبیران

ئەم دابەشکردنە ڕۆشنبیرییەی ئێستا بۆ کایەی ڕۆشنبیریی لە مەغریب و ڕەخنەگرتن یان "خوێندنەوە"ی ئەو کارانەی کە لەناو کایەکەدا سەرهەڵنادەن، یاریدەمان نادەن بۆ ئەنجامدانی لێکۆڵینەوەی جیای ئەو سیستمی بەرهەمهێنانەی لێوەی کایەی ڕۆشنبیریی لە مەغریب پێکدێت.

ئەو پڕۆژەیەی ئێمە پێشکەشی دەکەین هەوڵ دەدات لەو چەشنە نزیککەوتنەوە باوانە تێبپەڕێت، یان ئەوانەی لەسەر ئاماژەدان بە نوسەرەکە یان دانەرەکە یان بانگەشەکەرەکە دامەزراون (پیاوەکەو کارەکانی)، ئەم ئاماژەپێدانە ئامـاژەپێدانێکی سنورکراوە لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە، هەروەها ئەم پڕۆژەیە هەوڵ دەدات لە سنورکردنی لێکۆڵینەوەی بازاڕی ڕۆشنبیریی لەناو براندنی وەزعییانەدا، تێبپەڕێنێت ( ڕێژەکانی بەرهەمهێنان)، مۆرفۆلۆجیای بەرهەمهێنەرەکان، پەرەپێدانی نرخەکان.. هتد).

دەتوانین بۆ لێکۆڵینەوەی جوڵانەوەکانی بەرهەمهێنان، گۆڕانی ژمارەی ناونیشانە نێودارەکان هەڵبژێرین، وەکو یۆنسکۆ کردوویەتی. بەڵام پێویستە ئاماژە بکەین بۆ ئەوەی ناکرێت یەکەمجار ئەو گۆڕانە بە فاکتەرێکی لێکدەرەوە لەقەڵەم بدرێت. ئەوەی ئەم گۆڕانەی پێ دەناسرێتەوە ( ژمارەی ناونیشانە نێودارەکان) ئەوەیە بەرەنجامەکان تۆمار دەکات. ناشتوانین لە هەڵبژاردنی ئەم ئاڕاستەیە بۆ لێکۆڵینەوە، دەرەنجامی هیچ شتێکی وەها بکەین کە لەڕووی سۆسیۆلۆجییەوە لێکدەرەوە بێت. هەروەها ژمارەی ناونیشانە بڵاوکراوەکان بەتەنیا بەس نییە بۆ سنورکردنی لێکۆڵینەوەی ئابورێتی بازاڕ. پێویستیشە تێبینی ئەوە بکەین کە مەدلولی ئابورییانەی ئەم گۆڕاوە بەپێی کارو چەشنەکانی بەرهەمە ڕۆشنبیرییەکان دەگۆڕێت: ئەگەر ئەم ناونیشانە بڵاوکراوەیە بە جوانی پێوانە ئابورییەکە بەنیسبەتی چیرۆك یان ڕۆمان و لێکۆڵینەوە کۆمەڵایەتی و فەلسەفییەکانی تریشەوە دەپێوێت، ئەوا بۆ نمونە شانۆگەری پێشکەشکراو بەنیسبەتی شانۆوە بازاڕمان پێ

دەناسێنێت. لێكۆڵینەوەی تێروتەسەلی پەیوەندیی نێوان چەشنە ئەدەبییە جیاجیاكان ( ڕۆمان، دیوانی شیعر.. هتد) و فیكریی و هونەریی و كۆمەڵایەتی و سیاسیی و هتد. واتە ئێمە لیستێك بۆ ئەداكردنە جیاجیا ئابورییەكان و ئەو كەناڵانەی لێیانەوە دەگەینە بەرهەم پێشكەش دەكەین (بڵاوكردنەوە، كتێب یان زنجیرە، نمایشكردن لەسەر تەختەی شانۆ، هەواڵ لە ڕۆژنامەكاندا.. هتد) بەنیسبەتی هەرچەشنێك یان جۆرێك بەجیا.

ئەو دراوانەی دەتوانین لەمەڕ جوڵەی بازاڕ پەیدایان بكەین، بەس نین چونكە زانیاریمان نادەنێ دەربارەی پەیوەندیی بازاڕ بە بەرهەمهێنەرانەوە، ئەم پەیوەندییەی كە دەشێت بە ڕێگای جیاجیا دەربكەوێت: سەركەوتنی چەشنێكی دیاریكراو لەو چەشنانە كە ژارەیەكی گرنگ لەوانەش دەگرێتەوە كە تازە لەو چەشنەدا دەستیان پێكردووە، یاخود هەڵاوسانێك لە چەشنێكی تر كە دەبێتە هۆی بەرزكردنەوەی توندیی كێبەركێ ( دروستبوونی قوتابخانە یان ئاراستەی ئەدەبیی یان هونەریی.. هتد. دابڕانی نوێ..هتد) هەروەها بۆ هەوڵەكانی وەرچەرخان و گوێزانەوە بەرەو بازاڕێكی تر ( پەڕینەوە بەرەو بەرهەمهێنان لە بواری زانستە مرۆییی و كۆمەڵایەتییەكاندا بە نیسبەتی دەرچووانی گوندیی لە مەغریب و ئەزهەرییەكان لە میسر، بۆ نمونە، یاخود لە زانستە پەتییەكان و سروشتەوە بەرەو زانستەكانی ئایین و سیاسەت، بۆ نمونە، یان لە ئەدەبی گەورەكانەوە بۆ ئەدەبی منداڵان و بچووكان.. هتد) ئەم جوڵانەوانە بەتەنیا جێگۆڕكێی ئابوریی نین، بەڵكو وەرچەرخان لە مەرجەكانی بەرهەمهێنان و خەسڵەتەكانی بەرهەمهێناندا دەگرنە خۆیان: گوێزانەوە لە چەشنێكەوە بۆ چەشنێكی تر پێویستی بە گوێزانەوە لە چەشنێكی تر هەیە كە پێویستی بە گوێزانەوەی خووە فیكریی و زانستییە جیاجیاكان هەیە.

دەشێت بەستنەوەی ستراتیجە فیكرییە ڕۆشنبیرییەكان بە جوڵانەوەكانی بازاڕەوە بمانبات بۆ ڕەچاوكردنی هەندێك دیاردە بەو حیسابەی دراو بن و دەسەبەرداری پۆڵاندنیان ببین. ئەو دیاردانەی كە دەشێت وەكو دراو یان دەشێت هەندێك گریمانە دەربارەیان بكەین، بریتین لە:

.مەسەلەی پەرەپێدانی جەماوەر: زیادكردنی چەندێتییانە، گۆڕینی پێكهاتە.

.مەسەلەی خستنەگەڕی دانەر یان نمایشكەر: مۆرفۆلۆجیای نێوەندە فیكریی یان ئەدەبییەكان، واتە هەمەچەشنیی جەماوەری كارا ( لەپسپۆڕی و چەشنە جیاجیاكاندا... هتد) هەروەها هەمەچەشنیی پێكهاتە ( ڕەسەنی كۆمەڵایەتی و پێكهاتەی بیریارەكان یان نوسینەكان یاخود بانگەشەكەرەكان. ئەم دوو ڕەگەزە ( هەمەچەشنیی جەماوەری كاراو هەمەچەشنیی پێكهاتە) بە دوو شتی پێویست دادەنرێن بۆ لێكدانەوەی جوڵانەوەی ناوەكی نێوەندی ڕۆشنبیران.

.پەیوەندیی بە بازاڕەوە ڕاستەوخۆ نییە بەڵام چەند كارگەرێك لەنێوانیاندان ( بەڕێوەبەرانی شانۆكان و هۆڵەكانی نمایش، سەرپەرشتیارانی بەرنامەكان، ڕێكخەرانی كۆڕو كۆبوونەوەكان،

بەرێوەبەرانی گۆڤارو رۆژنامەکان، بڵاوکەرەوەکان.. هتد) ئەوانەی رۆڵێکی بنەڕەتی دەگێڕن لە دەرککردن بە رەوشی (ئابوری یان رۆشنبیریی یان سیاسی) و پەرەسەندنەکەش. سیاسەتەکانی بڵاوکردنەوە یان نمایشکردن یان ئیلقاکردن رۆڵێکی تایبەتی دەگێڕن، وا دیارە ئەوانە ئەو دەڵاڵە پێویستەن کە لەنێوانی جەماوەری شیاوو بەرینبوونەوەی بازاڕدان.

بۆئەوەی دیاریکردنەکە لەمەڕ پەیوەندیی نێوان جوڵانەوەکانی بازاڕ بە ستراتیجی رۆشنبیرەکانەوە، وردتر بێت، پێویستە ئەم رەگەزانەی خوارەوە لەپێشچاو بگرین:

–دەرککردنی دانەرەکان یان بیریارەکان یان هونەرمەندەکان یاخود بانگەشەکەران بە ڕەوشی ئابوریی. چۆن لای ئەوان وێنەی وەزعی ئابوریی چەشنە جیاجیاکان دروست دەبێت.. (سەرچاوەی زانیارییەکان، دەڵاڵەکان.. هتد).

–پلەی پاشکۆیەتی بە نیسبەتی پاداشتە ئابورییەکانی بازاڕی رۆشنبیریی ( داهاتەکان، قەرەبۆکردنەوەکان.. هتد).

–ماوەی بونیادی رەوتە فیکریی و ئەدەبی یان هونەریی یان گوتارییەکان: ماوەی پێکهاتن، ماوەی دەستپێك، ماوەی وەرچەرخان، ماوەی بەرهەمهێنان...( پێویستە ئەمانە لەپێشچاو بگیرێن بۆ دامەزراندنی پەیوەندیی لەنێوانی چەماوەکاندا دەربارەی رەوشی بازاڕو جوڵانەوە رۆشنبیرییەکان).

–خەسڵەتە کۆمەڵایەتییەکانی دانەران یان نمایشکەران بانگەشەکەران ( شوێنی ئەسڵی، پێکهاتە) کە پرۆسەی وەرچەرخانی شیاو لە چەشنێکەوە بۆ چەشنێکی تر، لە پسپۆڕییەکەوە بۆ پسپۆڕییەکی تر، ئاسان دەکەن یان گرانیان دەکەن.. هتد.

## پەراوێزەکان

[*] زانکۆی محەمەدی پێنجەم، کۆلیژی ئاداب و زانستە مرۆییەکان، بەشی سۆسیۆلۆجیا، ریبات ـ مەغریب.

[**] لەکوردستانی دوای راپەڕینیشدا، نمونەیەکی لەم بابەتە بەرچاو دەکەوێت، بەڵام لەگەڵ هەندێك تایبەتمەندێتیدا.. ئێستا هەڵمەتێکی تاڕادەیەك بەرفراوان هەیە بەرامبەری رۆشنبیرانێك کە بە رۆشنبیرانی رەهەند نێوزەد دەکرێ، " چونکە زۆربەیان لە گۆڤاری رەهەند" دا ئیش دەکەن. ئەم رۆشنبیرانە، گەرچی تا ئێستاش هەر بەزمانی کوردی دەنوسن و زمانێکی بیانییان هەڵنەگرتۆتەوە، بەڵام لەزۆر لاوە تاوانبار دەکرێن بەوەی" کوردی نازانن" یان " زمانەکەیان خراپە" لەگەڵ چەندان تۆمەتی تری وەکو " میتۆدە بیانییەکان دەجوونەوە"، " لاسایی ئەوروپا دەکەنەوە"،" کەس نازانێت چی دەڵێن" زۆر شتی تریش. لەگەڵ جیاوازییەکی تریشدا، ئەوانەی نوسەرە مەغریبییەکانیان تاوانبار دەکرد، خۆیان تاڕادەیەکی زۆر نوسەری باش و نیشتمانپەروەر بوون، بەڵام تاوانبارکەرە کوردەکانی خۆمان وەکو میلیتۆسی تاوانبارکەری سۆکرات، نە خۆیان هیچیان لەباردایەو نە چاویشان غەیری خۆیان کەس دەبینێت.

[***] تیۆلۆجیا *Theology* بریتیە لەو پێڕەوەی کە هەوڵ دەدات گوزارشت لە ناواخنی باوەڕە ئاینییەکان بکات، وەکو یەك پێکهاتەی یەکگرتووی بۆچوونەکان. تیۆلۆجیا مەودایەکی تەسکتری هەیە لەچاو باوەڕدا، چونکە وێڕای ئەوەی کە باوەڕ بریتیە لە سەرجەمی تێڕوانینەکانی تاکەکەس، کە هەست و ئیرادەش دەگرێتەوە، تیۆلۆجیا هەوڵ دەدات، بە بەرجەستەکراوی گوزارشت لە توخمەکانی باوەڕ بکات کە بە شێوەیەکی راشکاو یان ناڕاشکاوانە لەناویدا هەن.

*1.* *P. BOURDIEU, Questions de Sociologie, Minukt, Paris 1984 p 207.*

[*1] —بۆردیۆ، سەرچاوەی پێشوو، *113*.

[*2] —ئەوەی لە جیهانی عەرەبیدا باوە، بریتیە لە کورتکردنەوەی رۆشنبیریی لە رۆشنبیریی نوسراودا، ئەوەی دەخرێتە ناو دیدگایەکی تەسکەوە، بە جۆرێکی وا کە دەبێتە هاومانای "خوتبە" و پڕوپاگەندەو بانگەشە. بەمەش لەگەڵ ئەوەدا جووت دەبێت کە"رۆشنبیری ئۆرگانی" یان "رۆشنبیری بونیادگەر" دەیڵێت و دەیکات، بێشك ئەمە وادەکات کە کەمینەیەکی دیاریکراو ئەو ئامرازانە قۆرخ دەکەن کە بایەخیان لە هۆکارە مادییەکانی بەرهەمهێنان کەمتر نییە، لە هەمان کاتیشدا خۆگێل کردن و بێزراندنی بوارەکانی گوزارشتکردنی زارەکی و مۆسیقی و جەستەیی و سۆزیی و رەفتاریی کە بەشێوەیەکی تۆکمە بەستراون بە بونیادەکانی هەست و ویژدانی باوی ناو کۆمەڵگاوە. (دەربارەی بەکارهێنانی رۆشنبیریی لە بواری سیاسیدا، بروانە تأملات حول العمل الثقافي، البلاغ العربي، *15* فبراير *1985*).

[*3] —بۆنمونە باس لە ئەدەبی عەرەبی دەکریت یان نمایش دەکریت و هیچ شوینەواریکی ئەدەبی بەرهەمهینراو لە مەغریب یان خۆراوای عەرەبی.. هتد نابینین.

[*4] —هەندیك کتیبی رۆشنبیرە مەغریبییەکان هەیە وەرگیردراون بۆ زمانی عەرەبی و لە لوبنان بلاو کراونەتەوە بێ ئەوەی پاریزگاری لە ناونیشانە ئەسلییەکەیان بکەن، بۆ نمونە کتیبەکەی (عبدالکیبر الخطیبي *la blessure nompriore* کە پەیوەندیی بە لیکۆلینەوەی هەندیك لە رەمزەکانی رۆشنبیریی میللییەوە هەیە لە مەغریب، لەژیر ناونیشانی "الاسم العربي الجریح" دا وەرگیردراوەو بلاو کراوەتەوە).

[*5] —وەك دەزگای رۆشنبیریی بۆ چاپ و بلاوکردنەوە کە هاوبەشە لەگەڵ دەزگای پیشەنگی لوبنانیدا بۆ چاپکردنی هەندیك لە بەرهەمەکانی رۆشنبیرە مەغریبییەکان.

[*6] —ستراتیجی رەخنەگر یان خوینەر بەزۆریی بەو کارە دیاریی دەکریت کە لە ئامادەکردنی نامە یان تیزەکە لەگەڵ بەرهەمهینەر یان بانگەشەکەردا بەرهەم هاتووە.

[*7] —ئەم کارە وای لیهاتووە زیاتر و زیاتر بە چۆنیەتییەکی دەستەجەمیی لەناو یەکەی بەرهەمهینانی دیاردا ئەنجام دەدریت کە بەزۆریی لەرووی تەکنیکیی و کۆمەلایەتییەوە ریزبەند کراوە، هەروەها لە بەشیکی گرنگیشیدا پاشکۆی کاری دەستەجەمیی و هۆیەکانی بەرهەمهینانی پر مەسرەفە.

[*8] —شوینەوارە فرە رەهەندەکان و هەمەچەشنەکان کە وایان لیهاتووە گۆرانکاری مەرجە کۆمەلایەتییەکانی

بەرهەمهێنان دەگەنە سەریان، چ لەسەر ئاستی مومارەسە بێت یان لەسەر ئاستی ئەو بەهاو ئایدیۆلۆجیایانەی کە دەشێت ئەمڕۆ لە هەندێك کۆلێجدا تێبینی بکرێن ( بۆ نمونە کۆلێجی پزیشکی) و پەیمانگا باڵاکان کە لەویێ تەرزێکی نوێی بەرهەمهێنان بە کاری کۆمەڵایەتی و پاشکۆیەتی بەرامبەری هۆیە زۆر مەسرەفەکانی وەك ئامێرەکان و تیمەکانی کاری دەستەجەمیی و یاریدەدەران و..هتد دەناسرێتەوە، کە وردە وردە قەرەبۆی تەرزی بەرهەمهێنانی فیکری و رۆشنبیریی کۆنینە دەکەنەوە، کە هێشتاکە لە کۆلێجەکانی ئادابدا باون (کاری تاکەکەس، تەدارەکێکی کەم یان هەرهیچ، توانای ئابوری یەکجار سنوردار.. هتد).

[*9] –زۆرێك لەو وەزیفانەی کە نمایش دەکرێن . بۆ نمونە "نوسەری گشتی لە کۆمەڵەی فلانی.." یان "ئەندامی لیژنەی فلانی.." یاخود" کۆنە ئەندامی لیژنە یان کۆڕ یان ئەنجومەن.. هتد" یان ئەوەتا هەر نین و هیچ کاتێکیش نەبوون، یاخود هەن و هیچ چالاکییەکیان نییە یان بەدەستی کەمی ژمارەیانەوە یان هاتوچۆکەرانەوە دەناڵێنن، بە جۆرێکی وا کە ئەو ئەنجومەنە یاخود یانانە یان لیژنانە هیچ قورساییەکیان نابێت، نە لەرووی ئاماریی دیمۆگرافییەوەو نە لە لایەنی سۆسیۆلۆجییەوەو نە لەلایەنی رۆشنبیریی یان فیکرییەوە.

## پەراوێزەکانی وەرگێڕ

[1]میتۆد *method* بریتیە لە رێگای ئەنجامانی شتێك یان جێبەجێکردنی شتێك، بەتایبەتی بەپێی پلانێکی داڕێژراو. یاخود دەتوانین بڵێین میتۆد بریتیە لە سیستمی بیرکردنەوە، کردەوە یاخود تەکنیك. هەروەها دەشێ بڵێین میتۆد بریتیە لە جەستەی تەکنیکێکی سیستماتیزەکراو کە لەلایەنی دیسپلینێکی دیاریکراوەوە بەکاردەهێنرێت، بەتایبەتی دیسپلینی زانستی.

[2] بۆردیۆ، پییر *Pierre Bourdieu* (*1940 ـ 2002*) فەیلەسوفێکی فەرەنسیی هاوچەرخە، سەرقاڵی لێکۆڵینەوەی تاك و نەهامەتییەکانی ژیانی تەکنەلۆجیایە. دیارترین کتێبی بریتیە لە مرۆڤی ئەکادیمی، تێزی توندو تیژی رەمزیی یەکێکە لە تێزە نێودارەکانی.

[3] سۆسیۆلۆجیا *Sociology,* بریتیە لە لێکۆڵینەوەی زانستیی دەربارەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی مرۆڤ، یاحود ژیانی گرووپ. لەگەڵ دیسپلینەکانی زانستە کۆمەڵایەتییەکانی تریشدا تێکەڵاویی هەیە، لە وێنەی ئابوریی، زانستە سیاسییەکان، ئەنترۆپۆلۆجیا، لەگەڵ سایکۆلۆجیا، کە هەر هەموویان پێکەوە بایەخ دەدەن بە کۆمەڵگای مرۆڤایەتی. سۆسیۆلۆجیستەکان لەو شێوازانە دەکۆڵنەوە کە بەهۆیانەوە بونیادە کۆمەڵایەتییەکان و دامەزراوە کۆمەڵایەتییەکان ، لە وێنەی چین، کۆمەڵ، دەسەڵات، لەگەڵ گرفتە کۆمەڵایەتییەکاندا، لە وێنەی تاوان، خراپەکاری لە کۆمەڵگادا.. کاردەکەنە سەر کۆمەڵگا.

[4] مەغریب *Morocco* بە عەرەبی پێی ئەوترێت " المملكة المغربية" شانشینێ کە لە باکوری ئەفریقیا، پایتەختەکەی ریباتە. سنورەکانی لە باکورەوە دەریای ناوەڕاست، لە خۆرهەڵات و باشوری خۆرهەڵاتەوە جەزائیر، لە باشوری خۆراواوە بیابانی خۆراوا، لە خۆراواشەوە بەزەریای ئەتلانتیك دەوری گیراوە.

سنوری وڵاتەکە بە بیابانی خۆراواوە بە تەواویی سەقامگیر نیە. شارە گەورەکانی کازابلانکاو مەراکیشن، ژمارەی دانیشتوانی لە سالی *2000*دا *30205430* کەس بووە. هەردوو ناوچەی کیوتا و میلیلای ئیسپانی نوساون بە مەغریبەوە لە کەنارەکانی دەریای ناوەراستەوە، هەروەها شەش حەوت دورگەی تریش لەو دەوروبەرەداو لەناو دەریای ناوەراستدا مولکی ئیسپانن. لەماوەی نیوان سالانی *1912 . 1956* مەغریب خۆش لەنیوانی ئیسپانیاو فەرەنسەدا دابەش کرابوو. روبەری مەغریب *453730* کم$^2$ دەبیت . لە سالی *1979* بەدواوە مەغریب ناوچەی بیابانی خۆراواشی خستۆتە سەر روبەرەکەی خۆی.

[5] ئەپستمۆلۆجیا *Epistemology* لقیکە لە فەلسەفە، کە سەرقالی ئەو گرفتە فەلسەفییانەیە کە لە تیۆری زانیندا دەردەکەون. ئەپستمۆلۆجیا بایەخ دەدات بە پیناسەکردنی زانین و ئەو چەمکانەی پەیوەندییان بە زانینەوە هەیە، سەرچاوەو پیوانەکانی زانین، چەشنە شیاوەکانی زانین، لەگەڵ پلەی هەریەکیکیاندا، هەروەها ئەو پەیوەندییەی لەنیوانی ئەوەدا کە دەزانیت و ئەو بابەتەشدا کە زانراوە.

[6] دوالیزم *dualism* بریتیە لەو حالەتەی کە شتیك دوو شیوازی جودای دەرکەوتنی هەبیت، کە بەزۆری پیچەوانەی یەکترین، لە تیۆری فەلسەفییدا، دوالیزم لەسەر بناغەی ئایدیای چەمکە دژەکان دامەزراوە، بەتایبەتی ئەو تیورییەی کە مرۆڤ لە دوو بەشی سەرەکی پیکهاتووە، جەستەو رۆح.

[7] عەبدولناسر، جەمال ( *1918 . 1970*) سیاسەتمەدارو پیاوی دەولەتی میسرییە، لە ناوچەی ئەسیوت لەدایك بووە، دامەزرینەری جولانەوەی ئەفسەرە سەربەستەکانە، کە لە سالی *1952*دا شا فاروقیان لەسەر تەخت لابرد. ناسر لە سالی *1956*دا، کەنالی سویسی خۆمالیکردووە. لە سالی *1958*دا دەبیت بە سەرکۆماری میسر، پاشان هەتا رۆژی مردنی سەرۆکی کۆماری عەرەبی یەکگرتوو دەبیت، یەك کتیبی بلاوکراوەی هەیە کە ناوی فەلسەفەی شۆرشە، پاشان شیوازی بیرکردنەوەو ئیشکردنەکەی لەلایەنی هاوەلان و لایەنگیرەکانییەوە بە ناسرییزم ناسرا.

[8] گوتار *discoures* بریتیە لە گروپیکی تایبەت لە گوزارشتەکان، کە بە وەزیفە کۆمەلایەتییەکەی و پرۆژە ئایدیۆلۆجییەکەی دیاری دەکریت. بەمجۆرە زاراوەکە ئاماژە دەکات بۆ سیستمیکی فیکریی کە چەندان چەمك و وتەی تیوری دەگریتە خۆی لەپاڵ چەند رەهەندیکیشدا بۆ پراکتیك، هەمووی لە دەوری یەکیك لە پانتاییەکانی واقیعی کۆمەلایەتی و بگرە ناکۆمەلایەتیش، بە مەبەستی نزیکبوونەوەو تیگەیشتن و کارلیککردن لەگەلیدا.

[9] ئایدیۆلۆجی *Ideology* بریتییە لەسیستمیکی ریکخراوی ئەو باوەر، بیرکردنەوە، بەها، ئایدیایانەی بنەماکانی پرۆگرامیکی کۆمەلایەتی یان ئابوریی یان فەلسەفەیەکی سیاسی پیکدەهینن، هەروەها دەتوانریت بوتریت بریتیە لەو کۆمەلە باوەر، بەهاو بۆچوونانەی کە شیوازی بیرکردنەوەو رەفتار و تیگەیشتنی جیهان لەلایەنی تاکیك یان گروپیکی کۆمەلایەتی دیاریکراو پیکدەهینن.

**سەرچاوە:**

گۆڤاری المنار ژمارە (*29*) ل *89 . 100* .

# تایبەتمەندییەکانی ڕۆمانی پۆست مۆدێرن

• بهار رهادوست

▪ لە فارسییەوە: سەروەر عومەر محەمەد

کلیلی وشەکانی ناونیشان، ڕەوتی باسەکە ڕۆشن دەکاتەوە؛ ڕۆمان یا چیرۆکی درێژ، پۆست مۆدێرن، وەسفگەرایی کە پاش دەورەی مۆدێرنیزم لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستدا لە ئەدەبیاتی ڕۆژئاوادا بڵاوبۆتەوە و، تایبەتمەندییەکانی ئەم تەرزە ڕۆمانە ئاسایی لە تەرزەکانی دیکەی ڕۆمان بە تایبەتی ڕۆمانی مۆدێرن جودا دەکاتەوە؛ بەڵام بەر لە چوونە نێو باسەکەوە، سەرنجدان لە دوو خاڵ پێویستە؛ یەکەم ئەوەی کە لەگەڵ هەبوونی وتە و وتارگەلێکی زۆر لە بارەی پۆست مۆدێرنیزمەوە، وا دێتە بەرچاو کە ڕوونکردنەوەی چەمکەکانی مۆدێرنیتە، مۆدێرنیزم، مۆدێرنیزەیشن، پۆست مۆدێرنیتە و پۆست مۆدێرنیزم پێویستە و دەتوانێت زەمینە سازییەک بێت بۆ چوونە نێو ئەسڵی مەبەستەکە. ئیدی ئەوەی کە لەمەڕ باسی گۆڕانی ڕۆمانی کلاسیکی بۆ ڕۆمانی پۆست مۆدێرنە، هەوڵدەدەین تا ئەو جێگەیەی لە توانای ئەم وتارەدایە، لە بنەما فەلسەفییەکانی ئەم گۆڕانە بکۆڵینەوە و ئەوەش ڕوونکرنەوەی چەند زاراوەیەك:

*1*–مۆدێرنیتە: بە هەلومەرج و بارودۆخی شارستانییەکی تازە دەگوترێت کە چەند سەدە دوای ڕێنیسانس لە ئەوروپا و ئەمریکای باشووردا بەدی هات و لە نیوەی سەدەی (*20*)دا بە دیارترین ڕوخسار ئاشکرا بوو، بەم پێیە شارستانییەتێك کە لە چەرخی مۆدێرنێتەدا دروست بووە، شارستانییەتێکە مۆدێرن و بە درێژایی مێژووی بەشەر، تاقانە و بێ پێشینەیە.

*2*–مۆدێرنیزم: بە شێوەیەکی گشتی بە کلتوور و فەلسەفەی فەرمانڕەوا بەسەر چاخی مۆدێرنە و،

بە شێوەیەکی تایبەت بە بزووتنەوەیەك لە هونەرەکان دەوترێت کە نیوەی دووەمی سەدەی *19* و نیوەی یەکەمی سەدەی *20* دەگرێتەوە، لە ڕاستیدا لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستدا هونەرەکان و ئەدەبیاتی نوێژەن کە دواتر بە مۆدێرنە ناوزەد کران، سیستمی کۆمەڵایەتی کۆمەڵگای سەرمایەداری چەرخی مۆدێرنیتەی بۆ جەنگ بانگهێشت کرد و زۆربەی حەریفەکان بە فەلسەفەگەلی وەك: دیاردەناسی، ئەگزیستانسیالیزم "بوونگەرایی"، مارکسیسم و دەرونشیکاری، لەگەڵ وردە فەرهەنگی پێشەنگ و دژی ڕەوتە فەرمانڕەواکان، دەناسرێت و دیاری دەکرێت.

*3*-مۆدێرنیزەیشن: هاومانای چەمکی فراوانکارییە (توسعە) لە کۆمەڵگا ناڕۆژئاواییەکاندا و یەکێکە لە ڕووەکانی مۆدێرنیتە، پێشەنگەکانی کۆمەڵگا ئەوروپاییەکان و ئەمریکای باکوورن کە بە بەرهەمهێنان و فراوانکردنی تەکنیکە نوێیەکان بۆ توێژینەوە و داگیرکردنی سروشت و داهێنانەکان و شێوەگەلی تازەی بەرهەمهێنانی پیشەسازی، بنەمای ئابووریی گۆڕانکارییەکانی چەرخی مۆدێرنیتەیان داڕشت.

*4*-پۆست مۆدێرنیتە: بە قۆناغێکی کۆمەڵایەتی و فەلسەفی و هەلومەرج و بارودۆخێك دەوترێت کە ئێمە ناومان لێناوە هەلومەرجەکانی پۆست مۆدێرنە. بە واتایەکی دیکە، پۆست مۆدێرنیزم کاردانەوەیەکی فەرهەنگییە بە واقیعە فەلسەفی، کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکانی چاخی پۆست مۆدێرنیتە.

*5*-پۆست مۆدێرنیزم: بە سەرنجدان لە ڕێکخستنە هەمەجۆرەکانی پۆست مۆدێرنیزم، دەتوانرێت کە پاشگری "یزم" لابرێت؛ چونکە ئەم پاشگرە دەلالەتە لەسەر وجودییەتێکی یەکپارچە و تەواو، لە حاڵێکدا کە پۆست مۆدێرنەکان ڕەخنە لە خەونی یەکبوون دەگرن، ئەوە بە خەیاڵێکی خاو دەزانن. پۆست مۆدێرنیزم مەرام و قوتابخانە نییە. لە ڕاستیدا هیچ "شتێك" نییە، بەڵکو ساتێکە، بەڵام زیاتر ساتێك لە مەنتیقدا تا ساتێك لە زەماندا و زیاتر هەڤپەیڤینێکە تا بزووتنەوە و ڕاپەڕینێکی هەزری. زاراوەیەکە مشتومڕئامێز لەمەڕ گۆڕانکارییەکان و ئەو ڕەوتانەی کە لە دەیەکانی *40* و *50*ی سەدەی بیستدا لە ئەدەبیات، هونەر، مۆسیقا، بیناسازی و فەلسەفەدا هاتنە بوون و دەتوانرێت بەسەر سێ قۆناغدا دابەش بکرێت:

یەکەم، قۆناغی ڕووبەڕووبوونەوەی فەرهەنگی لە دەیەی *60*، پاشان قۆناغی گفتوگۆکانی پاش بوونیەوییەکان لە دەیەی *70*، و دواجار قۆناغی تیۆرکاری لە دەیەکانی *80* و *90*، بە بۆچوونی فرەدریك جیمسون "پۆست مۆدێرنیزم لۆژیکی فەرهەنگی دوایین قۆناغی سەرمایەدارییە" و بە قەولی ئارنست ماندل یەکەمین قۆناغی سەرمایەداری، سەرمایەداری ژێر دەسەڵاتی بازاڕە کە بەرهەمەکەی جوانناسی ڕیالیزم بوو.

دووەمین قۆناغ، قۆناغی سەرمایەداری مۆنۆپۆلی یا ئیمپریالیستییە کە بەرەوی دایە مۆدێرنیزم و سێهەمین قۆناغ، قۆناغی فیعلی

سەرمایەدارییە کە لەگەڵ جوانناسی پۆست مۆدێرنیستیدا نزیکایەتی و هاوئاهەنگی هەیە. ئێستا ئەگەر وا دابنێین ئەو پێناسانەی سەرەوە جیاوازی زاراوەو خێزانەکانی تا ڕادەیەك ڕوون کردبێتەوە، دەچینە سەر بابەتی ڕۆمان. وشەی ڕۆمان کە لە فارسدا بۆ نۆڤڵ یان چیرۆکی درێژ بەکاردێت، یەکێکە لە لقەکانی ئەدەبیاتی چیرۆك "*fiction*" و بە پێی پێناسەی کۆن، هەوڵێکی خەیاڵئامێزە بۆ پیشاندانی واقیع، تەرحی چیرۆك لە ڕێگەی دەرخستنی چەند کەسایەتییەکەوەیە لە یەك پێکهاتەی کۆمەڵایەتی پێشکەوتوودا لەگەڵ یەکدی و لەگەڵ کۆمەڵگادا هەڵسوکەوت دەکەن و دەست دەدەنە ئەزموونگەلی باوەڕپێکراوەوە. لێرەدا باسی مێژووی ڕۆمان و قۆناغی درەوشانەوەی یاخود وتنەوەی جۆرەکانی دەربڕینی چیرۆك بە گشتی لە تراژیدیك، کۆمیدی، تەنزئامێز و ڕۆمانتیك یاخود جۆرەکانی ئاواز، دیدگا و ڕەگەزە ئاڵوگۆڕپێکراوەکان لە شێوازەکانی گێڕانەوەدا جێگەی سەرنج نییە. چونکە ئامانج لە لێکۆڵینەوە، سەرقاڵ بوون بە دۆزینەوەکانی ئەوانی دیکەوە نییە و، بە گەڕانەوە بۆ ڕاڕەوەکانی ڕۆمان، دژە ڕۆمان و ڕۆمانی نوێژەن لە فەرهەنگە موعتەبەرەکاندا دەتوانرێت گۆڕانەکانی ڕۆمان لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەوە تا هەنووکە یەك بە یەك ئەژمار بکرێت؛ بۆیە بۆ وەڵامدانەوە بە پرسیاری سەرەکی چۆن و بۆچییەکانی گۆڕانی ڕۆمانە، ناچارین بۆ لێکۆڵینەوەی پیشاندانەوە یاخود *representation* بگەڕێینەوە و بپرسین لە ڕۆمانی پۆست مۆدێرندا:

*1*–نووسەر چ گۆڕانێکی بەسەردا هاتووە؟

*2*–دیاردەی پیشاندانەوە دووچاری چ ئاڵوگۆڕێك بووە؟

*3*–پەیوەندی نێوان نووسەر و ئەو جیهانەی کە ئەو پیشانی دەدات، چ گۆڕانێکی تیادا کراوە؟

لە ڕاستیدا ئەم سێ پرسیارە دەتوانرێت بە شێوەی سێ پرسیاری فەلسەفی بەم شێوەیەی لای خوارەوە دەربڕدرێت:

*1*–چەمکی مرۆڤ و بابەت چ گۆڕانێکی بەسەردا هاتووە؟

*2*–چەمکی واقیعیەت و جیهانی واقیعی چ ئاڵوگۆڕێکی تیادا کراوە؟

*3*–پەیوەندی نێوان مرۆڤ و جیهانی واقیعی دووچاری چ ئاڵوگۆڕێك بووە؟

## هەڵوەشاندنەوەی خودی مرۆڤ و مەرگی نووسەر

بە ئیلهام لە ڕاگلان سالیوان کە باوەڕی وایە مرۆڤی ڕۆژئاوایی سەدەی *20* پێکهاتەیەکە لە مرۆڤی سەدەکانی ناوەڕاست، قۆناغی ڕێنیسانس، چەرخی ڕۆشنگەری، قۆناغی ڕۆمانتیزم و قۆناغی دەروونشیکاری فرۆید، دەتوانرێت ڕەوتی گۆڕانی بابەت یا بکەری ناسێنراو بەم شێوەیەی خوارەوە پیشان بدرێت و ڕابگەیەنرێت کە مرۆڤی سەدەی هاوچەرخ پێکهاتەیەکە لە:

–من باوەڕم هەیە. (سەدەکانی ناوەڕاست).

–من بیردەکەمەوە. (دیکارت و چاخی ڕۆشنگەری).

-من هەست دەکەم. (قۆناغی ڕۆمانتیکەکان).

-من تەماشا دەکەم. (تیۆری داروین، ناتۆرالیزم و پۆزەتیڤیزم).

-من خەون دەبینم. (دەروونشیکاری فرۆید).

-من گۆڕانکاری دەکەم. (مارکسیزم).

-من هەڵدەبژێرم. (ئەگزیستانسیالیزم).

بەڵام لە قۆناغی پۆست مۆدێرندا، ئەم "من"ە یەکپارچەیە، تۆکمەییەکەی لەدەست دەدات و فەیلەسووفانی وەکو ڕۆلان بارت، جاك دریدا، میشیل فۆکۆ و جاك لاکان بە سەرنجی نوێژەنەوە لە نموونەی ئینسانی دەڕوانن و شیکاری دەکەن. لاکان ڕایدەگەیەنێت کە "من" یا ڕاناوی خودئاگایی فرۆید لە دوو پارچە پێکهاتووە؛ منێك کە لەگەڵ مەسەلەی بووندا ئامبازە و منێك کە لەگەڵ مانادا ڕووبەڕووە و ئەم کەلێن و دوو پارچەییە، یەکەمین هۆکاری سەرکوتکردنی دەروون و پایەڕێژی ویژدانی نائاگایە. دریدا بابەت بە کارکردی زمان دەزانێت و، سنووردارێتی "من"ی وەك چەمکێکی ئەبستراکت و مەزن و ڕێنموونیکەری زمان خستە ژێر پرسیارەوە. فۆکۆ ڕۆڵی توانای لە شێوەی بەخشین بە مێژوودا لێکۆڵییەوە و کە بە بۆچوونی ئەو مامەڵەی نێوان گوتارەکانە، بابەتی ئینسانی هەم بە بکەرێکی ناسێنراو و هەم بە بابەتی ناسین دەزانێت. ڕۆلان بارتیش مەرگی نووسەر و گواستنەوەی فەرمانڕەوایەتی لە نووسەر یاخود خوڵقێنەری بەرهەمەوە بۆ نووسین و دەق و پاشان خوێنەر ڕادەگەیەنێت. ئەو لە جیاتی وشەی بەرهەم (*Work*) نووسین و دەق "*text*" بەکاردەهێنێت، لەبەرئەوەی نووسین دیاردەیەکی ناکۆتایی بەرهەمهێنانەو دەق وەکو گوتار مامەڵەپێکراوە. لە حاڵێکدا کە بەرهەم داهێنراوێکە کە لە خۆیدا تەواو دەبێت و بەم شێوەیە زاراوەی فەلسەفی "هەڵوەشاندنەوەی خود"ی نیچە و "نووسەری مردوو"ی بارت مانای خۆیان دەدۆزنەوە. چەمکی "لەخۆ نامۆبوون" کە لە ئەدەبیاتی مۆدێرندا زاڵ بوو، پایەداری پێشینی خۆی لەدەست دەدات و ڕۆڵی نووسەر لە پادشا و خوڵقێنەری بەرهەمەوە بۆ هاوکاری خوێنەر لە ئامادەکردنی دەق و بەرهەمهێنانی مانا، دەگۆڕێت.



ڕۆلان بارت

## جیهانە مومکینەکان لە بەرامبەر جیهانە واقیعییەکاندا

دووەمین پرسیار، چۆنێتی گۆڕانی پیشاندانەوە و گۆڕانی دەرەکی مرۆڤ بۆ واقعییەت و جیهانی واقیعییە کە پۆست مۆدێرنیزم خاڵی پەیوەستی ئەم گۆڕانەیە. دەزانین کە لە سەرەتای مێژووەوە "واقیعییەت" بابەتی گەڕانی مرۆڤ بووە و پیشاندانەوەی واقیعییەت، لە زووەوە بە کارکردی سەرەکی بەرهەمە ئەدەبییە خەیاڵییەکان ئەژمار کراوە. بەڵام ئەم دیاردەیە بە

درێژایی مێژوو دووچاری چەندان گۆڕانکاری هاتووە. بەو مانایەی کە سەروەختانێکی زۆر ڕەهەندی زاڵ، پیشاندانەوەی واقیعبینانە یاخود ڕیالیستیانەی جیهانی واقیعی و سروشت بووە، پاشان نیگای هونەرمەند و ئاشکراکردنی ئێکسپرسیونیستی "ئینتباعی" جێگەی سەرنج بووە و پاشان ئەم سووربوون و سەرنجە بە شێوەی بەرهەمی ئەدەبی و لایەنە فۆرمالیستییەکانییەوە پەیوەست بووە. ئێستاکە لە سەدەی پۆست مۆدێرندا، پیشاندانەوە نە وێنەگرتنی واقیعە و نە پەرتەوازەیی، بەڵکو دەرخستنی شێوەیەکە لەسەر ئەو بنەمایە زمان و عیبارەتی گێڕانەوەکان و وێنەکانی خەیاڵ، وێناکردنی ئێمە بۆ خۆمان و خودێتیمان لە هەنووکە و ڕابردوودا دەستنیشان دەکات. لە ڕاستیدا ڕەخنەگری پۆست مۆدێرن نە تەنیا بەوە قایل نییە کە ڕووداوەکان ڕابردوو دروست دەکەن، بەڵکو پیشاندانەوەی ڕابردوو بە نەبوو دەزانن، ئیمکانی بیرکردنەوە دەربارەی "واقعیات" و "حەقایق"ی ڕەها ڕەت دەکەنەوە. بە بۆچوونی ئەو جیهانی واقیعی وەکو بنەما و سەرچاوەی پیشاندانەوە، دەکەوێتە ژێر پرسیارەوە و، بەڵکو ڕەسەنایەتیبوون، مانای بەنرخی خۆی لەدەست دەدات. سنووری نێوان واقیعییەت و جیهانی خەیاڵی چیرۆك کاڵ دەبێتەوە و هونەرمەند لە بری جیهانی واقیعی ئامادە، لەگەڵ جیهانگەلی مومکین و جۆراوجۆر ڕووبەڕووە و ئەگەریش وەك مك هیل قایل بین بە هەبوونی سنوور و جیاوازی لە نێوان دونیای واقیعی و دونیای خەیاڵی چیرۆکدا، دیسانەوە ناتوانرێت نکوڵی لەوە بکرێت کە پیشاندانەوەی وێنەگیرا و پیشاندانەوەی جیهانگەلی جۆراوجۆر و مومکینە نە جیهانێکی واقیعی.

## قبوڵکردن و ڕەتکردنەوەی گۆشەنیگای شێواوی جیهانگەلی جۆراوجۆر

بە سەرنجدان لەو گۆڕانکارییانەی کە لە بابەت و جیهانی واقیعی و هەروەها نووسەر و دیاردەی پیشاندانەوەدا ڕووی داوە، ئێستاکە لەگەڵ دوو پرسیاردا ڕووبەڕوو دەبینەوە: یەکەم ئەوەیە کە دیدگای نووسەر و ڕەخنەگری پۆست مۆدێرن لە هەمبەر جیهانگەلی مومکین و جۆراوجۆردا چییە؟ ئەوی دیکەش ئەوەیە کە نووسەری پۆست مۆدێرن بەچی ستراتیژ و تەکنیکگەلێك ئەم جیهانگەلە دەخوڵقێنێت و دەقی پۆست مۆدێرنیستی دەهێنێتە بوون؟ لە وەڵامی پرسیاری یەکەمدا، دەگەڕێینەوە بۆ هەمەڕەنگی گێڕانەوەکانی پۆست مۆدێرنیزم و جۆراوجۆری ڕەوەند و دیدگاکانی نووسەرانی پۆست مۆدێرن، کە بە جۆرەها جیاوازی تاکەکەسی و کۆمەڵایەتی و نەتەوەیی و فەرهەنگی و زمانی لە پێکهاتەیەکی گەورەدا جێگە دەگرێت و لەم جێگەیەدا بێگومان بە دوو تێڕوانینی ئەنتۆلۆجیانە و پارادۆکسانە (دژئامێز) ئاماژە دەدرێت. لەسەر بنەمای تیۆری ئەدەبی مك هیل، سەرنجی نووسەرانی پۆست مۆدێرن بۆ جیهان زیاتر ئەنتۆلۆجیانەیە تا ئەبستمۆلۆجیانە و ئەوان زیاتر لەگەڵ پرسیارەکانی وەك "جیهان چییە؟"، "چەند جیهان بوونی هەیە؟" و "ئەم

جیهانانە چ جیاوازییەکیان هەیە"؟. سەروکاریان هەیە و تا پرسیارگەلی چوون "چەندێك ئەم جیهانە دەناسین؟ و چۆن دەتوانم ئەو بناسم؟" بەڵام بە بۆچوونی لینداهاچن، نووسەری پۆست مۆدێرن لە بەرامبەر جیهانی ئەمڕۆدا ڕەوەندێکی سیاسی و دژئامێزی هەیە. ئەو بە پێچەوانەی نووسەری مۆدێرنەوە کە بابەتێکی تەواو نەیار و پێشەنگی هەبوو، لەگەڵ ئەم جیهانەدا بە شێوەیەکی ڕەخنەگرانە ڕووبەڕوو دەبێتەوە و لە هەمان حاڵدا تیایدا بەشداری دەکات. لە وەڵامی دووەمین پرسیاردا دەربارەی ستراتیژەکان و تەکنیکەکانی نووسەرانی پۆست مۆدێرن، دەبێت لە دەقە ئەدەبییەکانی نووسەرانی پۆست مۆدێرن، داوای یارمەتی بکەین؛ لەبەرئەوەی کە شیکاری بەرهەمە چیرۆکییەکانی نووسەرانی دونیای ڕۆژئاوا لە نیوەی دووەمی سەدەی *20* و بە تایبەتی نووسەرانی ئەمریکایی نیشانی دەدات کە ڕۆمانی پۆست مۆدێرن لە نێوانی ڕێبازە ئەدەبییە جۆراوجۆرەکاندا، ئاسایی بەم شێوەیەی خوارەوە سوودی لە دە (*10*) تایبەتمەندی و تەکنیکی ئەدەبی وەرگرتووە.


ژاك لاكان

**1-زاڵبوونی ڕەوەندی ئەنتۆلۆژیانە بەسەر ڕەوەندی ئەبستمۆلۆژیانەدا:**

بەو شێوەیەی کە لە سەرەوە ئاماژەی پێ درا، بە وتەی مك هیل ڕەوەندی ئەنتۆلۆژیانە لە بەرهەمە پۆست مۆدێرنەکاندا زاڵە بەسەر ڕەوەندی ئەبستمۆلۆژیانە تیایاندا. لە ئەنجامدا گومان و بێ متمانەیی ئەبستمۆلۆژیانەی پاڵەوانەکان لە بەرهەمە مۆدێرنەکاندا جێگەی خۆیان بە ناجێگیری و جۆراوجۆرخوازی ئەنتۆلۆژیانەی کەسایەتییەکان لە بەرهەمە پۆست مۆدێرنەکاندا دەدەن و ڕەگەزە ئەبستمۆلۆژییەکان لە پشتی مەیدانەکەوە دەمێننەوە لە حاڵێکدا کە لە بەرهەمی مۆدێرنیستەکاندا ئەم ڕەگەزانە لە پێشەوە و ڕەگەزە ئەنتۆلۆژییەکان لە دواوە دێن. چیرۆکنووسانی مۆدێرن بۆ نیشاندانی ڕووە ئەبستمۆلۆژییەکان لە بەرهەمەکانیاندا لە تەکنیکەکانی وەکو مەنەلۆگی ناوەوەیی و لە پاڵ یەکدانانی لایەنە دژەکان "*Juxtaposition*" سوودیان وەردەگرت و پاڵەوانانی ڕاڕا، دوودڵ و دووچاری قەیرانی ناسین پەروەردە دەکەن. لە حاڵێکدا کە کەسێتییەکان لە ڕۆمانە پۆست مۆدێرنەکاندا، زیاتر لەوەی کە ڕاڕا و دوودڵ بن، ناجێگیر و تێکشکاو و دووچاری قەیرانەکانی ناسنامەن.

**2- پارچە پارچەیی کەسێتی، پێکهاتە و زمان:**

کاتێك ژاك لاکان تیۆری "منی پەڕاگەندە"ی خستەڕوو، بانگەشەی یەکپارچەیی ویژدانی نائاگایی لای فرۆید خستە ژێر پرسیارەوە. ئەو سیستمی دەروونی بە سێ بەشی واقیعی، خەیاڵی

و ڕەمزی خستەڕوو. واقیعی ئەو شتەیە کە ئێمە ئەزموونی دەکەین. خەیاڵی، پیشاندانەوەی ئەو شتەیە کە ئەزموون کراوە و ڕەمزی، پیشاندانەوە گەلێکی ئاڵۆزتر و چڕوپڕترە بە شێوەی وێنەی خەیاڵی مانادار. بەم پێیە "*Self*" پێکهاتەیەکی زمانییە و زمان لە ڕاستیدا توانای دەروونی ئێمەیە بۆ پیشاندانەوەی خۆمان کە خودی ئێمە دروستی دەکات. هەرچەندە ئەم تواناییە، ئێمە بۆ دوو من یان خود دابەش دەکات. منێك کە ئەزموون دەکات و منێك ئەوەی کە ئەزموون کراوە، پیشانی دەداتەوە. ئەندێشەی لاکان بەسەر ڕەخنەگران و نووسەرانی پۆست مۆدێرنەوە کاریگەرییەکی زۆری داناو "لەخۆ نامۆبوون" کە هەڵگری نموونە و کەسێتی یەکپارچەبوو و نموونەکانی لە مەسخی کافکا، بێگانەی ئەلبێر کامۆ و کەرکەدەنی یونسکۆدا دەتوانرێت ببینرێت، جێگەی خۆی بە "چەند پارچەیی"دا، کە نووسەرانی پۆست مۆدێرنی وەکو دانلد بارتلمی، جان بارت و ونگات ئەویان بە هونەرمەندانەترین شێوە لە ڕۆمانەکانی خۆیاندا بەکارهێنا، خاڵێکی دیکە ئەوەیە کە تەنها کەسایەتییەکان لە ڕۆمانە پۆست مۆدێرنەکاندا دووچاری پارچەپارچەبوون نابن، بەڵکو پێکهاتە و زمانیش لەم ڕۆمانانەدا لە شێوە باوەکانی ڕۆمانی کلاسیك دوور دەکەوێتەوە و تەشکی پێکهاتە و زمانی پارچەپارچەبوو، کاریگەری تەکنیکی کۆلاژ بە خوێنەر دەبەخشێت.

### 3-بەکاربردنی ناوەڕۆکە ئەنتۆلۆژییەکانی ژانری زانستی- خەیاڵی:

ڕۆمانی زانستی- خەیاڵی ژانرێکی ئەنتۆلۆژیانەیە، هەروەك کە چیرۆکی پۆلیسی ژانرێکی ئەبستمۆلۆژیانەیە و، هۆکاری ئەنتۆلۆژیانە بوونی ژانری زانستی- خەیاڵیش ئەوەیە کە ئەنتۆلۆژیا لە بنەڕەتدا تاریفی جیهانێکە کە نایناسین (*a universe*)، نەوەك جیهانێك کە دەیناسین (*The universe*) و ڕۆمانی زانستی- خەیاڵی ئاسایی هەڵگری ڕەگەزگەلی وەکو داهێنانە تەکنەلۆژییەکان، جەنگی ئەستێرەکان، گەشت بۆ نێو هەسارە نەناسراوەکان و تاریفی جیهانە دوور و لەدەستچووەکان. هەرچەندە ئەم ژانرە بە درێژایی کات دووچاری چەندان گۆڕانکاری بووە، جێگۆڕکێیەك لە فەزا و هەسارەکاندا جێگەی خۆی داوە بە گەشت لە کاتدا. گەشت لە فەزا و هەسارەکاندا گۆڕاوە بە گەشت لە کاتدا و وێنەکێشانی ئایندە جێگەی وێنەگرتنی ئەستێرەکانی لە کەشکەڵانەکانی دیکەدا گرتۆتەوەو لە جیاتی سەرقاڵبوون بە تەکنەلۆژیا نوێیەکان، زیاتر تەئکید کراوەتە سەر دەرئەنجامەکان و نیشانەکانی لە کۆمەڵگا ئینسانییەکاندا.

بە سەرنجدان لە هەڵسوکەوتی نێوان ئەم ژانرە و بەرهەمەکانی پۆست مۆدێرنەدا، دەتوانرێت ناوی دوو ڕەهەند یان دیاردە بهێنرێت: پۆست مۆدێرنیزەکردنی ژانری زانستی- خەیاڵی و زانستی- خەیاڵی کردنی پۆست مۆدێرنیزم. لە ڕەهەندی یەکەمدا، نووسەری ڕۆمانە زانستی- خەیاڵییەکان لە بابەت و تەکنیکەکانی پۆست مۆدێرنیستی سوود وەردەگرێت، لە حاڵێکدا کە لە

دووەم ڕەهەنددا نووسەری پۆست مۆدێرن بنەما ئەنتۆلۆژییەکانی ڕۆمانی زانستی- خەیاڵی بۆ بەهێزکردنی بابەت و تەکنیکە پۆست مۆدێرنیستەکانی دەخوازێت. ڕۆمانی (نوازندە پیانو)ی ونگات نموونەیەکە لە ڕۆمانی زانستی- خەیاڵی لە جۆری یەکەم و لە نێوانی ڕۆمانە پۆست مۆدێرنەکاندا، دەتوانرێت ئاماژە بکرێتە گەلێ بەڵگە وەکو (بلیت منفجر شدە)ی ولیام باروز (*1962*)، (تی صفر)ی ئیتالو کالوینو (*1967*)، (سلاخ خانە شمارە پنج)ی کورت ونگات (*1968*)، (ستارە راتنر)ی دلیلو (*1976*)، (شور حوای جدید)ی ئەنجیلا کارتر (*1977*) و (رنگین کمان جاذبە)ی توماس پینچن (*1980*).

### 4- پارۆدی (*Parody*)

کاتێك نووسەر ڕووداوێك لە ڕابردوو یا کەسایەتییەك لە دەقێکی دیکەوە دەخوازێت و ئەو بە شێوەیەکی یەکپارچە و هەمئاهەنگ لە پێکهاتەی دەقەکەی خۆیدا دەهێنێت، لە ڕاستیدا ئیمکانێك دەخوڵقێنێت کە کەسایەتییەکان لە دونیایەکی خەیاڵییەوە بۆ دونیایەکی خەیاڵی دیکە کۆچ بکەن و بە هەمان بەڵگە هەموو پارۆدییەکان ڕەخنەیی، درکەیی (کنایی) و تەنزئامێز و بێ ڕەگەزی نۆستالۆژین، زیاتریش حاڵەتی گەمەیان هەیە تا فۆرمێکی ئەدەبی جدی. نووسەرانی پۆست مۆدێرن لەم ڕێبازە ئەدەبییە زۆر سوودیان وەرگرتووە. لەوانە دانلد بارتلمی کە پارۆدی و درکە بە دوو فۆرمی گرنگ و بنەڕەتی لە چیرۆکنووسینی هاوچەرخدا دەزانێت و جان بارت چیرۆکبێژی پۆست مۆدێرن کە لە کتێبی (قصەهای امواج- چیرۆکی شەپۆلەکان)یدا کەسایەتییە هاوچەرخەکان لەگەڵ جیهانی چیرۆکبێژان و ئەفسانەسازانی گەورەی وەك دۆنکیشۆت و شەهرەزاددا پەیوەست دەکات و لە ڕۆمانێکی دیکەدا بە ناوی (آخرین سفر دریانورد- دوایین گەشتی دەریاوان "*1991*") گەشت بۆ دونیای عەرەبی سندیبادی دەریا دەکات.



ڤلادیمێر نابۆکۆف

### 5- چیرۆکی ژیاننامەی خودی:

ژیاننامەی خودی یاخود سەرگوزشتەی خودی لەگەڵ چیرۆکی ژیاننامەی خودی جیاوازی هەیە. لە ژیاننامەی خودیدا نووسەر ئاشکرا خوڵقێنەری بەرهەمە و خوێنەر لەم لایەنەوە هیچی لێ شاراوە نییە، لە حاڵێکدا کە لە چیرۆکی ژیاننامەی خودیدا، نووسەر، نەك وەکو خوڵقێنەری بەرهەم، بەڵکو وەکو میوانێك ئامادەیی دەبێت. لە ڕاستیدا نووسەر وا پیشان دەدات کە چیرۆکەکەی تەواو خەیاڵییە و دەق بە ڕەهایی ڕوویەکی ژیاننامەیی و بە پێی حاڵ نییە بەڵکو بە تەواوەتی لەگەڵ ئەوەدا ناتەبایە. لە سوودوەرگرتن لەم تەکنیکەدا، هەندێك

جار تێڕوانینـەکانی دانای گشت و یەکـەم کەسـی پێکەوە پەیوەست دەبن. هەروەکو لـە کتێبـی ڕۆلان بـارت بـــە پێنووســـی ڕۆلان بـارت کــە هــەجوی زنجیرەیەکی درامی فەڕەنسی ئێکسە بە پێنووسی خـودی خۆیـەتی، دەق بـە وریاییـەوە، بـە خـەتی نووسەر دەستپێدەکات و بەو پێیەی کە ئەوەی لە دەقەکـەدا دێــت قســەی کەســێتی چیرۆکەکەیــە نـــەك نووســـەر و بـــە درێژایـــی ڕۆمانەکـــە تێڕوانینــەکانی یەکــەم کــەس و ســێهەم کــەس جێگۆڕکێ دەکەن.

**6-چەند جیهانی بوون:**

دیاردەی پیشاندانەوە، هەڵگری جیاوازییە لە نێوان دونیـای واقیعی و دونیـای خـەیاڵیدا، بـەڵام ئـەم دیاردەیـە بـە درێژایـی مێـژوو گـۆڕاوە و لـە حاڵـەتی لاسـاییکردنەوە و کاردانــەوەی ئاوێنــە ئاسای جیـهانی واقیعـی بـۆ دروسـتکردنی دونیـا خەیاڵییـــەکانی ســـەرچاوەگرتوو لـــە دونیـــا واقیعییـەکان گۆڕانی بەسەردا هـاتووە. نووسـەری پۆسـت مۆدێـرن نـە تـەنیا جیـهانی خـەیاڵی چیرۆکەکـەی دەخوڵقێنێـت، بـەڵکو هـەندێك جـار تەرحێك لە چەند جیهانی خەیاڵی دەخاتە بەرچاو، هـەروەك لـە (آتش رنگ پریـدە- ئاگری بێڕەنگ)ی نابـاکوفدا ئێمـە شـایەتی پێکهاتەیـەکین لـە چـەند جیــهان. لــەم ڕۆمانــەدا ڕووســییە، ئینگلســتان فەڕەنسـا و وڵاتــە یــەکگرتووەکانی ئەمــەریکا کــە هەرکام لەو شوێنانە ماوەیەك زێدی ناباکوف بوون، بە شێوەی جیهانێکی جیاواز لە جیهانی چـیرۆك دەردەکەون.

**7-تەکنیکی چەند سەدایی:**

ئەم تەکنیکە تەواو پەیوەستی تەکنیکی چەند جیهانییە، لەبەرئەوەی کە خوڵقـاندنی جیهانگـەلی جۆراوجۆر، هــەڵگری بـەکاربردنی جۆرەهـا زمـان، شـێواز، گوتــە، فۆرمــی ئــەدەبی و لــە بوارەکــانی پەراوێزنووســـی، هەرێنـــە (تصمیـــم)ی نابـــاو و تەشــکی نووســین و هێڵکارییــە. ئــەم تەکنیکــە شاعیران و نووسەرانی مۆدێرنیش بەکاریان دەهێنا بەڵام ئەوان بە زۆری هەوڵی یەکپارچەیی و یەکێتی بابــەتیان هــەبوو، لـــە حــاڵێکدا کـــە ئامــانجی نووســەرانی پۆســت مۆدێــرن تــەرکیب ســازییە جۆراوجۆرەکانــە لــە ئۆرکێســترایەك لــە جۆرەهــا گوتـار. بـۆ نموونـە لــە وێرانـە خـاکی، ئـەلیوتدا جۆرەها زمان و ئاماژە بەکاردەبات بەڵام لە تەواوی پەراوێزەکاندا ئەو بە جۆرێك زمانەکان و هاندەرە جیاوازەکـــان لـــە قـــاڵبی پێکهاتـــەی ئەفســـانە شـیعرییەکەیدا یـەك دەخـات، لـە حـاڵێکدا کـە لـە ڕۆمــانی "گــروە پلیــس"ی دانلــد بــارتلمیدا، جیاوازی نێوان زمانی جاز و زمانی پۆلیسەکان بە تەواوی هەست پێکراوە و لە "سلاخ خانە شمارە پنـــج"ی ونگـــاتدا، خوێنـــەر لەگـــەڵ زمـــانی سەربازەکان، زمانی خەڵکانی چینی ناوەند، زمانی بــە ئەدەبــەکان و پێکهاتەیــەك لــە زمــانی زبــر و ناشـرین، زمـانی ئەسـکیزوفرنیك، زمـانی سـادە، زمـانی ڕۆژنامەنووسـی و هـەندێك جـار زمـانێکی پوختدا ڕووبەڕوو دەبێتەوە. هەروەها دەقی ڕۆمان کۆمەڵەیەکـە لـە دەقـە ڕیالیسـتی، سوریالیسـتی، خــەیاڵی، تێکەڵەیــەك لــە زانســتی- خــەیاڵی و ڕاپۆرتـی ژیاننامـەیی. تەنانـەت دوو وێنــەمان لــە

ونگات و دەستخەتی ئەو هەیە و دەقەكە پڕە لە ئاماژە و سەرنج بە ڤێتنام، كوشتنی كەنەدی، مارترلوترکینگ، هەروەها ئاماژە بە كتێبی پیرۆز، حیكایەتەكان و نوكتە تەنزئامێزەكان و گوێزانەوەی قەولەكانی تئودور روتكە، سلین و گۆتە.

**8-ڕەگەزی گاڵتە و جدی نەبوون (تەنزی تاڵ):**

لە ئەدەبیاتدا، تەنز و درك و داشۆرین ڕەگەزگەلێكی تازە نین، بەڵام زاراوەكانی تەنزی تاڵ یاخود ڕەش (*black humor*) و داشۆرینی تاڵ (*bitter satir*) لە دەیەی *60* لە ئەدەبیاتی ئەمەریكادا سەری هەڵدا. لەم دەیەیەدا خۆش مەشرەبی و توندی بەسەر چێژی فەرهەنگیدا زاڵ بوو. تەنزێك بە توندییەكی بێرەحمانە و تاڵ، دزێوییەكان، خراپییەكان و ناهەموارییەكانی بە گاڵتە دەگرت و بابەتی ئەم تەنزانە زیاتر كارەساتەكانی جەنگی جیهانی، جەنگی سارد، تیرۆرە سیاسییەكانی وەكو تیرۆری جۆن كەنەدی و مارتین لوتركینگ، نەمانی ئەخلاقی خێزان و بڵاوبوونەوەیەكی فراوانی مادە بێهۆشكەرەكان بوو. نووسەرە پۆست مۆدێرنەكانی وەكو جان بارت، جوزف هلر، كن كیسی، توماس پینچن و كورت ونگات ئەم جۆرە تەنزەیان لە بەرهەمەكانیاندا نیشان دا و لەم لایەنەوە ناسرابوون.

**9-ڕەوانبوون سەبارەت بە فۆرمە ئەدەبییە بە ڕواڵەت ڕووكەشەكان:**

بە پێچەوانەی مۆدێرنیستەكان كە پێشەنگی و نوخبەگەرایی لە دیارترین تایبەتمەندییەكانیان بوو، نووسەران و ڕەخنەگرانی پۆست مۆدێرن، بە ئیلهام لە مشتومڕە فەلسەفییە پۆست مۆدێرنیزمەكان لە ڕەخنەی بنەڕەت و سەرچاوە (*origin*)، هەر جۆرە سنووربەندی و هێڵكارییەكی لە نێوان فەرهەنگی پێشڕەوایەتی و فەرهەنگی گشتیدا ڕەت دەكردەوە و لە ئەنجامدا ئەو دەستەیە لە فۆرمە ئەدەبییەكانی وەكو وسترن، ڕۆمانس، ڕۆمانی زانستی- خەیاڵی، چیرۆكە ترسناكەكان و چیرۆكە پۆلیسییەكان كە لە سەدەی مۆدێرنیستەكاندا وەكو بەرهەمگەلی نەگونجاو بۆ خستنەڕوو لە مەیدانی ڕەخنەدا ڕیزبەندی دەكران، بە بۆچوونی ڕەخنەگرانی پۆست مۆدێرن بە بەشێك لە گوتاری كۆمەڵگا تەلەقی دەكران.

**10-ڕاوی بێ متمانە:**

سوودبینین لە كەسێتیگەلی بێ متمانە و هەندێك جار پەشۆكاو وەكو ڕاوی، تەكنیكێكە كە پێشتر ڕۆماننووسانی مۆدێرنەش بەكاریان دەهێنا. هەرچەندە كە گومان و دوودڵی (*uncertainty*) زیاتر لەگەڵ لایەنی ئەبستمۆلۆژیانەی ڕۆمانەكانی مۆدێرنە و، ناجێگیری (*instability*) و قەیرانەكانی ناسنامە لەگەڵ لایەنی ئەنتۆلۆژیانەی ڕۆمانەكانی پۆست مۆدێرندا هەمئاهەنگی هەیە. خاڵی جێگەی سەرنج ئەوەیە كە خوێنەری وەها ڕۆمانگەلێك زۆربەی جار ناتوانێت لە چۆنێتی و ئەندازەی ڕاڕایی ڕاوی، ئاگایی و دڵنیایی پەیدا بكات و ئەمە خۆی فێڵێكە بۆ زیادكردنی كاریگەری ڕۆمان. هومبرت هومبرت لە ڕۆمانی (لولیتا)ی ناباكوف، جیسون كامپسون

لە (خشم و هیاهو)ی فاکنر و بیلی پیل گریم لە (سلاخ خانە شمارە پنج)ی ونگاتدا نموونەگەلێکن لەم تەرزە ڕاوییانە.

## پەراوێزەکان

*1-Lawrence cahoon, from modernism to post modernism, London Blackwell, 1998. P.11.*

*2-Ibid. p.13.*

*3-Ibid. p.11.*

*4-Linda Hutcheon, the politics of postmodernism, London: Routledge, 1995. P.23-26.*

*5-Brenda K. marshall. Teaching the postmodernism fiction of theory, Newyourk: Routledge, 1992. P.3-4.*

*6-Hans Bertens. The Idea of postmodernism. London Roultedge, 1995. P. 164.*

*7- Ibid. p. 168.*

*8-Brenda k. marshall. Teaching the postmodernism fiction of theory Newyork: Routledge, 1992. Pp.86.*

*9- Ibid. pp. 92-93.*

*10- Ibid. pp. 90.*

*11- Ibid. pp. 87. 100.*

*12- Ibid. pp. 121-127.*

*13- Ibid Hutcheon, the politics of postmodernism, London: Routledge, 1995. P.7.*

*14-Brian Mchale, postmodernism fiction, London: Routledge, 1989. P. 39.*

*15- Ibid, pp.9-10.*

*16- Linda Hutcheon. The politics of postmodernism. London: Routledge, 1995. P.3.*

*17-Brian Mchale. Postmodernist fiction, London: Routldge, 1989. Pp. 10-11.*

*18-Richard catlelt wikerson. Postmodern Dreamin. Conline <www. Dreamgate. com /pomo/ - 10> (13 may. 2000).*

*19-Drian Mchale. Postmodernist fiction. (London,. Routledge. 1989, p. 62-72.*

*20-Ibid, pp. 202-203.*

*21-Ibid, pp. 27-28.*

*22-Ibid, pp. 166-167.*

*23-The norton Anthology on American literature. Ed. Nina Baym. 4th ed. Newyork: norton, 1994. Pp. 1766-1767.*

## سەرچاوە


کارنامە

ژمارە 25 و 26 بهمن و اسفند 1380

# له ئەدەبی گەلانەوە

- سوورپێستێك له ئاستارا — بێژەنی نەجدی
- حەکایەت خوانی یان گێڕانەوەی چیرۆك.. چیه؟ — ئایلین کۆلوێڵ
- ژنەی پشت دەرگا مەفرەقینەکە — ئەحمەد شاملوو

# سوورپێستێك لە ئاستارا

## -دیسانەوە بۆ هاوسەرەكەم پەروانە-

• بێژەنی نەجدی
▪ لە فارسییەوە: نەجیبە ئەحمەد

-گوێم لێ نییە چی ئەڵێی؟
-ئەڵێم سوورپێستێك لێرەیە.
-سوورپێستێك؟ ئەویش لە ئاستارادا؟
سەرم پڕبوو لە قرموقاڵی ئەسپ سوارەكان، سەروچاوی پڕ لە پەڵەی ڕەنگ و دووكەڵی كەپرە سووتاوەكان.
-وەرە سەرێ تۆ، بزانم چی ئەڵێی و..
پەنجەرەكەم داخست.
بارانیش خۆی ئەكێشا بە شووشەكەدا.
لەبەر مورتەزا ڕۆژنامەكانم لەسەر كورسییەكە لابرد. لە دەرگاكەی دا. دەرگاكەم كردەوە، سەرمای ئاستارا و مورتەزا پێكەوە هاتنە ژوورێ. هەم سەرماكە و هەم مورتەزاش بۆنی ماسییان لێ ئەهات، سڵاوێكی كرد و یەكراست بەرەو كورسییەكە ڕۆشت. دەموچاوی پڕبوو لەو چرچانەی كە لەملاولەولای لووتی هەموو ڕاوچییەكاندا هەیە بێئەوەی پیر بووبێتن. لاشانی كورسییەكەی گرت و بەسەر قاڵییەكەدا تا لای كوورەكە كێشای.
لە ڕاستیدا خۆ مورتەزا ڕاوچیش نەبوو. بەچكە ڕاوچییەك بوو زستانان هەر لە دوورەوە سپێتی ژێر قۆڵی چاكەتەكەی عەرەقی هاوینی لەشی دەرئەخست.
بەچكە ڕاوچییەكان بۆ ماسیگرتن ناچنە سەر زەریا **بەڵام بۆ سەرچەم ئەچن**. لە قەراغ زەریا و لەسەر لمەكە، لەو جێگایەدا كە زەریا كەف ئەچڕێنێ (خۆ خۆشت دیت) یاری ئەكەن، پیاسە ئەكەن یان ڕۆدەنیشن تاوەكو ڕاوچییەكان بە

خۆیان و تۆڕەکانیانەوە لە ئاو بێنە دەر. هێ.. ها..
هێ.. ها.. تەنافەکان ڕاکێشن، ئینجا بەچکە ڕاوچییەکان دێن و ئەو ماسییانەی تا ڕادەی برینداربوون کلك ئەدەن بە زەویدا و بەرلەوەی مەرگ چاوەکانیان پڕکاتەوە (خۆ ئەشزانی کە ماسی چاو ناتروکێنن، ئەسڵەن هەر پێڵوویان نییە) لە تۆڕەکە ئەیانهێننە دەر و هەڵیان ئەدەنە سەر لمەکە. ماسییە مردووەکان دووبارە ئەدەنەوە دەم ئاوەکە و ماسییە سپییەکان بۆ ئەولا. سوورە ماسییەکان لێرە.. لەسەر لمەکە.. ئاوا ئیتر.. ئاوا.. تێکڕایان ئاوا. تا هێور بوونەوەی سەرجەمی ماسییەکان.

سەیر ئەمەیە ماسییەکان نازانن بقیژێنن. ڕۆژانی باران درەنگتر ئەمرن. لە دوایین ساتدا کە ئیتر توانای کلك لەقاندنیشیان نامێنێ و، لە گەرمداهاتنی پولەکەکانیان ناگەن (هەر ئێمەی مرۆڤ ئەزانین کە ئەمرین، تێنەگەی خۆ) چەند دڵۆپە بارانێك، دووسێ هەنگاو مەرگیان لێ دوورئەخاتەوە، ئەکرێ واش بوترێ کە مەرگ جگەرەیەك دائەگیرسێنێ و ئەوەندە لەو دەوروبەرەدا پیاسە ئەکات تا باران خۆش ئەکاتەوە.

مورتەزا لەسەر کورسییەکە خۆی گرمۆڵە کرد. سەرماکەی دەرەوەش ئەتوت زۆر بە خەستی موودنەی کوڕە ڕاوچییەکەی کێشابوو. دەستەکانی بۆ لە ئامێزنانی گەرما لە دەوری کوورەکە ئالاّ و، خۆشی زمانی چووبووە کلیلە. کە گەرمی بووەوە سوێندی خوارد کە بە چاوی خۆی سوورپێستێکی دیوە و بێئەوەی جانتاکەی کە لە پێستی بۆفالو نەبوو بخاتە سەر زەوی، لە چایخانەکەی بییوك ئاغا و هەروا بەسەر پێوە سێ پیاڵە چایی بەبێ قەند خواردووەتەوە و لەسەر سەهۆڵبەندانی شۆستەکەدا و لە چایخانەکەوە تا موسافیرخانەی خەزەر هەر چڵە شقارتەی داگیرساندووە و ویستوویەتی جگەرە خوساوەکەی پێ بکا.

پاشان جگەرەکەی فڕێداوە و بە نووکی چەکمەکەی دەرگای موسافیرخانەکەی کردووەتەوە.

یەگجار ئارام، ئەوەندە ئارام کە هیچ کەس گوێی لە دەنگی چەکمە و دەرگاکە نەبوو.

وتم: سەیرکە مورتەزا، ئەزانی سوێندی درۆ یانی چی؟

مورتەزا وتی: نە.. نازانم. من؟ هەرگیز.. بە گیانی باوکم نازانم.

وتم: باشە دەی. ناوی چی بوو؟

وتی: ئەو، کابرا سوورپێستەکە ناوی چی بوو؟

—ماراجینما.. بەڵێ.. ناوی ماراجینمایە.

وتم: یانی چی؟

—یانی پیاوێك بە سواری ماینە گریاوەکەیەوە تێئەپەڕێ و بە ماینە گریاوەکەیەوە لە سالاّنی گریانی دوور ئەکەوێتەوە.

—نە بابە!؟

وتی: بڕوا بکە.

—تۆ لە کوێ ئەزانی؟

—خۆی وتی. من چووم بۆ موسافیرخانەکە، قسەمان کرد، من یارمەتیم دا تا بتوانێ قژەکەی لە پشتەوە ببەستێ. تۆزێکیش حەشیشەم بوو. پێکەوە کێشامان، کە هاتیشمەوە ئەم شووشەیەی

پێ دام. لەم کاتەدا مورتەزا شووشەیەکی بچووکی بە قەد شووشەی ئەکسپکتورانت-ی (خۆ دیوتە) لە گیرفانی چاکەتەکەی دەرهێنابوو.

وتم: ئەمە چییە؟

وتی: گیراوەیەکە.

چاکەتەکەی مورتەزا بۆنی دوکەڵی لێئەهات. چاوەکانی بە دەموچاوییەوە بوون کەچی نیگای کەوتبووە پشت ئەو جگەرەیەی کە هەمان ڕۆژ بە حەشیشەکەوە کێشابووی.

دوای نۆ ساڵ کە بیستم تەرمی مورتەزایان لە دەرەوەی ئاستارا و لە قەراغ ئەو چۆمەی سنووری ئێران و سۆڤیەتە و بەبێ کێل و بەرد بە خاکیان سپاردووە، بە پیاسە بەرەو هەمان موسافیرخانە ڕۆشتم کە هەرگیز و هیچ سوورپێستێك بە نووکی چەکمەکەی دەرگاکەی نەکردبووەوە. لەبەر لێزمەی ئەو شڵێوەیەی ئەباری وەستام و لەو باڵکۆنە ڕامام کە ساڵانێك لەمەوبەر مورتەزا نیشانی دابووم. لێفەیەك بە پەرژینی باڵکۆنەکەدا هەڵخرابوو، کۆڵان نوقمی بۆنی لۆکەی خوساو ببوو.

وتم: ئەوێ خۆ کەسی لێ نییە؟

مورتەزا وتی: ڕۆشتووە.. عەسرێ ڕۆشت.. ڕۆشتووە بۆ ڕووسیا.

وتم: کەواتە کابرای سوورپێست ڕووسیش بووە؟

وتی: ڕووسی؟ نا.. ماراجینما ئەمریکییە، سوورپێستێکی داتاشراوە لە ئەمریکاییەکی خالیس و کۆمۆنیستێك.. من کەی وتوومە ئەو ڕووسی بووە؟ حەزم ئەکرد بە مشت بکێشم بە ددانە زەردەکانی مورتەزادا و، ئەو زەردەخەنەیەی کە هەندێ کەس بە زۆر و بۆ شاردنەوەی شتێك ئەیانگرێ.

هەتیوە خوێڕییە تازە بە تەمای ئەوەبوو بەو دەستوپێ ڕەقوتەقەیەوە، بە درەختی زەهرەماریشدا هەڵگەڕێ ئەیوت سوورپێستەکە پەنجەرەی باڵکۆنی موسافیرخانەکەی بەرەو بەفرەکە کردبووەوە و پرسیبووی مۆسکۆ لەم دەروبەرەدایە، نا؟

دواییش وتبووی چیتر ناتوانێ بیر خۆی بێنێتەوە کە چەند ساڵ لە بەخاکسپاردنی مەککارتی تێپەڕیوە و ئێستا داروەدەستەی سەناتۆر لە کوێ گۆڕبەگۆڕ بوون.

-ئەوان خێڵی ئێمەیان داپاچیبوو. باوە گەورە لە ئۆکلاهاما نێژرابو و، دایکیشم لە گۆڕستانی داچ سیتی گۆڕێکی خاڵی کڕیبوو و هەموو یەکشەممەیەك ئەچوو بە نینۆك گژوگیاکانی دەوروبەری هەڵئەکەند.

ساڵانی تاڵان و بڕۆی سەناتۆر کە سوورپێستە چەپڕەوەکانیان مێگەلئاسا و هەروا هەڕەمەکی ئەگرت. دایکم گۆڕەکەی فرۆشت و بە پارەی ئەو زەوییە کە ئەگەر باوە گەورەشی تێدا بنێژرایە ناچار ئەبوو تا ڕۆژی حەشر دەستەوئەژنۆ قونەقونی تیا بکات، بەرەو مەکسیك هەڵهات (باوەگەورە بەبێ حسابکردنی برینەکانی مەترێك و نەوەدوسێ سانتیمەتر باڵای بوو) لە سێ ئامۆزام دوانیان لە زیندانی سۆنۆرادا ئەوەندە سیفۆنە شڕی ئاودەستەکانیان چاککردبووەوە، شەوانیش ئەوەندەیان ئەنجیل خوێندبوو تا لە دواییدا ئەنجوومەنی لێبوردن ڕازی بوو کە ئامۆزاکان بە

قەشەی کڵێسا ماریا بسپێرن بۆئەوەی لە لایەك کێشەی ئاوەڕۆکان چارەسەر بکرێ و لە لایەکی تریشەوە حەزرەتی عیسا بتوانێ لایەنگرانی سوورپێستی خۆی لە نزیکەوە ببینێ.

سێیەمین ئامۆژاش لە ستۆدیۆیەکی فیلمبەرداریدا ڕەنگی چەوری لە سەروچاوی خۆی هەڵئەسویی و ڕۆژانەکەی دوای بیستنی شڵپەی گوللەی وینچستەرەکان وەرئەگرت کە بۆ ڕاهێنان ئەتەقێنران و ئەویش هەروا بە ئەنقەست خۆی لە ئەسپەکە ئەخستە خوارەوە. هەڵبەتە هەندێ جار پێستی سەرشان و ئانیشکی دائەماڵران بەڵام لە دەمەدەمی ئێوارەدا ئەیتوانی پارچەیەك گۆشتی گا بکڕێ و بە نیگایەکی ئاسوودەتر و ڕەزامەندتر لە بینینی وێنەی بزەکەی جۆن کەندی لەو پارچە گۆشتە سوورەوەکراوەی ناو قاپەکەی ئەڕوانی. هەڵبەتە گۆشتی گا ناتوانێ لە هیچ قاپێکدا پێبکەنێ.

وتم: تۆ باوەڕ بە قسەکانی ئەکەیت؟

مورتەزا وتی: ئەی چۆن باوەڕی پێ ناکەم، بۆ تۆ تا ئێستا گۆشتی گات نەکڕیوە؟

وتم: مورتەزا توخوا لەتێ کەرە هەڵگرە و بیخۆ، پاشان سەعاتێك بخەوە.

وتی: سوورپێستەکە ئەیوت ساڵی *1947*، دوو ڕۆژ بەر لەوەی ئەمریکییەکان پەلاماری دۆڵەکەی ئێمە بدەن کۆڕەوی میحنەتباری ژن و منداڵ و ئێستر و پیرەکانی خێڵ بەرەو کێوەکانی دەوروبەری دۆڵەکە دەستی پێکرد کە پڕ بوو لە تاشەبەردی نووك تیژ و پیرۆز. گەنجەکان مانەوە تا لە ناوەڕاستی دۆڵەکە و لە قەراغ چەمەکەدا، لەوسەر زەوییە ڕووتەدا خۆیان بدەن بە دەمدا بۆ ئەوەی کامیۆن و نەفەر هەڵگرەکان کە سیخناخ بوون لە سەربازانی ئایزنهاوەر نەتوانن لە تاشەبەردەکان نزیك بکەونەوە. ئەو ڕۆژانە من دوانزە ساڵان بووم و هێشتا فرۆکەم نەدیبوو. بەر لە گەیشتن بە نووکی تیژی بەردەکان دەنگێکم گوێ لێ بوو بە ژوورسەرمەوە ئەڕۆشت. دەنگێکی دوور.. ئاوا.. هوو.. هوو.. هوو.

ئەتوت هەزاران مردوو لەو سەر کێوەو بە دەمی نووقاوەوە ئەیان لاواندەوە.

باوەگەورە لە ئێسترەکە دابەزی و ئەوانی تریش وەستان تا هەریەکەیان بە نیگایەکی پڕ لە جۆرە ترسێکی ئاینییەوە لە بەشێکی ئاسمان ڕامێنن.

من هەر دە پەنجەم گرتبوو بە بەر ناوچەوانمەوە و خۆرەکەش ڕێکوڕاست ئەیدا لە دەموچاوم.

لە دواییدا باوەگەورە هاواریی کرد ئەوەتان، لەوێن و دەستی ڕاستی بێئەوەی داخوازییەکی لە خوا ببێ ئاراستەی ئاسمان کرابوو و چەند پەڵەیەکی ڕەشیش لەو لای نینۆکەکانی باوەگەورەوە لە ئاسمانەوە ئەهاتنە خوارێ و دەنگەکانیشیان هەر ئەهات و گەورەتر ئەبوون و ئەتەقین.

ئێسترەکان ئەم پێ و ئەوپێیان ئەکرد، بە چاوی داچەقیوەوە ئەوەندەیان گوێ لەو زرمە و ناڵانە بوو تا هەموویان بەلەسە بوون. بیرم نایە کەسێك لە ئێستر کەوتبێتە خوارەوە یان پێشتر هەموویان دابەزیبێتن. ژنەکان دەستیان کرد بە

قــاووقیژ، قــاووقیژێك هــەرگیز بــەو هــاوار و سەمایانەیان نەئــەچوو کــە بــۆ سوپاســگوزاری لــە دەوری ئاگر ئەنجامیان ئەدا.

لەناو هــەمان ژاوەژاوی ئــەو قیــژەو هەرایانــەدا دەنگی پارچەپارچە بوونێك لە فڕۆکەکەوە گەیشتە گوێمــان. باوەگــەورە نــەڕاندی ئافرەتــەکان ببەنــە پشــت ئــەو تاشــەبەردانە. برینــدارەکــان.. فریــای برینــدارەکــان بکــەون. یــەکێك هــاواری کــرد، هــەموو سەلامەتن سەرۆك.

باوەگەورە وتی: چیی؟

دەنگەکان دیسان پەیدابوونەوە. ئەمجارەیان لە ناوەڕاستی ئاسمانەوە، لەو جێگایەدا کە هەتاو بە نیوەڕۆی خۆی دەگات.

سالانێك دوای ئــەوە تێگەیشــتم کــە دەســتڕێژی دووری تــۆپ و تفــەنگ ئــەتوانن ئــەو دەنگــە پارچەپارچە بووانەیان هەبێت و بەو دەنگانەش کە لە پڕێکدا ئەتەقنەوە ئەڵێن بۆمباران.

–بگەڕێنەوە.

نــازانم لــە کوێــوە بــوو ئەمبیســت بگەڕێنــەوە، بگەڕێنەوە بۆ دۆڵەکە. تا ئێسترەکانمان دۆزییەوە و خۆمان گەیاندە دۆڵەکە خۆر ئاوابوو.

زەردەپەڕێکی سوور کەوتبووە سەر زەوی.. تا کــەوتبووە ســەر ئاوەکــە. لــەوێدا هــەواڵێکی کامیۆنەکان و نەفەرهەڵگرەکان نەبوو نەشمانتوانی تەنانەت شوێنەواری تایەیەکیش لە قەراغ چەمەکە و تەرمی گەنجەکاندا بدۆزینەوە. باوەگەورە داوای لێکردین کە مردووەکان لە جێگایەکدا کۆکەینەوە و گــەورەکانیش بــڕۆن هــەرچی مــوو و گۆشــتی ســووتاوی ئەوانــەی هیــچ شــێوەیەکیان نــەماوە

هــەڵیانگرن و لــەم لایــەوە، زۆر دوور لــە چەمەکــە بیانخەنە سەریەك.

مورتەزا وتی: ئەتوانم جگەرەیەك بپێچمەوە؟

وتم: هەر ناماقوڵییەکت لەدەست دێ بیکە.

چوومــە دەستشــۆرییەکە و ســەرم خســتە بــەر بەلوعەکە و تا سەرم تەڕی بوو لە سەرمای ئاستارا ئاوەکــەم کــردەوە و بــیرم لــە لێــوی خــواروو و چەناگەی مورتەزا کردەوە کە بە هۆی تێکەڵکردنی تووتن و حەشیشەوە کەوتبووە لەرزین. پیاو ئەبێ تەختەی نوقسان بێ تا دانیشێ و گوێ بۆ مورتــەزا شل بکات. ئەیوت گوایە سوورپێستەکە وتبووی.

–ئێمە بنباڵی تەرمەکانمان گرت و کێشــەکێش بــەری پێشــیان لــە ئەرزەکــە ئەخشــا، تــا لای ئێسترەکانمان بردن. بڕێکیان زۆر سەنگین بوون بە تایبەت ئەوانەی کە چەمەکە لێوی دابوو بەیەکدا و تــەڕی کردبــوون. بــەڵام ئەوانــەی بۆنــی گۆشــتی سووتاویان لێئەهات سووکتر بوون.

باوەگــەورە فــەرمانی دا کــە ژنــان بچــن و چیلکەودار بێنن، خۆشی باقەباقە چیلکەکانی ئاگر ئەدا، ئامۆزاکانیشی نارد تا مەنجەڵی گەورەگەورە بێنن و پڕیان بکەن لە ئاو و بیانخەنە سەر ئاگر، ج ئێستا ئیتر شەو داهاتبوو، شــەوێکی ڕەشــی ئــەوتۆ کــە تاریکییەکــەی نەیئەهێشــت ڕەنگــی پێســتی خۆمانمان بیربکەوێتەوە، ئەوانە نەبێ کە لە پەنای ئاگرەکەدا بوون، چاوەکانیــان ســوورئەچوونەوە و لەســەر قۆڵ و بازوو و ســنگی ڕووتیــان ســوورایی تۆخ و تاریکی بڵێسە و دووکەڵەکان ئەو خوێنەی بیر ئەخستینەوە کە هەمان ڕۆژ لە پەنای چەوولمی چەمەکــەدا دیبوومــان و لەبــەر هــەتاودا بۆگــەنی

کردبوو. هەر ئەو شەوە ژنەکان لەسەر لمەکە دانیشتن و بە هەڵخولاندنی سەروشان و دەسکی دارینی دەستاڕەکان (لە هەمان ئەو دەستاڕانەی کە خۆشمان هەمانە) گەڵای وشک و تۆوی گیاگەلێکیان ئەهاڕی کە ئێستا ناویان نازانم، ئاردەکە لە لێواری دەستاڕەکەوە ئەڕژایە سەر پارچە خامێکی سپی. ئامۆزاکان مشت مشت لێیان هەڵئەگرت و لە مەنجەڵەکانیان ڕۆئەکرد.

تا پیرەکان مناڵەکانیان کردە خەو، ئێمە پانچاکانمان لە پەنای تەرمەکاندا ڕیز کرد، بۆنی مەنجەڵەکان کە دڵڕەقانە و بێڕەحمانە تاڵ بوو، ئەو ناوەی تەنیبوو. (پانچا جۆرە شوشەیەکە، تۆزێ لە لێوان گەورتره و سەرێکی فلزیشی هەیە) باوەگەورە وتی: با ئافرەتەکان بچنە ناو کەپرەکان و مەن و ئامۆزاکانیش بچین مردووەکان ڕووت بکەینەوە، کراسی هەندێکیان بە خوێنەکەوە وشک ببووەوە و بە پێتسییانەوە نووسابوو.

جا سا ئەمە پێست بوو یان کراس کە دامان ئەکەندن! زۆر جوان بیرم نییە. پاشان باوەگەورە هات و بە دەم ویرد و دوعایەکەوە کە لەودیو تووڕەبوونێکی گریاوییەوە ئەبیسترا یەکەیەکە تەرمە ڕووتکراوەکانی لە باوەش ئەکرد و بە تەقدیسێکی خەمبارانەوە ئەیخستنە ناو مەنجەڵەکان. هەردوو دانە و سێ دانەی ئەخستە مەنجەڵێکەوە، ئیتر بەو جۆرە تا ڕۆژ بووەوە سەرمای لینجی بەیانی بە لەشمانەوە نووسا.

کڵپەکانیش بەسەر خۆڵەمێشی ئاگرەکانەوە کپ بوونەوە. زەردەی دابوو و نەدابوو، مەنجەڵەکانیش ساردببوونەوە کە خستماننە سەر لمەکە و دانیشتین و هەروا لە باوەگەورە وردئەبووینەوە کە هەردوو قۆڵی تا ئانیشک ئەکرد بەناو مەنجەڵەکاندا و یەکەیەکە و هەندێ جاریش دوودوو مردوەکانی لەسەر لەپی دەستی دەرئەهێنا و ئەیخستنە ناو پانچاکانەوە، ئەو مردووە خووساوانەی سەریان بەقەد گوێزێکی بچووک و دەست و پێشیان بە ئەندازەی دەمبوسێکیان لێهاتبوو.

ڕەشێنە و سپێنەی چاوەکانیان ببوون بە ئاو و پێستیشیان چرچ و پیرەڵۆك ببوون، (وەکو ئەوکاتەی کە لە حەمام دێینە دەرەوە) تا نیوەڕۆ پانچاکانمان لەبەر هەتاودا دانا و پاشان سێ ڕۆژی تەواو بە دەوری ئەو پانچایانەدا خولاینەوە، دانیشتین، چەند سەعاتێکیش چەمەریمان بە دەوریاندا گێڕا. سەمایەکی میحنەتبار کە وتووێژی یەك لایەنەی دەست و پێ و لەشمان بوو لەگەڵ خوادا. ئافرەتەکان دەستیان ئەدا لە قوولەپێیان و پاشان هەمان دەستیان بەرەو ئاسمان بەرزئەکردەوە و ئەلالآنەوە.

–ئیلو.. ئیلو.. ئانیتانیائونارا

نون ئانیتانیائونارا.

مورتەزا وتی گوایە کە لە سوورپێستەکەی پرسیبوو یانی چی؟

سوورپێستەکە وتبووی یانی خوایە، خوایە، ئێمە مناڵەکانی خۆمان لە تۆ ئەوێ.

"مناڵی تر نا" هەر ئەم مناڵانە.

–ئانیتانیائونارا.

نون ئانیتانیائونارا..

ڕۆژی سـێیەم ئافرەتـەکان ڕوویـان کـردە کەپرەکەی باوەگەورە و بە شەرمەوە داوایان لێکرد کە مۆڵەت بدات تێکڕای دایکان قژیان بتاشن و بەمجۆرە ئیتر ئەوان لە ژن بوونی خۆیان ئەبڕێن و بەو قژە تاشراوەشەوە ڕەنگە پرسەکەیان بڕژێتە سەر زەوی، ڕەنگە پرسەکە.. ڕەنگە زەوی.. ئیتر هەرکە ئافرەتەکان بەوجۆرە بە کەللەی سپی و دەموچاوی ئەبڵەق و سەرگەردان لە نێوان ژن بوون و لێچوونەوە لە ژن بووندا، لە کەپرەکەی باوەگەورە هاتنە دەرێ، پیاوەکان ڕوویان وەرگێڕا، ئەوان ئیتر دەبوایە تا لە ئامێزگرتنەوەی هاوسەرەکانیان، سالانێك لە دەرەوەی کەپرەکە پیاسە بکەن و چاوەڕێ بکەن تا قژی هاوسەرەکانیان درێژ بێت و بڕژێتە سەر شان و مل و پێستی مەمکەکانیان. بۆیە هەریەکە لە پیاوەکان پانچایەکی هەڵگرت و ڕووە و خۆرەکە ڕایگرت و لە مردووەکان کە ئێستا ئیتر لە شووشەکاندا وشك و بچووك و سووك بوونەتەوە، وردبوونەوە، ڕۆژی دوایی شووشەکانمان خستە ناو هەگبەی سەر ئێسترەکان و لە دۆڵەکە دوورکەوتینەوە. ئەوەندە دوور کە هیچ کاممان دەنگی چامەکەمان نەئەبیست.

من لە سوورپێستەکەم پرسی..

وتم: بەسیەتی ئیتر مورتەزا.. باشە من بۆ ئەبێ گوێ لە هەقایەتی مێشی تۆ بگرم. مورتەزا وتی: هەقایەت؟ مێش؟ تۆ بۆ تێناگەیت، یانزە ساڵ دوای ئەوە ماراجینما-یان گرت، جەلبیان کرد ئەزانی بۆ؟ چونکە پۆلیس لەناو جانتاکەیدا و لە نێوان کتێبەکانی لینین-دا پانچایەکیان دۆزیبووەوە.

وتم: تۆ تێکچوویت.

مورتەزا وتی: چەند ساڵێك لەمەوبەر کە ماراجینما لە زیندان هاتە دەرەوە، کتێبەکانیان دایە، بەلام پانچاکە...

وتم: ئەزانم، پانچاکەیان نەدایەوە، چونکە تۆ تێکچووی.

مورتەزا وتی: ماراجینما لە منی پرسی تۆ ئەزانی چ بەڵایەك بەسەر مارکسیسدا هات. وتم نە، من لە کوێ بزانم.

وتم: وایە.. لە کوێ بزانی.. چونکە ئێمە هەموومان تێکچووین.

مورتەزا وتی: ئاخر بۆچی؟

وتم: چونکە هیچ سوورپێستێك ناتوانێ بە فارسی بدوێ.

مورتەزا وتی: ناتوانێ؟ ناتوانێ؟ سەیری کاکم کە.. ئەو ساڵگەلێکە لەم وڵاتەدا ئەژی. لەو ساڵانەی ڕەشبگیرییەدا چوو بوو بۆ کوردستان.

وتم: تاچی.. چوو بوو بۆ کوردستان تاچی؟

مورتەزا وتی: (ئێستا مورتەزا لەلای کوورەکەوە بەرەو لای پەنجەرەکە چووبوو.. بەفر سەرماوسۆڵەی خۆی بەسەر سەربانی بیناکانی ئەوبەری پەنجەرەکەدا ڕاخستبوو، جگەرەکەی مورتەزا لەناو تەپڵەکەکەدا و چەند هەنگاوێك دوورتر لە قۆزەکانی مورتەزا خەریکبوو ئەبوو بە دووکەڵ).

وتی: چووبوو بۆ کوردستان ئیتر.. تۆ جامەکەت ئەوەندە پڕبووە کە هەر تێشناگەی من چیی ئەڵێم.. چووبوو تا کوردەکان فێر بکات کە چی و چی بە یەکەوە بهاڕن و بیکەنە ئارد، کە

چـەندی بکەنـە نـاو مەنجەڵــەوە تـا سـەروکەللەی مردووەکانیـان ئـەوەندەی گوێزێکـی لێبێـت، کـە پێستی کوردەکان ئەوەندە چرچ ببێ کە هەرکەس بتوانـێ تـەرمێك بخاتـە نـاو پانچایەکـەوە و پانچاکەش بخاتە گیرفانی چاکەتەکەی، کە بەوانە بڵێ چـۆن مـرۆڤ ئـەتوانێ بـە قۆڵـی چاکەتەکـەی فرمێسکی سەر ڕوومەتی بسڕێ.. تێئەگەی. ئێستا تێئەگـەی کـەرە.. نـۆ سـاڵ دواتـر، ئـەو ڕۆژەی هەواڵیان هێنا کە مورتـەزایان لـە قـەراغ چەمەکـەی سەر سنوور و بەبێ کێل بە خاك سپاردووە، چووم لە سنووقەکەی ژوورەکەم بوتڵی گیراوەکەم هێنایە دەرەوە. خۆ، وتبووم کە بە ئەندازەی شووشەیەکی ئەکسپکتۆرانت بوو.

سەرەکەیم کردەوە. بۆنم کرد. پاشان ڕۆم کردە ناو قاپێکەوە. ئاوم کردە سەری. پاشان دەستەکانم تێخست، سەرمام بوو، نـە سـەرماکەی ئاسـتارا و کوچـەکانی، سـەرمایەك کـە لـە پشـتی سـەری مرۆڤـەوە دەسـت پێئـەکات و بـە ئێسـقانەکانیدا ئەچێتە خوارەوە و لەگەڵ خۆشیدا هەموو ئەوانەی مـرۆڤ خۆشـی ویسـتوون و بـاوەڕی پێکـردوون ئەیانشوات و ئەیانباتە خوارێ.

هەرکە دەستەکانم لـە کاسـەکە هێنایـە دەرەوە سەیرم کرد لـەپی دەستەکانم، پەنجەکانم.. خوایە ئێسـتا چـی بکـەم.. پەنجـەکانم ئـەوەندە بچـووك ببوونەوە کە ئەبوایە تا لای چاوم بەرزیان بکەمەوە تا بیانبینم.. لەبەرئەمەیە کە من ئێستا پەنجەم هەر نییە.

یـانی هەمـە.. بـەڵام هەریەکـەیان ئـەوەندەی دەمبوسـێکیان لێـهاتووە.. بۆیـە سـەبارەت بـە مورتەزا.. سەبارەت بە سوورپێستەکە.. سەبارەت بە کوردەکان هەرچیم لـەبیر ماوە بۆت باس ئەکەم "بنووسە پەروانە، توخوا بینووسە" خۆت چاوت لێیـە کـە من دەسـتەکانم ئـاواهین، پەروانـە توخـوا بینووسە.

## سەرچاوە

ئەم چیرۆکە لەم کتێبەوە وەرگێراوە:

(دوباره ازهمان خیابانها) ساڵی چاپ *1379*.

# حەکایەت خوانی
# یان گێڕانەوەی چیرۆك.. چییە؟

• ئایلین کۆلوێل
▪ لە ئینگلیزییەوە: شێرزاد حەسەن

"ئەو چیرۆکە سەیروسەمەرانەی لە یادی من ماون، هەر لە سەردەمی منالیمەوە، نایانگۆڕمەوە بە هیچ گەنجینەیەکی دونیا".

وتەیەکی "مارتن لوپەر"

حەزکردن بە چیرۆك دیاردەیەکی گشتی و سەرتاسەرییە، هەرچەندە منالان لە یەکدی جیاواز بن و هەریەکە و خاوەنی توانا و کەسێتی خۆی بێ، دواجار بە تێکرا پێویستیان بە چیرۆك هەیە و حەز بە گوێگرتنی دەکەن. لە هەموو سەردەمێکدا و نەوە دوای نەوە دایکان و باوکان ڕاهاتوون لەسەر داوای شێلگیرانەی منالەکانیان کە هەمیشە پاڕاونەتەوە:

"دە.. دەی چیرۆکێکمان بۆ بگێڕنەوە"

دیارە مێردمنالان و هەرزەکارانیش بە قەد منالانی لە خۆیان بچووکتر حەز بە چیرۆکان دەکەن گەر دەرفەت و ماوەیان بۆ بڕەخسێ. شتێکی ڕێکەوت نییە کە ڕێژەیەکی زۆر لەو کتێبانەی کە لە کتێبخانەکاندا دەبرێنە دەرەوە، لە لایەن منالان و هەرزەکارانەوە قەرز دەکرێن، زۆربەشیان چیرۆکی هەمە چەشنەیە، زۆربەی ئەو کەسانەشی کە بەرامبەر تەلەفزیۆن دادەنیشن؛ زۆر بە سادەیی بۆ ئەوەیە کە بزانن (دوایی چی ڕوودەدا).

مـن بـۆ سـەدەها منـداڵ چـیرۆکم گێڕاوەتـەوە، منالآنی سەر بە قۆناغ و تەمەنی جیاجیا، بۆ منالّـە دەم بـە پێکەنینـەکانی هینـدی ڕۆژئـاوا لـە وڵاتـە یـەکگرتووەکان، لـە (تۆرنتـۆ): بـۆ پەناهـەندە و کۆچەری و دەربەدەری هەموو میللەتان. چوار سەد ژنە ڕەبەنی دێریم بینی لە هۆڵێکـی تـاریکی نـاو لـەندەن-دا بـە چیرۆکێکی پـڕ بـەزم و قۆشمـە وەك مەنجـەڵی سـاوەر دەکـوڵان و کەوتبوونـە قاقـا و تریقە، کۆمەڵێك ئافرەتی پەناهەندەی "ناوەڕاستی ئـەوروپا"م بینـی کـە هـەم دەگریـان فرمێسـکیان ڕانـەدەگرت و هـەم زەردەخەنەشـیان لـە لێـوان دەباری، هەر تەنها لەبەرئەوەی گوێیان لە چیرۆکێك گرتبـوو کـە بـە منداڵیـش لـە وڵاتـی خۆیـاندا بیسـتبوویان. قوتابیـان و مامۆسـتایان، منـالآن و دایکـان و باوکـان تێکـڕا لـە خۆشـی و لـەزەتی بیسـتنی چـیرۆکێکدا دەتوێنـەوە و لـە هـەمان ئەزموون بەشداریش دەکەن. دەتوانی سەیری تاکە منالّێك بکەی -یان ئاوەتا پـەنجا منـاڵ و- لێیـان وردبیتەوە کە چۆن گوێ بۆ چیرۆکێك شل دەکەن، بەو مەرجەی زۆر بەتام بۆی بگێڕدرێتەوە، ئەوسا هەسـت دەکـەی کـە چـیرۆك چ تـام و خۆشـییەك دەبەخشێ. زۆر جێی خەفەت و داخە کە لە ژیانی ئەمڕۆکەماندا چەندەها داوا و شتی وا هـەن کە لـە وەختـی هـەرزەکاران و مـێردمندالآن و منـالآنیش دەخوات و ناهێڵن کەڵك لەو کاتی دەست بەتاڵییە ببینـن، بـە ڕادەیـەك کـە ئـەوەندە کاتیـان نامێنـێ بۆئـەوەی دانیشـن و گـوێ لـە چیرۆکـان بگـرن وەك جاری جاران کە بـاو و باپیرانمـان و منـالآنی ئـەو سـەردەمە دێرینـە بۆیـان دەکـرا. بـەڵام سـەرباری ئەوەش ئەگەر بە ڕاستی و لە دڵەوە بمێنێ کارێك ئەنجام بدەین، ئەوە بێشك ئەو وەختە دەدۆزینـەوە کە ئەو کارە ڕاپەڕێنین.

بۆچـی چـیرۆك دەگێڕینـەوە؟ لەبـەرچی نایخوێنینـەوە؟ بـۆ هـەردوو جۆرەکـەیان جێگـە و ڕێگەی تایبـەت بـە خۆیـان دەوێ تـاوەکو بتوانـین بگەینـە ئـەنجام، بـەڵام لـە نێـوان هـەردووکیاندا جیاوازییەکی گەورە هەیە؛ جیاوازی لە نێوان ئەو منداڵـەی گـوێ لـە چیرۆکێك دەگـرێ لەگـەڵ ئـەو هەرزەکارەی بە پەرۆشەوە دەیخوێنێتەوە.

ئـەو کەسـەی کـە چیرۆکەکـە دەخوێنێتـەوە: پێویستی بەوە دەبێ بەردەوام وریای ئەو کاغەزە چاپکراوەی بەردەمی بێ و تەنها جارجارە سەر بەرزبکاتەوە و سـەیری گوێگرەکـانی بکـا، کـەچی "حەکایـەتخوان" سەربەسـتە و ڕووبـەڕوو چیرۆکەکـەیان بـۆ دەگێڕێتـەوە و دەشـتوانێ دیقەتیان لێ بگرێ بۆئـەوەی بزانـێ تـا چ ڕادەیـەك چیرۆکەکـە کاریـان تێدەکـا و چۆنـی دەقۆزنـەوە. سـەبارەت بـە منداڵیـش دەنـگ و کەسـییەتی حەکایـەتخوان یـان ئـەو کەسـەی کـە چیرۆکەکـە دەگێڕێتـەوە گەرموگوڕییـەك بـە چیرۆکەکـە دەبەخشـێ و بـەپێزتر و دەوڵەمـەندی دەکـا. لـەم بارەیـەوەش ئـەم کردەیـە دەبـێ بـە شـتێکی ڕاستەوخۆی وا کە پێویست بە ڕوونکردنەوە ناکا و بـۆ هـەردوولا دەبـێ بـە ئـەزموونێکی زاتـی و هەسـتکردن بـە ڕۆح و کەسـییەتی یـەکدی، جگـە لەوەش پەیوەندییەکی توندوتۆڵ و نزیك لە نێوان منداڵەکـە و حەکایەتخوانەکـە پـەیدا دەبـێ و بنـج دادەکوتێ.

گێڕانەوەی چیرۆك لە سێ ڕەگەز پێکهاتووە: چیرۆك، حەکایەتخوان و گوێگران. لە گێڕانەوەی هیچ چیرۆکێکدا سەرناکەوین گەر لە نێوان ئەم سێ ڕەگەزەدا هارمۆنی و تەبایی دروست نەبێ، تەنها بە ڕاگرتنی ئەو پارسەنگە خۆشییەکی هاوبەش هەموو لایەك دەگرێتەوە.

هەر لە سەرەتاوە دەبێ ڕەچاوی ئەوە بکەین کە ئەو چیرۆکەی بۆ گێڕانەوە شیاوە، هەمیشە دەبێ ئەوەندە کورت بێ کە بە یەك دانیشتن تەواو ببێ، جا ئەگەر ئەو چیرۆکە ڕووداوێکی ڕاستەقینەی ناو ژیان بێ یان خەیاڵی و دروستکراو بێ. ژمارەی ئەو چیرۆکە جۆراوجۆرانەی کە لەبەردەستی حەکایەتخوانێکی هاوچەرخدا هەن گەلێ بێشومار و بێسنوورن. لەوەتەی یەکەمین مرۆڤ کەوتۆتە قسەکردن: لە هەموو دونیا و سەردەمێکدا بە هەزارەها چیرۆك وتراونەتەوە و دەوترێنەوە. هیچ وڵاتێکیش ئەوەندە کۆن و دێرین نییە کە چیرۆك بکا بە موڵکی خۆی، گێڕانەوەی چیرۆك دیاردەیەکی وا نییە کە تایبەت بێ بە گەلێك و لە خەڵکی دیکەی زەوت بکا، ئەگەریش چی ئەم چیرۆکانە هەرگیز نەنووسرابێتنەوە. زۆر چیرۆك هەن پەیوەندییان بە ژیانی ڕۆژانەی خەڵکەوە هەیە، یان ئەوەتا سرووشت دەکا بە کەرەستەی خۆی، کەڵکوەرگرتن لە میتافیزیك بۆ هەمیشە سەرچاوەیەکی گەورە بووە، هەر ئەوەشە وای کردووە کە زۆر جاران خواوەندەکان و فریشتە و جنۆکە و خێو و دێو و شەیتان ببنە کارەکتەری چیرۆکەکان، هەر هەمووشی لە ڕێگەی پشتبەستن بووە بە سیحر و خەیاڵ، ئەو چەشنە چیرۆکانە خەڵکیان خستۆتە سەر گریان و پێکەنین، جگە لە چاندنی هەندێ لە خوو و خدەی جوان و ڕەوشت و ڕەفتاری پاك و هەرچییەکی کە پێی دەوترێ ئازایەتی و سۆز و وەفا و بەزەیی لەنێو یەکە یەکەی ئەندامانی خێزانەکاندا، یان ئەوەتا کێشەی بەردەوام و هەمیشەیی نێوان خێر و شەڕمان بۆ بەدیار دەخا، کەواتە هەر چیرۆکە و بە جۆری خۆی دەمانباتە ناو ناخ و ناوەڕۆکی مرۆڤی سەر ئەم زەمینە و ئاشنامان دەکا بە بەشێك لە ئەزموونە ڕۆحییەکەی. بۆ ئەوەی چیرۆك و گوێگر بە یەکەوە گرێ بدەین، پێویستمان بە حەکایەتخوانێك هەیە کە ئەو چیرۆکە بگێڕێتەوە. هیچ ڕێگە و شێوازێکی تایبەت و سەرکەوتووشمان نییە بۆ خوڵقاندنی حەکایەتخوانێك، چونکە هەموو مرۆڤێك ئەو هێزە شاراوەی تیا هەیە کە بتوانێ چیرۆك بگێڕێتەوە، کامە مرۆڤی بەستەزمان کە لە هەموو کەس بێ دەم و پلتە دەتوانێ زۆر بە جوانی و ڕەزامەندییەوە کەڵك لە تاقیکردنەوەکانی خۆی وەربگرێ، چونکە زۆر شیاوە تاقیکردنەوەکانی خۆت ببنە مایەی خۆشی و تام و چێژێکت پێ ببەخشن، بۆیە بە قووڵی و لە دڵەوە بۆیان دەژی و حەزیش دەکەی وەك سەرگوزشتەیەك بۆ ئەو خەڵکەی دەوروبەری خۆت بیگێڕیتەوە. شتێکی ئاسانە باسی ئەو ڕووداوانە بکەی کە بەسەر خۆت هاتوون، چونکە ورد و درشتی ئەو ڕووداوانەت دێنەوە یاد و دەیانبینی و هەستیان پێ دەکەی کاتێك بە وشە دەیانڕازێنیتەوە.

لێرەدا باسی ئەو پێویستی و خاڵە گەوهەرییانە دەکەین کە لە گێڕانەوەی چیرۆکێکدا

دەستمان دەگرێ و سەرمان دەخا: یەکەمین شت ئەوەیە کە بە تام و چێژێکەوە چیرۆکەکە بگێڕینەوە، بە شێوەیەك وەسفی شتەکان و ڕووداوەکانی ناوی بکەین کە دەربکەوێ تەواو تێکەڵی چیرۆکەکە بووین، وا بە وردی کە وەك وێنەیەکی جوان و ئاشکرا بێتە بەرچاومان، ئارەزوویەکی وا گەرم بخوڵقێنین کە گوێگرەکە بتوانێ تێمان بگا و بەشدارییەکی درووست و تەواوی هەست و نەستمان بکا.

هەندێك کەس هەر لە خۆیانەوە و بە سەلیقە حەکایەتخوانی چاکن و دەتوانن ڕەحەت و ئاسان و بەوپەڕی بڕواوە چیرۆك بۆ خەڵکی بگێڕنەوە. بەهەرحاڵ لەم بوارەدا زۆربەی خەڵکی لە هێز و توانای خۆیان بە گومانن و کەچی هەندێکی دیکەشیان گەیشتوونەتە ئەو بڕوایەی کە بڵێن گێڕانەوەی چیرۆك شتێکە کە هەرگیز لە سنووری تواناکانی ئەودا نییە و تەواو لە بەهرەی ئەوان بە دوور و بەدەرە. ئەم بۆچوونە بە پێچەوانەیە و دوورە لە ڕاستی، چونکە هەر کەسێك هەوڵ بدا و بگەڕێ و لە سۆراغ و پشکنین و لێکدانەوە نەکەوێ، حەز و ئارەزووی ئەوەی هەبێ خۆی ڕابهێنێ و بکەوێتە مەشقی تاقیکردنەوە، ئەوە بێشك دەتوانێ ببێ بە حەکایەتخوانێکی بلیمەت و لێهاتوو، چونکە هەر کەسێك دەتوانێ لە ڕێی (هەوڵ و هەڵە)وە فێری زۆر شت ببێ.

بۆ ئەم مەبەستەش ستایش و هاندان دوو شتی بنچینەیین بۆ ئەوەی باوەڕت بە خۆت گەورە بێ. گێڕانەوەی چیرۆکیش هونەرێکە مایەی هەوڵ و کۆششی خۆتە پتر لەوەی کە چاوەڕێ بیت لە خەڵکەوە فێری ببیت.

بەهەرحاڵ.. ئەو کەسەی بیەوێ حەکایەتخوانێکی چاك بێ، دەبێ هەندێك سیفەتی ئەوتۆی هەبێ کە زۆر ئاسایی بتوانێ کەڵکی لێ وەربگرێ. خەیاڵێکی بەپێز و داهێنەرانە ڕەنگ و دەنگ و ژیانێکی گەرم بە چیرۆکەکە دەبەخشێ، لەگەڵ هەستێکی وا قووڵ کە لە دراما تێ بگا و تا ڕادەیەکیش بە بەرجەستەکردنی پاڵەوانانی ناو چیرۆکەکە لێزان و کارامە بێ، هەموو ئەمانەش گوڕ و هەڵچوونێکی وا بە منالان دەبەخشێ کە پڕ بەدڵ چێژی لێ وەربگرن، ئا بەم شێوەیە بەرگێکی ڕاستەقینەی ژیان دەکرێ بە بەری چیرۆکەکەدا. لەگەڵ هەموو ئەمانەشدا ئەو کەسەی چیرۆك دەگێڕێتەوە دەبێ ئەو توانایەشی هەبێ کە لە ناوجەرگەی کارەسات و نەهامەتی و ئاڵۆزیدا لایەنی کۆمیدی پڕ لە گاڵتەی ژیان فەرامۆش نەکا و ببینێ، ئەوەندەش سادە و بێ فیز و هەوا بێ کە بتوانێ بە ڕیاکاری و خۆدەرخستن و فیزی بەتاڵی مرۆڤ پێبکەنێ، ئامادەش بێ بەشداری گاڵتە و بەزمی منالان بکات، هەموو ئەمانە تێکڕا گەلێ یارمەتی حەکایەتخوانەکە دەدەن. بەڵام هەر بەم پێودانگە پێویستە حەکایەتخوان خاوەنی ڕۆحێکی خۆش بێ و بەخشندە و لێبوردە بێ، خۆ ئەگەر هەستی کرد ئەو چیرۆکەی هەڵیبژاردووە شایستەی گێڕانەوە نییە و هەڵبژاردنێکی نابەجێ و هەڵەیە، دەبێ دەستبەجێ دانی پێدا بنێ و پاشگەز ببێتەوە، یان ئەگەر بە تەواوی خۆی بۆ گێڕانەوەی چیرۆکەکە ئامادە نەکردبوو، یان ئەوەتا

سست و خاو بوو له گێڕانەوەکەدا، بە ڕادەیەك کە منالەکان پێی بێزاربن -ئەوانە هەر هەمووی هەڵەی زەقی حەکایەتخوانەکەن، بۆیە ئەگەر گوێگرەکان چێژیان لە چیرۆکەکە وەرنەگرت و بە هەموو هەست و نەستی خۆیانەوە تێکەڵی نەبوون، ئەوە نابێ گلەیی لە گوێگرەکان بکرێ، چونکە مەسەلەکە بە حەکایەتخوانەکەوە بەندە، زانیاری زۆر و دەستگەیشتن بە کتێبی هەمەچەشنە قەت کەڵکی تەواو نابێ، بەڵکو پێویستییەکی سروشتییە، بەم پێیە فەرهەنگێکی دەوڵەمەندی زاراوە و وشە و دەستەواژەی دەبێ کە دەتوانێ کاریگەرترین و گونجاوترین وشە بەکاربهێنێ و ئەوەش گێڕانەوەی چیرۆکەکەی بە تامتر و زیندووتر دەکا. لە سەرووی ئەوانەشەوە، دەبێ تۆ، گەر حەکایەتخوانی، باوەڕت بە گێڕانەوەی چیرۆك هەبێ بۆ منداڵان، ئەگینا خۆ ئامادەکردنەکە دەبێ بە کارێکی بێ دڵ و بێ ئامانج.

لە ڕێگەی گێڕانەوەی چیرۆك، منداڵان ئاشنای زۆر بیروباوەڕ و هەست و سۆز دەبن، بە شێوەیەك کە دەتوانن پتر تێی بگەن و ئەوەش دونیای منداڵان پڕ دەکا لە خۆشی و گاڵتە و سەرسامی، بە گوێگرتن لە حەکایەت منالان فێری زۆر شت دەبن، بەڵام ئەوەیان بە تەنها هۆیەکی سەرەکی و بنەڕەتی نییە بۆ گێڕانەوەی چیرۆك. هیچ شتێك بە قەد چیرۆك گۆمی خەیاڵی منال ناشڵەقێنێ. گوایە دەڵێن "جیهان گەلێ فراوان بووە و فەزای خەیاڵی مرۆڤیش بەرتەسکتر". دەشێ ئەم وتەیە ڕاست بێ. ئەگەر بمانەوێ منداڵێك وەك مرۆڤ پەروەردە بێ و پێبگات، پێویستە لە سەرەتای تەمەنییەوە ئەندێشەی وەئاگا بێنین. ئەگەر وا نەبێ.. ئەوە ئەو منداڵە لە جیهانێکی زۆر بچووك و داخراودا دەژی و هەر ئەو شتانەش دەوری دەدەن کە لە نزیکەوە دەیانبینێ و دەستیان لێ دەکوتێ. هەر ئەو خەیاڵەش کلیلێکە بۆ کردنەوەی "دەرگایەکی سیحراوی" بەسەر جیهانێکی پڕ و دەوڵەمەند و ڕەنگاوڕەنگ کە شیاوە هەموو شتێك لەوێدا بقەومێ و ڕووبدا. خەیاڵ وای لێ دەکا دیمەنی سرووشتێك ببینێ کە هەرگیز نەیبینیوە، بەشداربێ لە سەرکێشییەك کە لە ڕاستیدا نەیکردبێ، هەر خەیاڵە وای لێ دەکا بەشداری ژیانی خەڵکی دیکە بکا؛ ژیان بە هەموو ڕووەکانییەوە، بەم پێیە سۆز و بەزەیی و تێگەیشتنی بەرفراوانتر دەبێ. بەڵام خەیاڵیش پێویستی بە جۆرە خۆراك و هاندەرێك هەیە، جا بۆیە ئەو شیعر و چیرۆکانەی منداڵان گوێی لێ دەگرن کەڵکێکی ئەوتۆی هەیە کە لە باسکردن نایە، بە تایبەتی ئەو کاتەی کە هێشتا ساوان، کە دەڵێین ساوا.. چ ساوایەك؟ تەمەنی چەند بێ؟ ئەوەیان بە منال دەگۆڕێ، چ توانایەکی ڕۆحی و فیکری هەیە، بەڵام مەبەستمان بەر لە قۆناغی چوونە قوتابخانەیە. هەندێك لە دایکان و باوکان لەو بڕوایەدان کە دەبێ لە تەمەنی هەژدە مانگییەوە دەست بەم تاقیکردنەوەیە بکرێ، بە تایبەتی لە تەمەنی دوو ساڵی و بەسەرەوە. ئەوەشیان بە ڕاستی دەکەوێتە سەرشانی هەرزەکاران و ئەو ڕۆڵە گرنگەی کە لە ژیانی منداڵاندا هەیانە و دەبێ ئەنجامی بدەن، چونکە ئەرکێکی سەرەکی ئەوانە کتێبی وێنەدار و چیرۆك

و شــیعر بخەنــە بەردەســتی بــراو خوشــکە چکۆلەکانیان.

دیارە بە ملیۆنەها منداڵ، نەوە لە دوای نەوە، گوێیــان بــۆ حەکایــەتخوان شــل کــردووە، هەرکــە وتوویەتی "جارێك لە جاران.. یان هەبوو نەبوو" ئیدی چوونەتە ناو تانوپۆی چیرۆکەکە، ئەگەر حەزیان پــێ کردبــێ لەگەڵیدا ژیاون و پــڕ بــە دڵ تێکەڵ بە ڕووداوەکانی بوون، بە پێی مــوود و بابەتی چیرۆکەکە منداڵان کەوتوونەتە چاوەڕوانی و پێشبینی خەم و پەژارە، پاشان کە چیرۆکەکە وەك هەمیشە و بەو شێوە باوە کۆتایی هاتووە "بە خۆشی و شادی.. بۆ هەتاهەتایە بە یەکەوە ژیان".

ئەم جۆرە کارتێکردن و قۆستنەوەی منداڵان بۆ چیرۆکێك ئاشکرا و دیارە، بەڵام زۆر شتی دیکەش هەیە کە هەرگیز ناتوانین هەستی پێ بکەین. ڕەنگە حەکایەتخوان وا تــێ بگــا کــە چــیرۆك زوو لــە یــاد دەچێتەوە، بەڵام لە ڕاستیدا وا نییە و بۆ منــداڵ دەبێ بە یادێکی جوان و گەنجینەیەکی پــڕ کــە ساڵەهای ساڵ بمێنــێ. مــن زۆر زووتریــش لــەوە چــیرۆکم گێڕاوەتــەوە کــە توانیبێتــم گــوێ لــە هــەرزەکارێك بگــرم، جارێکیــان لــە یــەکێك لــەو دانیشتنانەی چیرۆك گێڕانەوەمدا، یەکێك ڕووی دەمی تێکردم و پرسی "ئەرێ تۆ ئەو چیرۆکەت لە یاد ماوە کە بە منــاڵی بــۆ ئێمــەت گێڕایــەوە؟ مــن هــەرگیز لــە یــادم نەچۆتــەوە، ئێســتاش مــن بــۆ منداڵەکانی خۆمی دەگێڕمەوە". وەك لە سەرەتاوە وتم من خۆم چیرۆکم گێڕاوەتەوە بەر لەوەی توانای ئەوەم هەبووبێ کە بەرامبەر هەرزەکارێك دابنیشم و گوێی بۆ شل بکەم.

کە منداڵان گوێ بۆ چیرۆك شل دەکەن، ئاشنای ســیحر و جوانــی و مۆســیقای وشــە دەبــن، ئەگــەر حەکایەتخوانەکــــە هۆشمەندانــــە چیرۆکەکــــە هــەڵبژێرێ، ئــەوە بێشــك چیرۆکــەکانی بایــەخ و سەنگێك لای منداڵان دروست دەکەن، وایان لێ دەکا بتوانن چیرۆکی مــەزن و حەکایەتــە تەقلیدییــەکان هەڵبسەنگێنن کە هەموویان دەبنە میراتی هــەموو منداڵێك. گێڕانەوەی چیرۆك وا دەکا وشە بایەخ و کەڵکی خۆی ون نەکا، لە کاتێکدا کە حەکایەتخوان گرنگی بە وێنە و دیمەنی بینراوی ناو چیرۆکەکان دەدا و دەیــەوێ وەك کۆمــەڵێك تــابلۆ بێنــە بــەرچاو، هەر بەو پێیە دەربڕینی وشەکان لای منداڵان تازە دەبێتـــەوە. دیـــارە پاڵەوانـــەکانی نـــاو فیلمـــە کارتۆنییـــەکان جێـــی کەســـە ئـــاڵۆز و پـــڕ لـــە نهێنییـــەکانی نـــاو حەکایەتـــە ئەفســـانەییەکان و داستانەکان دەگرنەوە، ئەو چیرۆکانەی کە پڕن لە دێـــو و درنـــج و جنۆکـــە و خێـــو کـــە جیـــهانی ئەفسانەیی منداڵان داگیر دەکەن. لەم سەردەمەدا منداڵان بەبێ دیمەن و وێنەی بەرجەستە حەزناکەن گوێ لە چیرۆك بگرن، ئێستاکە زۆر ئاساییە گوێ لــە چــیرۆکێك بگریــت کــە خرابێتــە نــاو قــاڵبێکی دراماتیکییانە یاخود کەسێك بۆتــی بخوێنێتــەوە. بــەڵام بــە دەگمــەن هــەڵی وا دەســت دەکــەوێ کــە ڕووبــەڕوو چــیرۆکێکت بــۆ بگێڕنــەوە. مــن لــەو باوەڕەدام کە تەلەفزیۆن جگە لە جێگرێك هیچی دیکــە نییــە، جێگــری چــیرۆکێکی زینــدووە کــە هەرزەکارێك لە نزیکەوە بۆ منداڵێکی بگێڕێتەوە.

لە کاتێکدا کە حەکایەتخوان و منداڵێك بە یەك دەگەن ژیان بۆ هەردووکیان بە پێز و دەوڵەمەندتر

دەبێ، هەردوو بە جووتە لە چیرۆکێکدا تێکەڵ دەبن و بەشداری یەك مەبەست دەکەن، کە بە یەکەوە پێدەکەنن و دڵخۆش دەبن، یان ئەوەتا خەم زۆریان بۆ دەهێنێ، یان کە بەیەکەوە زاری سەرسوڕمان دادەپچڕن و جۆرە سۆزێکی هاوبەش هەموو لایەك دەگرێتە ئامێز، ئەوانە هەموو هەست و نەستێکی گەرموگوڕی خۆشەویستی و دۆستایەتییان لەلا دەجووڵێنێ. ئەمەشیان ئەزموونێکە ئەوە دەهێنێ کات و هێز و توانای تیا خەرج بکرێ و پێویستی بە هەوڵ و ماندوێتی و خۆخەریککردنە.

### سەرچاوە

*Eileen Colwell*

*Story telling*

*The Bodley Head*

*London- Sydney*

*TORONTO*

چاپی یەکەم/ *1980* لاپەڕە (*1* تا *5*)

**لە ژمارەکانی داهاتووی گۆڤاری سەردەمدا فایلێك بۆ نووسەری ناوداری ئەرجەنتینی خورخی لویس پورخیس دەکەینەوە، داوا لە وەرگێڕە بەڕێزەکان دەکەین بۆ دەوڵەمەندکردنی فایلەکە هاوکاریمان بکەن.**

# ژنەی پشت دەرگا مەفرەقینەکە

• ئەحمەد شاملوو
▪ لە فارسییەوە: حسێن شێربەگی


شاملوو

بێگومان چما بڵێم نازانم هۆی ئەم ڕووداوەیە چییە، ئێوە وا بیردەکەنەوە شکستە نەفسیم کردووە. جا هەر بەم هۆیەوە تێدەکۆشم تەواوی ڕووداوەکە -هەروەکو چۆن ئەو ڕووداوەم بەسەرهات– وەیادی خۆمی بێنمەوە و بینووسم. ئێوە کە خوێندتانەوە بڕیارێکی لەسەر ئەدەن.. شی دەکەنەوە و بۆ خۆتان شتێکی لێ ساخ دەکەنەوە. هەر بەمجۆرەیە کە هیوادارم خۆشم بتوانم ڕاستییەک لەم بابەتە ئالۆزە دەرکێشم.. لەسەر ئەم قەرارە هیوادارم خۆشم بتوانم لە کاری خۆم -لەو ڕووداوەی کە بەسەرم هات– سەرەو دەرەیەک بکەم.. وای دانێن جیوەی ئاوێنەیەکیان لە بڕێ شوێنەوە داتاشیبێ. ئەمەم جارێکی دیکەش وتووە. دائیمە ئەمە دەڵێم. لەبەرئەوەی بە داخەوە لەم دونیایەدا کە منی تیا ئەژیم هیچ شتێک بە ئەندازەی ئاوێنەیەک کە لە بڕێ شوێندا جیوەکەیان داتاشیبێ، زێدەتر لە من ناچێ.. ئەمە هەمیشە دەڵێم، چونکە تاقە وێنایەک کە دەتوانم لە ڕۆحی نەخۆشی خۆمم هەبێ، هەر ئەمەیە کە وتم.. وای دانێن جیوەی ئاوێنەیەکیان لە بڕێ شوێنیەوە داتاشیبێ و بە سۆنگەی ئەمەوە نەتوانێت

ئـەو شـتـەی تێیـدا دەردەکـەوێ، سـاخ و کـامڵ بینوێنێتەوە.

دەڵێـن چـی؟ ئـەو شـتـەی هێشـتـا منـی وەکـو ئاوێنەیـەك ڕاگرتـوە، خۆڕاگرتنـی ڕۆحـی مـن و خۆڕاگرتنی جیوەی منە، نەك کولبوونی ئەم چەقۆ بێبەزەییەی کە هەڵکەوت یان چارەنووس یان هەر قسەیەکی قۆڕی دیکەی ناوبێ. دەیجا.. لە خەودا یان لە بێداریدا (ڕاست نازانم لە خەودا بووم یان بەخەبەر بووم. کەسێ ئەم ڕووداوەی لە بۆ نەقڵ کردووم یان خودی خۆم پاڵەوانی دڵ بە گومانی و درەنگ بڕواکردەی ئەم ڕووداوەم) لە هەر دۆخێکدا، ئەمە ڕووداوەیە کەوا بۆ ئێوەی دەگێڕمەوە. نازانم لە خەودا دیومە، یان لە جیهانی هۆشیاری ئێوەدا قارەمانی خەواڵووی ئەمە بووم، یان کەسێ ئەوەی لە کەش و هەوایەکی نێوان هۆشیاری و مەستیدا بۆی گێڕاومەتەوە نازانم، نازانم.. خۆ وتم: ڕۆحی منیـان داتاشـیوە، جیوەکـانی ئـەم ئاوێنـەیان داتاشیوە. کاتێ بینیـان نـاتوانن پەڵـەی تێـهاون، جیوەکانیان داتاشی.

دەسا چما لـەو شـتانەی کـە ئێـوە نـاوی ڕاستەقینەی لێدەنێن، لەنێو وردکە و پردکەی لـە حاڵی لەنێوچوونی ئاوێنەی مندا، نەك وێنەیەکی ڕاستەقینە، وێنەیەکی تەمومژاوی و بێ پێوەندی، وێنەیـەکی شـکاوی پرژوبـڵاو لەبـەرچاوتاندا دەردەکەوێ، جێگەی سەرسوڕمان و بە ئەفسـوون چـوون نییـە. جێگـەی هیـچ سەرسـوڕمان و ئەفسوونبوونێ نییە.

ئەوە هەوەڵ شەو نەبوو کـە مـن لـەم پەسـێوە بەردینەیەدا دەژیـام -لـە شـوێنێکی ونبـووی ئـەم دارستانە چڕوپڕەدا کە بنـەدار و دەوەن و دڕوو و تووتڕکەکـەی ڕێگـەی پشووکێشـان و هەناسـەی بەشەر تەنگ و باریك دەکەنـەوە- شەوی هەوەڵم نـەبوو. ئاخـە لـەوێدا ژیـن و ژیـان ئـەوەندە بـە ئاسـوودەیی و بـەبێ دژواری تێدەپـەڕی کـە حەسـێبی مانگـەکان، حـەوتووەکان، حەسـێبی ڕۆژەکـان و تەنانـەت حەسـێبی سـەعاتەکانیش لەدەست دەرچوو بوو. نیمچە مۆمێکـی گەچینـەم بوو کە نەمدەویست گڕی دەم. شەوانە لە تاریکیدا دەمام و فیکـرم دەکـردەوە. لـە تاریکـان یارمـەتیم دەخواست و بەناو خۆما شۆڕ دەبوومـەوە.. بۆچی وا نەکەم؟ ڕۆژ و ڕووناکایی دەرفەتی تێفکرینی پێ نەئەدام. نیگـام بـەرەو ئـەو شـتانە دەکێشـران کـە تیشکی ڕۆژ پێ نیشان ئەدام و بەرەبەرە لە خـۆم خـافڵ دەمـام، لـە خـۆم دوور دەکەوتمـەوە و بـەرەو نـەهێنی و نادیـار، بـەرەو دەرەوە، بـەرەو ئەو شتەی ئیدی "مـن" نـەبوو ڕاکێـش دەبـووم و هـەر تێفکریـن دەیتوانـی ئـەو شـتە بـە هـەبوونی نـاخی منـەوە بلکێنـێ. لـە خـۆم خـافڵ دەبـووم.. لـــــە خـــــــۆم دوور دەکەوتمـــــــەوە، دوور دەکەوتمـەوە و دوور دەکەوتمـەوە، ئـاخ.. ڕۆژ کۆتایی دەهات!

هەر شەو بوو کە چاوەکانم لە گەڕان و سووڕان و لە کۆڵینەوەی تاریکی ڕادەوێستان و بەرەو خۆم دەگەڕانەوە. بـەرەو خـۆم دەگەڕانـەوە و منیـان بـە ناخی خۆمدا دەکێشا خوارەوە.

بەم هۆیـەوە زۆر لـەمێژ بوو مۆمە گەچینەکـەی مـن -ئەوەندی لە مۆمە گەچینـە بچکۆلانەکەی مـن مـابۆوە- چەشـنی شـتێکی بێکـەڵك لـە قـەراخ و

جێوبانەکەم و لەناو مۆمدانە بورۆنزییەکەدا مابۆوە.

بێج لەم مۆمە گەچینەیە، لەنێو پەسێوەکەمدا تەورداسێکیشم بوو. سامانی من لە ژیاندا ئەم تەورە بووە. ئەم تەورە -سامناکە- دڵۆپە خوێنێك لەسەر دەمەکەی ئیشك هەڵاتبوو و بە هیچ کلۆجێ نەدەسڕدراوە.

چەندان کەرەت هەوڵم دا بوو بە ئاسێدو سمبادە، بە کاغەز پەرداخ، تەنانەت بەو دەوایانەی لە ئەوسانەکان و لە هەرە کتێبە کۆنەکانی جادووبازیدا دەمدۆزینەوە، ئەو خوێنە لە دەمی تەورەکە بسڕمەوە، بەڵام نەمتوانیبوو.. ژنی خان - کەوا بیردەکەمەوە قەرەواشی نەنکم بوو- ڕۆژێك کە من هەموو کاتی خۆم لەسەر سڕینەوەی ئەم دڵۆپە خوێنە گەپجارە بە فیڕۆ دابوو -لە پشت پەردەی ژوورەکەوە هاتە ژووری و بە تەوس و تووانجەوە وتی:

"لە خۆڕا خۆت دەکوژی ها! تۆ سامانەکەت هەر ئەمەیە. هەر ئەم تەورە بەو دڵۆپە خوێنەی سەردەمەکەیەوە گیانە دەبا پێت بڵێم، کاری دونیا ئەوەندەش لە خۆڕا نییە: کاتێ باوکی خوالێخۆشبووی تۆ کەوتە گومانەوە کە ناکا تۆی بێ غیرەت لە تۆوی ئەو هەتیوە ژنانیلەیەی جیرانمان بی وا شەوانە ئارەقی سەگی* بە قوزەڵقورتی دەکا و لەنێو کۆڵاندا گۆرانی بێتامی ئەوین و ئەویندار دەڵێ، ئێمە و تەواوی خەڵکی گەڕەك بەسەریدا هاتین و پێمان وت: بابە، میرزا ڕەسووڵ، ئەم ڕووداوەیە ئاوها کە تۆ دەڵێی نییە، بەڵام، چما بە قسەی کردین؟.. هەروەها قەستەسەر

بە شوێنتەوە بوو تاکو کەرەتێك کە سەروچاوی هەمووانی بە دوور دیت، خەریك بوو دەست بنێتە بۆقەتەی ملت و لەبەر ڕق و بوغزی خۆی ئەم کەللە تاشراوە قاژووانەیەت هەڵکەنێ، کەچی دایکت وەکو واشە گەیشتێ و بەم تەورە، بە بێدەنگی ساردی کردەوە.. لە پاشاندا بە جووتە بردمانە نێو دالانی ماڵێ، بە قەدشکێن و خاکەناز، بە ترس و لەرزەوە شتێکی وەکی گۆڕمان هەڵکەند و تەرمەکەیمان هەروا بە دانیشتنەوە و بەبێ غوسڵ هاویشتە ئەو نێوەوە.. -دەك ڕەببی گۆڕەکەت پڕ لە ئاگر بێ کەوا هەموو ئاگرێ لەبن سەری تۆدایە!- لەگەڵووزبانت گرت، هەوەڵ شتێ کە فێری بووی ئەم شیعرە بوو، کە دەچوویە دالانی ماڵێ و، دەمت دەگرت و دەتوت: خوا بمکوژێ بمرم هەڵووچە، لە کوێ بمنێژن، لەژێر داڵوونچە.. لەپاش ئەو ڕۆژە، پێم خۆشبوو کوێر بم و ژنی خان نەبینم.. بەڵام سامانی من بووە ئەم تەورە، دڵم دایە.. هەر ئەم تەورە هەر بەم دڵۆپە خوێنەی سەردەمەکەیەوە.

وتم "سامانی من" -بەڵام نا، دەبایە بموتایە "مێژووی من"، "چارەنووسی من" چونکە لەوە بەدووا، بێئەوەی بگەڕێمەوە سەر ڕەفەی ماڵێ یان سەر دیوار یان هەر شوێنێکی دیکە تەماشا بکەم، کە بۆی دەچوو تەورەکەم لەوێ دانابێ، دەمزانی تەورەکە، چەشنی چارەنووسێکی تیژو ڕەها، لە گوێرەی ئەمرێك، وەکی حوکمێکی نەمر لەوێیە.. هەر بەو تیژییەوە لەوێیە و بوونی هەیە، کە دەمزانی خودی من بوونم هەیە و دڵم لەبەر ئاسانەی ئەم کۆشکە پێچەڵاپووچ و پڕ داڵان و پڕ تەلارەدا کە هیچ ڕوون نییە خاوەنە ڕاستینەکەی

کێیە، وەکو دڵی سەگێکی چکۆڵانە کوتەکوتی بوو..

دەمزانی تەورەکەی من لەوێیە، بە دڵۆپە خوێنێکی قاوەییەوە کە لە سەردەمەکەی ژەنگی هێناوە– هەر ئەوەندەش بۆ من بەس بوو. من "هەبووم"، تەورەکەی منیش "هەبوو". "دەبایە"ش هەبوایە.

هەروەکی ڕۆژێ لە ڕۆژان، کاتێ کابرایەك لاقی چەقاندبوو کە دەبایە بێجگە لەو کەسێکی دیکە باوکی من نەبایە، ویستبووی بە کوشتنی من تێشکانی خۆی قەرەبوو کاتەوە، هەر ئەم تەورە بوو کە هەڵکشابوو، داهاتبۆوە و بە بێدەنگ نیشانی دابوو کە من "دەبێ هەبم". ئەوە بوو کاتێ مەنزڵم گوێزتەوەو هاتمە ئەم پەسێوە بەردینەیەی نێوەڕاستی ئەم دارستانە، تەورەکەشم وەکو شتێکی پێویستی، وەکو نەفرینێکی باب و باپیران، وەکو چارەنووسی گاڵتەجاڕی خۆم لەگەڵ خۆم هێنا و هەوەڵ کارێکی کە کردم بزمارێکم بە دیوارەکەدا داکوتا و تەورەکەم لە ماندی گۆشەی نێوان دەمەکەی و دەسکەکەیدا بە دیوارەوە هەڵواسی.

* * *

سەبارەت بەو بنەمۆمە گچکەیە شتێکم وت، بەڵام لەوەدا کە ئەوەم لە کوێوە هێنابوو، لە یادم نییە.. سەبارەت بە تەورەکەش وتم. هەروەها سەبارەت بەو دڵۆپە قاوەییەی سەردەمەکەی کە نە بە ئاسێد و کاغەز پەرداخ و نە بە هیچ شتێکی دیکە نەمتوانیبوو بیسڕمەوە.. بەڵام سەبارەت بە جێوبانەکەم هیچم نەوت. جێوبانەکەم سەکۆیەکی نێوەڕاست قووڵ بوو لە شانی ڕاستی پەسێوەکەدا، کە لەوسەری خودی پەسێوەکەدا سازیان کردبوو. مەبەستم لەوەیە، هەر لەنێو بەردێکدا کە پەسێوەکەیان تێدا هەڵکەندبوو، سازیان کردبوو. مەبەستم لەوەیە، هەر لەنێو بەردێکدا کە پەسێوەکەیان تێدا هەڵکەندبوو، سازیان کردبوو. دەتوت لەوەپێش –لە پێش هەڵکەندنی بەردی پەسێوەکەدا– ئەویشیان هەر لەوێدا لەبەرچاو گرتبوو.

سەکۆیەکی نێوەڕاست قووڵ بوو کە قووڵاییەکەیان بە کاوکۆڵۆش پڕکردبۆوە. بڕێك سەرەوخوار بوو، من لە هەوەڵ سەرنجدانی لایانناسانەی پەسێوەکەدا، بۆم دەرکەوت کاتێ ئینسان لەم جێوبانەدا ڕاکشێ، دەڵێی بەرەو قیبلە ڕایانکێشاوە.. بەڵام ئەمەم پێ سەیروسەمەرە نەبوو: هەر ئەو پیرەژنەی کە وتم وای بۆ دەچم قەرەواشی نەنکم بووبێ، ڕۆژێك بۆی گێڕامەوە کە ئەوکاتەی لەدایك بووم، لاقەکانم بەرەو قیبلە بوون..

تەنانەت لەمەش سەیروسەمەرەتر! –بۆی گێڕابوومەوە:

"نەنە گیان، ئەو شەوەی دەستی باوکی خوالێخۆشبووت و خانمە چکولیان نایە دەستی یەکدییەوە، دایکی ئاغات لە ژووری حەوزخانەدا دوو چەپۆکی بەسەری خۆیدا دا وتی: دونیا قوڕی بەسەربێ، ژووری سەر عەماراوەکەتان –کە ڕوو بە قیبلەیە– کردۆتە ژووری بووك و زاوا؟– وتم: ئەم قسانە چییە خانم، خراپە لە لای خوداوە نییە، بەرەو قیبلە باشترە. شانس و بەختی باشترە. –

وتی: نا، نەنە باش نییە! چما لە یادت نییە قەرەچە فاڵگرەکە چی دەوت؟".

من لە ژنی "خان"م پرسیی: چما قەرەجە فاڵگرەکە چی وتبوو؟ ژنی خان لە هەوەڵڕا نەیدەویست بیڵێ، بەڵام من باوەکو پێم خۆش بوو کوێر بایەم و نەمدیتبایە- ئەوەندەم لاق چەقاند هەتا ئاخری لە ڕوودا داماو وتی: "نەنە گیان، خوا بە بەشی هیچ کافرێکی نەکا! قەرەجەکە بە دایکی ئاغاتی وتبوو جێوبانی زاوایەتی کوڕەکەت بەرەو قیبلە ڕاخەن، بێ سێ و دوو نەوەکەت لەگەڵ ژنێکی مردوودا زەماوەند دەکا!"

من پق لە قاقام دا. بەڵام ژنی خان، پەردەی نێوان قامکی شەست و قامکی دووهەمی دوو کەرەت لەملاوئەولاوە گاز لێگرت. لە پاشان تفی کردە سەر عەرزی و خوڵقی تاڵ کرد و لە ژوورەکە چووە دەرێ.

* * *

هەرچی بوو هەر ئەمە بوو. ئەمە ڕاستە من هیچ کاتێ باوەڕم بە چارەنووس و قسەی فاڵگر نەبووە. بەڵام بەوەیدا کە بینیم سەکۆ بەردینەی جێوبانەکەم ڕاست بەرەو قیبلەیە، باوەکو ئەم بابەتە بۆم سەرسوڕهێنەر نەبوو، دیسانیش سەرم سوڕما. لەوە دەچوو کە بە ڕاستی کاتی لەدایکبوون لاقەکانم بەرەو قیبلە بووبن، یان جێوبانی دایکمیان لە شەوی شایی و زەماوەندەکەیدا لە ژووری سەر عەماراوەکەدا بەرەو قیبلە ڕاخستووە، یان بۆ خۆم تەواوی عومری خۆم لە ژوورە بەرەو قیبلەکاندا و لەنێو جێوبانە بەرەو قیبلەکاندا خەوتووم.

چاو کەن، ناکرێ ئەمانە نێوبنێین "تەڵقین" یان شتگەلێکی گەپجاڕ و گاڵتەئامێزی ئاوها.. من کاتێ بیرم لەوانە کردۆتەوە کە ساڵانی ساڵ بەسەر ڕوودانی ئەمانەدا تێپەڕ بووە بێئەوەی تەنانەت دەقیقەیەکیش سەبارەت بە یەکێکیان فیکرم کردبێتەوە.. کەچی ئێستا هەر بەرەو قیبلەبوونی ئەم سەکۆ بەردینەیە دەبینم، لە ناکاودا هەموو ئەم بابەتانەم وەیاد هاتۆتەوە: کە خۆشم بەرەو قیبلە لەدایك بووم، یان شەوی بووکێنی جێوبانی خانمە چکولیان بەرەو قیبلە داخستووە، لە ژووری سەر عەماراوەکەدا و بەرەو قیبلە، وێڕای هەمووی ئەمانە دەڵێی ئەوا بۆ خۆم تەمەنی خۆم لە ژوورە بەرەو قیبلەکاندا، لەنێو جێوبانە بەرەو قیبلەکاندا، لە خەودا بووم!

* * *

شتێکی دیکە: لە پەسێوە بەردینەکەدا، کاتژمێرێکی بڵندی پێچکەداری قەدیمی لێبوو کە تەلە کورت و بڵندەکانی لەسەر سەعات دوو و سێزدە دەققە خەوتبوون..

نازانم بۆچی ئێستا وەیادم هاتەوە باسی سەعاتەکە بنووسم، لە حاڵێکدا باسی چارەنووسی ڕەشی خۆمم دەکرد، من گومانم نییە چارەنووسی ڕەشی من، حیکایەتی دڵتەزێنی ژیانی من شەیتان نووسیویەتی. لە ڕاستیدا دەڵێی ژینی نێو ئەم پەسێوەشم هەر بە وتەی شەیتان قەبووڵ کردووە.. من سێبەری هەڵخەڵەتێنەی ئەو، نەشئەی ڕاکێشەری بەهێزی هەبوونی ئەوم لە تەواوی شەوانی ژیانی خۆمدا هەست کردووە. لەگەڵ ئەودا تەنیام و لەگەڵ ئەودا لە دەست تەنیایی

ڕزگـار دەبم -تـاڵبوونی چارەنووسـەکەم، هـەموو شتێکی لـە دەوراندەورمدا ژەهـراوی کـردووە. مـن زەمانی خـۆم دەرماندا و دەکەم. لاواندنـەوەی مـن دیتران مەسخ دەکات. هەموو شتێ نەخۆشم دەکا و چ شـتێ هێدیـم ناکاتـەوە. بـۆ هـەڵاتن لەدەسـت تەنیایی سەر بە هەموو کون و قوژبنێکدا دەکەم.. تەنیا.. تاك.. تەنیا.. تاك. گەمژەکان، گوێ بگـرن، ئەمە دەنگی دڵی منە، دەنگی چارەنووسـی منـە. حەبی هێدیکەرەوە و ڕەموودەم دەکاو ڕەنجـێ لـە ڕەنجەکانی خۆم زیاد دەکەم.. ئەم بابەتەم شـەوێك بە شەیتان وت.

شەیتان پێکەنی و وتی: "ڕەنجێك هەیە دەبێ ئاوەڵای کەی. لە ڕاستیدا تۆ کارت هەر ئەوەیە. لەم جیهانـەدا، ئـەرکی سـەرەکی لـەدایکبوونی تـۆ ئەمەیـە. لـە خـۆڕا هـەوڵ مـەدە لـەژێر ئـەم کـارە ڕاکەی".

دەنگی ڕێك و ڕاست و زەق بوو، دەنگدانـەوەی نەبوو، دەنگی چارەنووس بوو.

★ ★ ★

ڕاست سەعات دوو و سێزدە دەقیقە بـوو. لـە دەنگی دینگ و دانگـی کـاژێرە بڵنـدە پێچکـەدارە قەدیمییەکە وا لە سووچی پەسێوەکەدا بوو و تەلە ژەنگاوییـەکانی لەسـەر دوو و سـێزدە دەقیقـە خـەوتبوون، لـە خـەو ڕاپـەڕیم. دەنگـی کاژێرەکـە، وشك و بەزەبر بوو. ڕاست وەکو دەنکە پساوەکانی تەسبیح، لە سەرەوخواری بێدەنگیدا تلی دەخوارد و لە پەردەی گوێچکەکانی من دەکەوت: دینگ گ گ.. دانـگ گ گ.. دینـگ گ گ.. دانـگ گ گ.. هەستام و لەسەر سەکۆکە، لەسەر ئەو جێوبانـەی

بە کا پڕکرابۆوە دانیشـتم. تەماشـام کـرد ڕەنگـی ڕووناکی مانگە شـەوێکی بـێ نسـێ پەسـێوەکەی ڕووناك داگێڕاوە. لە کاژێرەکە وردبوومـەوە، بینیم ڕاست سەعات دوو و سێزدە دەققە بووە هەستم بە نەشئەیەکی پڕ تام و چێژ لە دەمارەکانمدا کرد.

بێجگە لە خوێن شتێکی دیکە لە دەمارەکانمدا بـوو. خـەیاڵم دەکـردەوە شـتێکی وەکـو ژەهـر لیپاولیپی کـردووم. کـەیف و خۆشـی دەرمـاندا و بـوونم لـە دونیـای تاسـە و خولیاکـانی خۆمـدا دەچێشـت.. ئـەم چێـژەم لـە دینـگ دانگـی سەعاتەکەشدا کـە دەگەیشـتە گوێـم، هەسـت پـێ دەکرد، لە ڕووناکییـەکی سڕدراوەدا کـە سـێبەری نەدەخستە سـەر هیشـتێك، هەسـتم پێدەکـرد، لـە تینووییەتی بن گەرووما لە تەنیا سێبەرێکی وا لە ژوورەکەمدا دەجووڵاوە و مـن بـە ئاسایی دەمزانی نسـێی شـەیتانە، تەنانـەت ئـەم چێـژ و کەیفـەم لەوەشـدا کـە بـاکم لـە هـەبوونی شـەیتان لـە ژوورەکەمدا نەبوو، هەست دەکرد.

★ ★ ★

سـنووری سـێبەری شـەیتان لـە ڕووناکـی ژوورەکـەدا دەسـڕدراوە و دیسـانەکەش پـەیدا دەبۆوە. کاژێرەکە، بە تـەواوەتی دەنگـی خۆیـەوە دینگ دانگی دانابوو.

منیـش نەشـئەی پـڕ خـورووی ئـەو کەیفـەم دەچەشت کە بە ژێر پێستی لەشمدا ڕای دەکرد. شـەیتانیش بـە منـی وت: "دەرگایـەك هەیـە دەبـێ بکرێتەوە".

زۆر بڵند پێکەنیم، بە لـەونێك کـە شـەیتانیش لەگـەڵ منـدا کەوتـە پێکـەنین و لەمـەودووا لەبـەر

پێکەنین چاوەکانم پڕبوون لە فرمێسك. شەیتان دیسانەکەش وتی:

"هیچ پەلەیەکمان نییە، بەلام ئاخری دەبێ ئەو دەرکە ئاوەلا کەی.. لە ڕاستیدا لەسەر ئەم جیهانە دەبێ کاری تۆ هەر ئەوە بێ. لە خۆڕا هەولْ مەدە خۆتی لێ حەشار دەی".

چاوم سڕی، ئەو چاوانەی لەبەر پێکەنین فرمێسکیان تێزابوو، سڕیمن و وتم: "دەزانم، دلم پێوە نییە لەبەرئەوەی زووتر ڕزگاریم بێت، پەلەپەل بکەم، یان بە جارێ لە ژێری دەرچم و کەپۆت بسووتێنم. بەلام.. دەترسم! ڕاستییەکەی ئەوەیە مەترسییەکی لەخۆڕایی دایگرتووم. پێم وابێ لە خودی خۆت دەترسێم.. نەك دائیمە، بەلام جاروبار ئەم حالەم بەسەردا دێ. بەلکەم ئەوە بۆ خۆتی کە دەمترسێنی.. دلم پێوەیە ئەم دەرگایە زووتر ئاوەلا بێ. پێم خۆشە تۆش زووتر لەم جیهانە بڕۆیە دەرێ، ئەم جیهانەی وزەی تەواو کردووی، هەتا منیش بتوانم وەشوێن کاری خۆم کەوم.. شایکە بزانم: تاقی کەوە بزانە دەتوانی بە زەبرێك کەللەسەرم لە ئەستۆم جیاکەیەوە؟ دەی دەسخۆش.. تاقی کەوە بزانە دەتوانی؟.."

ئێستا ئیدی نازانم چەندەم قسان کرد، تاکو کەی قسەم کرد.. بەلام هەر ئەوەندەم لە یادە لە ناکاودا ڕاوێستانی لەنگەری کاژێرە پایەدار قەدیمییەکە، وەخۆمی هێنامەوە.. هێشتا پاشماوەی دینگ و دانگەکەیم لە دوورەوە دەگەیشتە گوێ، لە دەرەوەی پەسێوە بەردینەکەڕا، دەتوت کەسێك ئەو کاژێرە لەگەلْ خۆیدا دەبا. ئەوکاتەش تەماشای دەرگاکەم کرد، وام هەست کرد شتێکی وەکو سێبەر، وەکو دووکەلْ، خەریکە دوایین بەشی لەشی خۆی بە دووای خۆیدا دەکێشێتە دەرەوە. -هەر وەك تەرمە بە مۆم پۆشراوەکان کە بە خوێندنی ویردێك زیندوو دەبنەوە و بەڕێ دەکەون و شیلە نەواربەستەکان، بە شوێنیدا ڕاکێش دەبن. تەماشایەکی کاژێرەکەم کرد و لەو تاریکانەدا بە ئاستەم توانیم تەلەکانی بدینم کە لەسەر دوو و سێزدە دەققەدا نووستبوون.

پەلە هەورێك بە سەر کولاوکەی بان پەسێوەکەدا تێپەڕ بوو و سێ هەسارە کە وەکو سێ کوچکێنێ لە ئاسماندا بوون، شولەیەکی کز و لاوازیان دەرکەوت.

کەلەشێرە کێوییەك لەوپەڕی دارستانەوە زیڕەیەکی لێ هەستا. هەوای پەسێوەکە قورس و غەمناك بوو. بە هێزێکەوە کە حەتمەن لە کانییەکانی سام و مەترسی ڕۆحمەوە هەلدەقولی، بەرەو دەرگاکە ڕام کرد، بەلام دەرگاکە داخرابوو. وەیادم هاتەوە لە پێش نووستندا دەرگام بە وردی داخستبوو. کیلۆنەکەیم بە متمانەوە کێشابوو.

گەڕامەوە و پالم دا بە دەرگاکەوە. تەواوی هێزی لەشم لە ئەژنۆکانمەوە دەکێشرا. ئیدی لەناو پەسێوەکەدا چ شتێکم نەئەدی. ڕەشاییەکی خەستی ڕەوان تەواوەتی ژوورەکەی پڕکردبوو. لەبەرچاومدا، پەلە پەلەیەکی زەردی خۆشڕەنگ کە دەوراندەورەکەی کەسکی ڕووناك بوو، لە بۆشاییەکی تاریکدا دەڕۆشتە خوارێ. لاقەکانم لەژێر لەشمدا لەرینەوە و لە پڕدا وەکو دارێکی کارەبا بیگرێ، بەسەر ئەژنۆکانمدا شکامەوە. بۆ

چرکەیەك تێکۆشام لەنگەری خۆم ڕاگرم.. ئاکامێکی نەبوو!– بە تەواوی لەشمەوە بەرەو پێشەوە داشکامەوە و بۆ دۆزینەوەی شوێنێ خۆمی پێ بگرمەوە، دەستەکانم هیوابڕاو بردە پێشەوە..

* * *

لەوسەری پەسێوکەدا دەربیجەی دالانێکی تێدابوو کە بە پەیژە دارینەیەکی ڕزیودا دەڕۆیشتە ژێرخانەکەوە دەبایە ئەمەم زووتر لە ئێستا وتبایە، چونکە هەر ئەمانەن کە وردودرشتی ژیانی من پێکدێنن.

ئەم ژێرخانە تایبەتی کەلوپەلی وردکە و پردکە بوو: بنەدار و دەهەونی جادووبازی و شتی دیکە.. کێردێکی گەورەی ژەنگاوی، کەللەسەری بەشەرێك، قرژاڵێکی وشکهەڵاتوو و زۆر شتی دیکە.

بەرەبەرە هەموو ئەمانەم ژێروژوور کردبوو، کتێبێکی پەڕەپەڕە لەوێ بوو کە نەدەخوێنراوە، بەڵکەم بە خەتی هیندستانی بوو، یان خەتی جوولەکانە یان ئی چینی.

قوتوویەکی درێژی لێبوو لە دارە تەرم دەچوو، کاتێ کاوکۆتی نێوەکەیم حەوادا دەرێ، دیتم لەو ژێرەدا پەیکەرەی بەردە مەرمەڕی ژنێکی ڕووت، هێدی و هێمن، بە ئارخەیانی، چەشنی هەموو شتێکی ئاسایی لەوێ خەوتووە. لە پێشدا هاتم بیشکێنم، بەڵکو لەبەرئەوەی لە هێمنایەتییەکەی ڕقم هەستابوو، بەڵام لە دواییدا فیکرم کردەوە کارێکی قۆڕە، چما چارەنووسی من وابوو کە دەبێ لەگەڵ ژنێکی مردوودا زەماوەند بکەم، خۆ ئەمە پەیکەرێك زیاتر نییە.. دیسانەکە کاوکۆتە کۆنەکانم بەسەردا ڕشتبۆوە.

بەڵام ئەو شەوە، لە پاش ڕۆیشتنی شەیتان کە بەرەو دەرگاکە ڕامکرد و لە ئاسانەی دەرگاکەدا لەسەرخۆ چووم و لە دوایین کاتدا دەستەکانم بەرەو پێشەوە درێژ کرد کە خۆم بە شتێکەوە بگرمەوە، ئەژنۆکانی پەیکەرە مەرمەڕینەی ژنە ڕووتەکەم کەوتە ئامێزەوە -یانی لە ناکاودا ئاگام کرد ئەو شتەی لە باوەشم کردووە ئەژنۆکانی هەمان پەیکەرە مەرمەڕینەی ژنە ڕووتەکەیە. شتێکی ساردی چەشنی ئاو بەسەر مۆرەغەی پشتمدا بەڕێ کەوت و، ئارەقەی زاندە نێوچەوانمەوە. گوێچکەکەم کە لە نێزیك ڕانی بوو، خوشەخوشی خوێنێکی هەست پێکرد وا لەنێو دەمارە بۆرە مەرمەڕینەکانیدا هاموشۆی دەرکرد و کوتەکوتی پڕ لە ڕقی دڵیم لەژێر پێستە قورسەکەیدا دەبیست.. وای بۆ دەچووم ئەلحانەکە دەستەکانی بە دەوری ملمدا دەهاڵێنێ، ئەلحانەکەیە وا لە ڕەنجی بێبەریبوونی تەمەنێکدا، باسکەکانی بۆ تۆڵەکرنەوە هەڵدەسووڕێنێ. ئەلحانەکەیە وا ڕقی نەزۆکی هەزارە هاویستی زیندانیی ئەو پەنجەکانی لە سنگم ڕۆکات و جەرگم لەنێو بەری دەستەکانیدا داچۆڕێنێ.

بە هاوارکێشان لە جێگاکەم ڕاپەڕیم، پەیکەرە مەرمەڕینەکەم حەوا دایە عەرزی، لەسەر جێوبانە پڕ لە کایەکە کۆم بوومەوە و، بالاپۆشەکەم بە سەرمدا کێشا و، هەتا بەیانی -تاکو ئەو کاتەی لەوپەڕی شوێنەکانی دارستاندا نەعرەتەی ئەو گایانە بەرزبۆوە کە بۆ لەوەڕیان بردبوون. -گوێم

دایە دەنگی نالَین و هاواری تێکشکانی ژنە بەردینە- لە ئێشی فرێ دراوبوون و تێشکاندا دەینالاند و لەتلەت دەبوو- بە خۆمم وت: "کێ بەمە بروا دەکات؟" لە ڕاستیدا بۆچ پێویستە کەسێ بڕوا بەمە بکات؟.. نەخێر! هەر سبەینێ، لە گەڵکوو هەوا بڕێ ڕووناك داگەڕا، لەتوپەتەکەی دەکەمە زەمیەلەیەك و دەیبەم دەیڕێژمە تالاوەکەوە.. بە جاروجەهەنەم! لێگەڕێ با کەسێ بڕوا بەمە نەکات، لێگەڕێ با شەیتانیش بڕوا بەمە نەکات".

بەلام لە گەڵکوو بەیان هات و کابوسەکانی شەوانە ڕایان کرد، لەگەڵوو هەتاو لە قەڵەشتی تەختەکانی دەرگاکەوە ڕژایە ناو پەسێوەکەوە و لە تانوپۆی بالاپۆشەکەوە ڕێی بردە چاوەکانم و من بالاپۆشەکەم لەسەرم لادا، هێشتێك لە پەسێوەکەدا نەبوو، هەر هیچ هیچ! دەتووت دوێ شەو لەوێ ئاو لە ئاو نەکەوتووە..

کیلۆنی دەرگاکە دەستی وێ نەکەوتبوو. ڕۆییمە پێشێ و لەقەیەکم لە کاژێرە پێچکەدارە قەدیمییەکە هەڵدا. لەنگەرەکەی لە نێوان تانوپۆی جۆلاتەنەکەدا جووڵەیەکی قورسی کرد و دەنگێکی ئیشکی لێوەهات، جولاتەنەیەکی زەلام لە ترسانا لەوێ دەرپەڕی و، بەرەو ساپیتکەکە ڕایکرد و لە قەڵشتی میچی پەسێوکەوە ڕۆیشتە دەرێ. بڵێی کابوسێ بوویێ؟ ها؟ ئێوە وای بۆ دەچن تووشی کابوس بوویێتم؟ حەە! منیش لەو ڕۆژانەدا وام بیرکردەوە. خەیالم دەکرد گرفتاری کابوس بوویێتم. بە تایبەت کاتێ چوومە ژێرخانەکە و پەیکەرە مەڕمەڕینەکەم بینی کەوا لەژێر کاوکۆت و پارچە بڕاوەکانی دەمە مەقەست و لەنێو قوتووی دارە تەرمەکەدا بە هێمنی خەوتووە! ئەعسابم بڕێك حەسانەوە. بە خۆم پێکەنیم و وتم: "شتێکی گالتەیە گیانەکەم، هەمووی گالتەجاڕ و گەپجاڕێکە! هەم ئەو خەیالاتەی لە کەللەت ئەدا، هەم ئەو قسانەی ژنی خان و دایکی ئاغا دەیانوت!"

بەلام من هەشت سالْ بەم کابوسەوە ئەشکەنجە درام. چەند کەڕەت لەو پەسێوە ڕامکرد و شەوێ لەژێر دارچنارە بڵندەکانی قەراخ تالاو ڕامبوارد. بەلام لەوێش لەگەڵکوو شەو دادەکشا و هەسارەکان تالاوەکەیان پڕ لە زەنگیانە دەکرد، هەمدیسان ئەو شتەی پێم دەوت کابوس دەهاتە شوێنم. لەبەرئەمە هەموو کەڕەتێ دەگەڕامەوە بۆ پەسێوەکە و پێ ملیی سامناکی چارەنووسی تالی خۆم دەبووم. دەرك و دیوارم لەسەر داخرابوو. شەیتان چیرۆکی ژیانی منی نووسیوە. من بێچ لە تابشت هێنانی ئەمە چارەم چی بوو؟ دەمزانی نە خوا و نە دۆعا و نە یاخیبوون، هیچ شتێك، هیچ شتێك یارمەتیم نادا لەو بەندو زیندانە پڕ ئەشکەنجەیە ڕاکەم.

قژ و تینۆکەکانم بڵند بووبوون، قەلافەتی جووکی*یەکانم لێدەرچووبوو. داربڕەکان کە بە شانی پەسێوەکەمدا تێپەڕ دەبوون بیسمیللایان دەوت و چما لەنێو دارستاندا تووشم بایەن، ڕێگەکەیان بادەداوە، هەزار ئەوسانەیان بۆ من و پەسێوەکەم سازاند، دەیانوت جادووگەری دەکات و ژێرخانی پەسێوەکەی پڕە لە تەرمی مۆمیۆشراو دەیانوت لەگەڵ تەرمی ئەو ژنە تازە

مردووانە کە شەیتان لە گۆڕستانە دوورەکانەوە بۆی دێنێ، جووت دەبێ و ئەفیۆن و بەنگ دەکێشێ و لەتەك ڕوحیانەتی بەدکارەکاندا وتوێژ دەکات.

دەیانوت: "شەوانە لە قەراخ تالاوەکەدا بەدووای گیایەکدا دەگەڕێ کە کۆلانی دراوی شیمیایە!" نا، چارە ڕەشەکان، نا.. قسەی ئاوها لە گۆڕێدا نییە. من هەر نەفرین لێدراوێکم کە خوای ئێوە لە یادی بردوومەتەوە. یاریکەرێکی یەخسیرم کە شەیتان بۆ شانۆکەی خۆی دیلی کردووم. من دەبێ تاکو ئاخری ئەم یارییە درێژە بدەم و لە ئاکامدا -چما قسەی جادووبازان بایەخێکی هەبێ- لەتەك ژنێکی مردوودا زەماوەند بکەم.

* * *

شەوێك، دووایین شەو، وتم ئیدی ئەم چیرۆکە کورت دەکەمەوە. چ دی نامەوێ یاریکەری بێ ئیرادەی چیرۆکی شەیتان بم: "نەفرین بۆ هەمووتان!"

تەواوەتی شەو بە خەبەر دانیشتم و هەتا ئەو کاتەی هەوەڵ جوولانەوەی لەنگەری کاژێرەکە لە گوێمدا دەنگی داوە و پەسێوەکە بە تیشکی مانگەشەوێکی بێ نسێ ڕووناك داگەڕا، بەڵکەم تاکو بەینێکیش لەپاش ئەمە، تاکو ئەوکاتەی زاڵبوونی شەیتانم وەکو نەشئەی ژەهرێك لە هەموو دەمارەکانمدا هەست پێ کرد، یەکبین دەمنەڕاند: "نەفرین لە هەمووتان! هەم تۆ، سێبەری بەدکارەی شەیتان! هەم ئەو پەیکەرە شەوگەڕە نەفرینلێکراوە، هەم ئەم پەسێوە، هەم ئەم کاژێرە کۆنە ئەنتیکەیە کە تەلەکانی لەبەر دەروازەی ئەم هەرمانە دۆزەخییەدا ئێشك هەڵاتوون!.. نەفرین لە هەمووتان!"

شەیتان وتی: "ئیدی میوەکەت گەیشتووە! ئێستا ئیدی میوەکەت گەیشتووە!" من قاقا پێکەنیم. بە هەموو برینەکانمەوە، بە هەموو ڕقمەوە پێکەنیم. نیگایەکی لێوانلێوی ڕق و بوغزم لێکرد و دیانەکانم بەسەر یەکدیدا گوشاردا: "ئەیی شەیتان!"

شەیتان وتی: "ئەمە دووایین پەردەیەتی. ئیتر میوەکەت گەیشتووە.."

پێم وت: "بێئابڕووی پێداگر! ئەم تەلسمە نەفرینییەت دەشکێنم!.. هەشت ساڵی تەواوە کە ئەم یارییە دڵتەزێن و ماندووکەرەوەیە درێژە ئەدەی.. ئیدی ئەمشەو من دەمەوێ یان دەست پێ بکەم یان تەواو بم! -مردن جارێك و شیوەن جارێك! ئیدی لەمشەوڕا یان زەنگیی زەنگی، یان ڕۆمیی ڕۆمی،- ئیدی هەر ئەوەیە وا وتم!"

ئەو بنەمۆمە گەچینەیەم داگیرساند و لە قەراخ جێوبانەکەم لە مۆمدانە بوڕۆنزییەکەیدا بوو، بە دەستمەوە گرت و تەورەکەشم هەڵگرت، لە دەلاقەی دالانەکەوە بەرەو ژێرخانەکە چووم و وتم: "تەلسمی نەفرین لێکراوت.. ئەرێ! تەلسمی نەفرین لێکراوت دەشکێنم".

ئەویش لەگەڵ مندا هاتە خوارێ. لە سەرێك دوو کەرەت، بێ ڕاوێستان وتی:

"عەمر درێژ بی کوڕم! ئەمشەو ئیدی وەختی خۆیەتی.. برێك وەدووا کەوت، هەقی خۆتە ئەرێ. بەڵام کارێکی لەگەڵدا نەدەکرا: هەرشتێ کاتێکی هەیە."

نێوچەوانی بووە نازانم لەبن دڵیدا بوو، بەڵام نێوچەوانی بوو. دیسانەکەش دەتوت جێیەکی لەنگە. دەتوت زۆریش متمانەی نەبوو. بە دەوروبەرمدا دەسووڕاوە. بڕێ جار لە دوواوە و بڕێ جار لە پێشەوە. دەتوت دڵی هەواڵی داوە کە ڕووداوێکی ناجۆر دەقەومێ، بەڵام بڕوای نەدەکرد. کە گەیشتینە خوارەوەی پەیژە ڕزیوەکە ویستی شتێ بڵێ کە تاقیم کاتەوە، بەڵام کاتێ بینی بەرەو قوتووی ڕوواڵەت تابووتەکە دەچم، لێی حاڵی بوو. پێشی پێ گرتم، بەرەو ڕووم، هەروەکو دەڕۆیشتە دواوە و تێدەکۆشا ڕێگەم پێ بگرێ، هاسکە هاسکی دەکرد و وتی:

"چاوکە کوڕە! خۆ ناتەوێ هەروا لە خۆڕایی چەپکە گوڵێك بە ئاودا دەی؟"

"ئەمشەو ئیدی ئەم کارە تەواو دەکەم، ئەمشەو کۆتایی بەم کارە دێنم. ئەمشەو ئیدی یان زەنگیی زەنگی یان ڕۆمیی ڕۆمی!".

وتی: "گوێ بگرە کوڕە! تۆ تەمەنی خۆت لەسەر ئەم کارە دانا. بە جۆرێك جێبەجێم کردووە لە کۆتاییدا خۆشت بێ هەواڵ نەبی.. پێم خۆش نییە مزەی تەمەنێ لەو ڕەنجەی بۆ ڕزگارکردنی من کێشاوتە، ڕەشایی هەتاهەتایی بێ.. فیکرم لێ کردۆتەوە.. جێبەجێم کردووە. ئەو شتەی لە بریدا وەریدەگری بایەخی هەزار ساڵ ڕەنج و چارەڕەشی هەیە! ئێستا دەیدینی!.. هەموو ئەم کارانە لەبەر ئەوە بووە هەتا ئەم دەرگایە بکەیەوە و من لەم خەمخانەیەی خوادا ڕێگەی ڕزگاری بدۆزمەوە. لەم تاریکخانە بۆگەنەی کە ئەو بە کۆس و کەڕەنا منەتەکەی بەسەر ئێوەی بەندەی تاوانباردا دەکا، ڕزگاربم. ئەم کارە هەر بە کەسێ دەکرا کە بە لاقی بەرە و قوبڵەوە.."

بە نەفرەتەوە تەماشای کۆی ڕەشی نسێکەیم کرد، خوڵێ بە دەوری خۆیدا سووڕاوە و لە جێییەکی دوورەوە دەنگی بەرز بۆوە:

"دەسخۆش! مزەت ئەوینە. ئەو شتەی خودی غەنیم لێی بێبەشەو هەر لەبەر ئەمەش لێیدەترسێ!.. دەرگاکە بکەرەوە و مزەت وەرگرە. عەمر درێژ بی کوڕم!"

کاوکۆڵۆشی سەر پەیکەرەکەم ڕشتە خوارێ، هێزێکی دۆزەخی لە بازۆڵەکانمدا بوو، ڕووباری دۆزەخ لە بازۆڵەکانمدا و لە لاقەکانمدا بوو. دەسکی تەورەکەم لە نێوان قامکەکانمدا ئەملاولا کرد.

وەکو گەردەلوول سووڕا و باڵای بڵندی سێبەر ئاساکەی لە نێوان من و تابووتەکەدا وێستا: "لەخۆڕا دەست لەم پەیکەرەیە مەوەشێنە ما؟!.. چما خاڵێکی تێکەی ڕۆژگارت ڕەش دەبێ ها!"

گۆڕاندم: "لەمەش ڕەشتر؟"

"لەخۆڕا ڕۆژگاری خۆت ڕەش مەکە کوڕە!"

گوڕاندم: "لەمە ڕەشتر!"

خولاوە و بە خۆیدا نووسی و هاواری کرد: "ئەمە نەفرەتە ڕۆڵە! ژەهرێکە کە سەدقاتی دۆزەخە. ئاقڵ بەو ئەم ژەهرە تف کەرەوە!"

لێوانلێوی چێژی ئەوە بووم کە ئەو چ ڕەنجێکی دەکێشا. دیانەکانم بەسەر یەکدا گوشار داو تەورەکەم بەرزکردەوە. نەڕاندی: "دەست ڕاگرە!".

تەورەکەم بە تەواوی هێزی خۆم بە سنگی پەیکەرەکەدا داکوتا. بە دەنگی ئیشکی تێشکانی

پەیکەرەکە، نالینێکی هیوابڕاو لەو سەری ژێرخانەوە گەیشتە گوێم. ئاخ من ئەو دەنگەم لە هەموو شەوانی لێڵ و درێژی تەمەنی خۆمدا، لە قوولایی دڵ و ڕۆحی خۆمەوە بیستبوو.

شەیتان لەگەڵ ئاخکێشانێکی درێژ وتی:

"مەخابن بۆ تۆ، کورە! ئامۆژگاری کردی نەدبیست. مەخابن بۆ تۆ. ئەو سەوقاتەی بۆم تەیار کردبووی چێژی ئەو میوەیە بوو کە نەیهێشت ئادەم لە بەهەشتەوە بیهێنێتە سەر زەوی. ئەو کەسەی لەو میوەیە بچێژێ ئیدی پێ ملی ئەم نادادوەرییە خۆپەرەستانەیە نابێ.. ئەرێ کوڕە! کارەکانی ئەو هەرگیز بێ حەسێب و لە خۆڕا نییە. بە ژەهری ئەو نەفرەتەوە کە کردییە گیانتەوە وای لێکردی بە دەستی خۆت تەشوێ بە ڕەگ و ڕیشەی بەختی خۆتا بکوتی! ئیدی توورەکەی ڕەنجی خۆت هەڵگرە و حازربە بەشی تۆ چەند بەرابەر کات. ئاخر تۆ ئێستاکە بوویتە یارمەتیدەری شەیتان!"

بێ ئیختیار بەرەو ئەوسەری ژێرخانەکە ڕامکرد، ئەو لەپێش مندا گەیشتبوویە، لەوێ لە قەراخ ڕەگوڕیشە تێکپێچراوەکانی ڕاوێستابوو و دەتوت دەگری.

مۆمدانەکەم لەسەر عەرزی دانا و بە تەورەکە بەربوومە گیانی ڕەگوڕیشەکان. دەتوت بێجگە لەمە چارێکی دیکەم نەبوو، دەتوت پێجگە لەمە کارێکی دیکەم نەبوو..

چەندان سەدەی دوورو درێژ، ساقەتە و گەلاوگوڵی ئەم ڕەگوریشەیە، لە دەرەوەی ژێرخان و لە دەرەوەی پەسێوەکەدا، لە هەتاو و هەوای دارستان تیشك و پشوویان گرتووە، بۆیە ئاوها تێکپێچراون. چەندەها سەعاتی دوورو درێژ سەرقاڵی کارکردن بووم. دەتووت شەیتان هەموو هێزی خۆی داوە بە من، هەتا لە ئاکامدا (نازانم چ سەعاتێ بوو، لە دەرەوەی ئەوێ تازە کەڵەشێری بەیان دەیانخوێند، یان لە ڕاستیدا خۆر دەرکەوتبوو لەنێوەڕۆنی تێپەڕیبوو، لە پشت قەوزە و ڕەگوڕیشەیەکی زۆری تێکپێچراوەی درێژەوە، دەرگا مەفرەقینەیەکی ڕازاوەی گەورە وەدیار کەوت. ڕەگوڕیشە بڕدراوەکانم لە بەردەم دەرگاکەدا لابرد. دەسکی تەورەکەم لە هاڵقەی دەرگاکەوە بردە ئەودیوەوە، بە دوو دەست، هەردووك بەریم گرت و بە ڕاوەشاندنێك دەرگاکەم کردەوە.

سەرمایەکی تەڕ بزووت و، شتێك لەبەر پێی مندا بە عەرزیدا کەوت. ژنێکی سەرتاپا ڕووت و قووت، شۆڵەی لەرزۆکی مۆمەکەم کە بردە پێشەوە، دیتم نیوەڕاستی هەردووك مەمکی قەڵشتێکی گەورەی خوێناوی تێدایە. دەتوت بە شتێکی وەکو تەور بە نێوەڕاستی سنگیاندا کوتاوە. مۆمەکەم کە لەبەر ڕوخساریدا ڕاگرت، دیتم هەمان ئەو ژنەیە وا پەیکەرەکەیان لێ ساز کردووە. ئەمنی کە دیت شتێك لە پشت بیلبیلە گەورە سەرسوڕماوەکانیدا کشاوە دوواوە، پێڵووەکانی پێکداچوون و سەری بە لایەکدا کەوت. شەیتان وتی: "کوشتت. بەڵام فەرامۆش کردنیش هەیە. جادووبازی بەدەستوبرد، هەموو کارەکانی لە ڕووی حەسابەوەیە، ئەگینا حەسابی ئەم غەمخانەیە

تەنانـەت یـەك ڕۆژیـش نەدەگەیشــتە ڕۆژئــاوا.. چ گۆڕستانێك!

دڵم نیسکۆڵە خوێنێکی دەڵەمەیـە.. دەسخۆش کـوڕە! مـن لــەم دەرگــاوە دەڕۆم. دەرمــانی تــۆش حازرە: فەرامۆشی و لە یادبردنـەوە! تێبکۆشـە زۆر گوشار بۆ خۆت نەهێنی".

★ ★ ★

من چیم نەوت. لە ژێرخـانی بـەتاڵدا چ دەنگێك نـەبوو. دەنگی داخرانـی دەرگاکـەم بیســت و گوێـم دایـە چکـەچکی داچۆڕانـی ئـەو دڵۆپـە ئاوانـەی لـە شوێنی بڕدراوی ڕەگوڕیشـەکەوە دەتکانـە خـوارێ. مۆمەکــە پتــەپتێکی کــرد و کــووژاوە. لــە شــانی ژنـە مردووەکـە ڕاکشـام و ئیـدی گریـان دەرفــەتی نەدام.

هەسـتم کـرد لــە زۆر زۆر لەمەوبــەر ڕا خۆشــم ویستووە.

## سەرچاوە

کتێبی دەرگاکان و دیواری گەورەی چین، ئەحمەد شاملوو

بڵاوکراوەی دامودەزگای مرواریدی تاران

چاپی دووهەم *1357–1978*

لاپەڕەی *7* تا *37*

## فەرهەنگۆك

*ئارەقی سەگی: ئارەقی هەرە تاڵ کە ئاڵ کۆڵی زۆر بێ

*جووکی یان بووکی: دەروێش و عـاریفو ریازەتکێشـی ئاینی پەڕەهمایی لە هیندستان



# لەگەڵ ئالان ڕۆب گریێدا

▪ لەفارسیەوە: محەمەد کەریم

## من لە مۆزەخانەکەی خۆمدا دەژیم


ئالان ڕۆب گریێ

هاوینی (ئەمساڵ) ئالان ڕۆب گریێ، مەشخەڵ هەڵگری ڕۆمانی نوێ و ئەکتیڤ و سەرقاڵ، تەمەنی بوو بەهەشتا ساڵ. ڕۆب گریێ بەبۆنەی بڵاوبوونەوەی کتێبە تازەکەیەوە کەبەناو نیشانی (تکرار- دوبارەبوونەوە)یە، لەجیاتی ئەوەی لە ئاپارتمانەکەی ماڵی باوکی لەنۆرماندی پێشوازیمان لێبکات بانگهێشتی کردین بۆ ئاپارتمانە جوان و ڕێک و پێکەکەی کەنزیکە لە (بوادوبولونی)یەوە. ڕۆب گریێ لە دوابەشی کتێبی (مسافر- ڕێبوار)دا نووسیوویەتی کەحەزی لە چاوپێکەوتن نییە، بەڵام لەڕاستیدا بەگەرم و گوڕپییەوە وەڵامی پرسیارەکانی ئێمەی دایەوەو لە سەرەتای قسەکانیدا بەپێکەنینەوە وتی: (من نەهێنری میشۆم نە ساموێل بیکیت، من هەمیشە گەمەم کردووە) ڕاستیەکەی ئەوەیە کەکاتێ قسەکانی ڕۆب گریێ دەخوێننەوە با دەنگی گەرم و گوڕو پێکەنینی ئەم (گەمەکەرە)تان لەگوێدابێ.

** ئەمڕۆ لەگەڵ ئەو بەهاو متمانەیەی کە وەکو نووسەرێك بەدەستت هێناوە چۆن خۆت دەسازێنی و لەو بارەیەوە چ ڕوونکردنەوەیەکت هەیە؟*

-بەر لەهەرشتی دەبێ بڵێم من لەگەڵ خۆمدا هیچ کێشەیەکم نییە، لەبەرئەوە لە ژیانی مندا هەواڵی ئەو گیرۆدەییە تاڵە نییە کە ڕەنگە نووسەرێك لەگەڵ خۆیدا هەیبێ. بەتایبەتی کەنووسەریی بەڕای من لە (خودی)ئینسانەکاندا نییە، بەڵکو جۆرە ئیشێکە. دەشی (پیشە)ش بێت، چونکە ساڵەهایە کە من مافەکانی نووسەریم هەیەو سوود لە ئیمتیمازی وەکو بیمەو مافی بێکاریو خانەنشینی وەردەگرم. بەڵام دەتوانم بە ئیسراحەت، بێئەوەی کە کەڵکەڵەی چاپکردنی نووسینەکەم هەبێ، بنووسم. ئەگەر بیرۆکەیەکم بەمێشکدابێ، دەبێ بیخەمە سەرکاغەز. نووسین یەکێکە لەو ئیشانەی کەحەزم لێیەتی، بەڵام لە هەمانکاتدا زۆر ئاسایی دەتوانم- هەتالەکاتی نووسینی کتێبێکیشدا- واز لەنووسینەکەم بهێنمو بۆ ماوەی چەندین مانگ بچم بۆ سەفەر.

ئەمە بابەتێکە کە بەهیچ جۆرێ بەلای نووسەرانی ترەوە قابیلی هەرسکردن نییە. ناتالی ساروتم بەیاد دێتەوە کە قەت نەیدەتوانی لەناوەڕاستدا دەست لەکارەکەی هەڵبگرێ. پێم وایە فلیپ سۆلریس[1] یش هەروایەو دەبێ بەیەك جار کارەکەی تەواو بکات. بەڵام من ئەو خەمەم نییە. چونکە ئیشی زۆری دیکەم هەیە کەدەبێ بیانکەم. لەلایەکی دیکەوە، بەڕای من نووسەران کۆمەڵەکەسێکن، کەقەت لەیەك ناچن. هەرگیز پێگەیەکی هاوبەشیان نییە. بەکردەوە هیچ پەیوەندییەك لەنێوان کەڵکەڵە زیهنیەکانی ژان دورمیسون[2] و من دانییە. بەڵێ خەڵك وەکو نووسەر من دەناسنو لەشەقامەکاندا ئاماژەم بۆ دەکەنو بەیەکتریم نیشان دەدەن. بەڵام لەو حاڵەتەشدا دیسان ئەم روخسارەی من نییە کەوەکو نووسەر ناسراوە. بەڵکو وێنەی مرۆڤێکە کەلەبەرنامە تەلەفزیۆنیەکاندا دیویانە.

*** *یان لەفەرهەنگی ئەدەبییدا..***

-لەڕاستیدا خۆم وەکو کەسایەتیەکی مێژوویی و (دیمەنێکی خۆماڵی)دەبینم. وزۆریش خۆشحاڵم کەناوچەی نۆرماندی منیان (خۆماڵی)کردووە.

*** *ئەم (خۆماڵی کردن)ە چۆن ڕوویدا؟***

-کریستیان بورژوا، سەرۆکی (ئەنستیتۆی یادگاریی بڵاوکراوەی هاوچەرخ)ە (*IMEC*). ژنێکی گەنجو وبێوینە بەناوی ئان سیمۆنن کە لەسەر داوای ئەم ئەنستیتۆیە کتێبێکی دەربارەی بڵاوکراوەکانی (مینویی)[3] دەنووسی، دەیەویست لەنامەکانی ساڵانی پەنجای من بکۆڵێتەوە. بەدرێژایی هاوین وێڕای خانوویەکی بچووك لەپارکی ئاپارتمانەکەی ماڵی باوکم لەنۆرماندی چەندین کارتۆن نامەو بەڵگەنامەم خستە بەردەستی. لە بەرامبەر ئەمەشدا بڕیاربوو ئەو ئاگای لە رێکخستنی هەوای خانووەکەم بێت، ئەو کۆمەڵە گیا (صُبیر)ەی کە کۆم کردوونەتەوە بەلامەوە زۆر گرنگن؛ لەو دەستەیەدا پێنجسەد جۆر (صُبیر)م هەیە. ئان سیمونن کەعاشقی (صُبیر)ەکان ببوو لەبارەیانەوە لەگەڵ کریستیان بورژوا قسەی کردو پاشان بورژوا تەلەفۆنی بۆ کردمو وتی (بەنیازین کۆمەڵە (صُبیر)ەکەت لێبکرین بۆ ئەوەی دوای مردنت بێخاوەن نەبن) بەسەریا قیژاندم (مەسەلەکەت زۆر بەجدی گرتووە.

ئەمە جوانترین کۆمەڵە (صُبیر)ە لەزویرخ دا کە (3500)جۆر (صُبیر)ی لەخۆگرتووە، بورژوا لەوەڵامدا وتی: (لەفەرەنسەدا دار بەڕووشمان زۆرە؛ بەڵام لەکاتێکدا ئەم دار بەڕووە لەلایەن فیکتۆر هۆگۆوە روێنرابێ، زۆر لەدار بەڕووەکانی دیکە جیاوازە).

لەوێدا بوو کەپێم وت میراتگرم نییەو کاترینی خێزانیشم، کەسێکی وای نییە کەلەدوای مردنی میراتی پێببڕێ. لەبەر ئەوە ڕێکەوتننامەیەکی سێ قۆڵی لەنێوان ئێمەو IMECو شارەوانی نۆرماندیدا ئیمزاکرا.

ئەوان بەنەقدی هەموو شتێکیان لێکڕین: (صُبیر)ەکان، خانووەکە، کەل و پەلی ناومالّ، شتەکانی ئەم ئاپارتمانە پاریسیەو هەموو کتێبەکانم. بەڵام بەپێی ڕێکەوتننامەکە هەتا لەژیاندا بم دەتوانم بەئیسراحەت هەمووشتەکان بەکاربێنم. ئیتر هیچ شتێ، هەتا کەوچکەچایەکیش لەم ماڵەدا هی خۆم نییە. کاترینیش وەکو من هەتا مردن دەتوانێ هەموو شتەکان بەکاربێنێ. لەگەڵ ئەوەشدا ئەو پارەیەش خەرج دەکەین کەخراوەتە حسابی بانکیمانەوە، هەروەها ئەوان بەڵێنیان داوە دەست لەهیچ کەل و پەل و سامانێکی من نەدەن و ئاگایان لێم بێت بۆ ئەوەی خەیاڵم ئارام بێت. حاڵی حازر من لەمۆزەخانەکەی خۆمدا دەژیم؛ ئەو مۆزەخانەیەی کەچیتر نەئەرشیفێکی تێدایەو نەدەست نووسێك؛ چونکە هەموو ئەو شتانەیان گوێزایەوە بۆ IMEC. بۆ سوود لێوەرگرتنیان پرس و ڕاوێژ بەمن دەکەن. بۆ هەرشتێك کەبیانەوێ بڵاوی بکەنەوە دەبێ مۆڵەت لەخۆم وەربگرن.

** دەبێ کەی هەموو بەرهەمەکانت لەکۆمەڵەی (پلییاد)[4] دا ببینین؟*

–لەلایەکەوە (پلییاد)باوەڕی وایە کەکتێبەکانی من زۆر پـر فرۆشت نین و لەلایەکی ترەوە، بڵاوکراوەی (مینویی)بەهەمان شێوە کەهیچ کاتێ ئامادە نەبووە بەرهەمەکانی بیکیت بخاتە بەردەستی پلییاد، لەبارەی منیشەوە هەمان سیاسەتی گرتۆتە بەر.

** ڕێگە دەدەی لەم ڕۆژانەدا ژیاننامەی تۆ بنووسنەوە؟*

–بەڵێ IMEC هەموو بەڵگەنامە پێویستەکانی لەبەردەستایە. بەڵام لەبارەی هاوکاری کردنەوە لەگەڵ نووسەردا لەڕێگەی چاوپێکەوتن وگفتوگۆوە ، من هێندە متمانەم بەزیەنم نییە. ئەگەر بڕیار بوایە خۆم ئەم ژیاننامەیە بنووسم قەت کێشەم نەدەبوو کەلەو شتانەدا داهێنان بکەمو لەبارەی ئەو بابەتانەوە قسەبکەم کەزیهنم لەبارەیانەوە گۆڕابێ. بەڵام لەکاتێکدا ئەم ژیاننامەیە کەسێکی دیکە دەینووسێ، مەسەلەکە کەمێك ئاڵۆزتر دەبێ. لەڕاستیدا باوەڕم وایە نووسەر تەواو ئەو مافەی هەیە چەند شتێ لەو کەسە دەربێنێ کە ژیاننامەکەی دەنووسێ.

** تۆ سێ بەرگ (ژیاننامەی خەیاڵیت)بڵاوکردۆتەوە لەژێر ناونیشانی (ئەو ئاوێنەیەی کەدەگەڕێتەوە)، (فریشتە ئاسا یان جادو)، (دوا ڕۆژەکانی کورنت)*

–کەیەك لەیەکتری تەمومژاوی ترو خەیاڵی ترن..

*لەهەمان کاتیشدا چەند ڕەگەزێکی ڕاستیان تێدایە. تۆ نووسەرێکی ناسراویتو بەتەواویش جڵەوی ئەم ناوبانگو ناسراویەت لەدەستدایە. بەڵام ئایا ئامادەی ئەمڕۆ ڕازەکانی ژیانت ئاشکرا بکەی؟*

–لەکتێبەکانمدا سەبارەت بەهەموو ڕازەکانی ژیانم قسەم کردووە، بەڵام ئەو ڕازانەم کردووە بەچیرۆكو حیکایەتو بەلامەوە خۆش نییە بەشێوەیەکی دیکە ئەو رازانە بڵێم؛ چونکە (ریالیزم) لەراستیدا هەمان ئەو چیرۆکانەیەکە باسم کردوون.

*ئایا ئەوە ڕاستە کەڕای هیچ کەسێکت بەلاوە گرنگ نییە؟*

–بەتەواوەتی کاتی خۆم سەرف دەکەم تا قەناعەت بەخۆم بێنم کە لەشوێنی ئەم رستەیە، ئەو رستەیە دابنێم.. لەبەر ئەوە ئەگەر بڕیاربێ کەسێکی دیکەش لەمەسەلەکەوە بگلێنم، وا وەیلا بەحاڵم..! بەڵام لەبواری سینەمادا بەڵێ فەرق دەکات؛ چونکە فیلم کارێکی گروپییە. نووسینی ئەدەبی، تەنهایی ڕەهای دەوێ. هیچ کاتێ حەزم نەکردووە ئەو کتێبەی کەدەینووسم بۆ کەسێکی دیکەی بخوێنمەوە. تەماشایەکی فەرهەنگو ئینسکلۆپیدیاکان یان فەرهەنگی زمانی فەرەنسی دەکەم؛ بەڵام ئەم کارە لە تەنیاییدا دەکەم.

لەوساتەدا کەخەریکی نووسینم، تەنهاییم وئەو باوەڕە پتەوەم لەگەڵدایە کەبەتوانای خۆمم هەیە.

*ئەو باوەڕەت لەسەرەتای کارکردنیشەوە هەبووە؟*

–بەڵێ، لەڕۆمانی (خەتکوژێنەرەوەکان) بەدواوە. ئەم باوەڕە لە کاتی نووسینی ڕۆمانی (کوشتنی پاشا)دا کەمتربوو بەڵام خودی کتێبەکە شتێکی داهێنەرانە نەبوو. ماوەیەکی زۆر بیرم لەوەدەکردەوەوە کە کتێبەکانم چاپ ناکرێن، بۆچی؟ چونکە قەت لەوە نەدەچوون کە دڵم دەیەویست. گاستون گالیماری (دامەزرێنەری



کافکا

دەزگای بڵاوکردنەوەی گالیمار) لەگەڵ خوێندنەوەی (کوشتنی پاشا)دا یەکسەر ئەمەی پێوتم. بەڵام بنەماڵەی رۆب گریێ، دایکمو باوکم هەموویان باوەڕیان بەو بەهایە هەبوو کەهەیانبوو هێندەش بایەخیان بەمە نە دەدا کەخەڵکی چیان لەبارەوە دەڵێن. کلودل[5]یش هەمان مەسەلە لەبارەی خێزانەکەیەوە دەڵێت: هەژاربووین، لەکولانی گساندی شوقەیەکی بچووکمان هەبوو کەسێ ژووری بچووكو تاریکی هەبوو چوار قۆڵی تیایدا دەمان گوزەراند. بەڵام ئەمانە هیچیان گرنگ نەبوون، ئێمە بنەماڵەی رۆب گریێ بووین. لەڕاستیدا ئەم مەسەلەیە بۆ ماوەییش بوو. زۆر زوو بیرم کردەوە کەهاتووم بۆ

ئەوەی ڕێنمایی خەڵك بكەم بۆ ڕێگای ڕاست؛ بەم سادەییە.

** وەكو ڕزگاركەرێ؟*

—زیاتر وەكو پەیامبەرێ؛ كە هاتووە بۆ ئەوەی ڕۆح و دەروونی مرۆڤ بگۆڕێ، چونكە فەیلەسوفانی وەكو كانت لەم گۆشە نیگایەوە، وەكو پەیامبەر وان، كاتێ دەستم بەنووسین كرد هەرگیز سەبارەت بەوەی كەدەمنووسی دڵنیانەبووم. ئەو خەیاڵەی كە من هۆی پەشێوی خۆمم بەخەستی لەبوونمدابوو. كە هەم پەشێوم و بوونەوەرێكی نموونەییم كەبەدڵ حەزم دەكرد وابم. لەگەڵ ئەوەشدا كەبیردەكەمەوە لە وەڵامی (پرسیار نامەكەی پروست)دا لەو شوێنەدا كەپرسیار دەكرێ: (حەزت دەكرد لەجێی چ كەسی بوویتایە؟) وەڵامم داوەتەوە: (ئالان ڕۆب گرییێ).

بەڵام خۆشم بەباشی دەمزانی كێم. نەك وەكو هۆگۆلۆفی موزیكار كەلەكاتی مردندا وتبووی (ئای خۆزگە هۆگۆلۆف بوومایە!) هۆگۆلۆف تووشی شیزۆفرێنیا ببوو بەشێوەیەكی سەیر ڕاست ببووبە (دووكەس). لەبەرئەوە، كاتێ دەستم بەنووسین كرد دەمزانی وەكو دارتاشێ، ئیشەكەم باشتردەبێ. لەبەر ئەوەی لەبەردەستی باوكمدا ئیشم كردووە، لەئیشی دەستدا شارەزاییم هەیە. لەبەرئەوە دەمزانی هەموو ئیشێك پێویستی بەقۆناغی بینین هەیە. بەڵام دەمزانی هەڵكەوتوویەكم كەلەئایندەدا بەرهەمی داهێنەرانە دەنووسم. زۆری نەبرد ئەوە ڕوویدا. زۆر كەم دەنووسم؛ چەند ساتەوەختێ هەن كەئێستا ئەگەر ناویشیان نەنێین ساتەكانی نائومێدی، بەڵام زۆر شتی وا ڕوودەدات كە نووسەر تاڕادەیەك دەوەستێ و نووسینی لاپەڕەیەك چەند ڕۆژێ درێژەدەكێشێ. بەڵام هەر كەنووسینەكە تەواو دەبێ، باش دەردەچێ، دەزانم كەباش دەرچووە، بەڵام جاریوایە لەزەوقم دەدرێ. هەندێ كەس ڕای خراپیان سەبارەت بەنووسینەكە هەیە. سەبارەت بەكتێبی (ئیرەیی) دڵنیابووم ئەو شێوازەی كارم پێكردووە ڕاست بووە. لەبەر ئەوەی كاتێ دەبینم هاوكارانم بەئاسانی بەهای ئەو كارە نازانن كە كردوومە، تووشی جۆرێك لەنائومێدی دەبم. هەڵبەتە ئەم مەسەلەیە بەهیچ جۆرێ كار لە قەناعەتەكانم ناكات؛ بەڵام كەمێك دڵگرانم دەكات. نەك زۆر.

** كاتێ كتێبەكانی سەرەتات بڵاوبوونەوە، دەتتوانی حساب بۆ پشتیوانی پولان، بەتی، بلانشۆ، بارت، بكەی؟*

—ڕاستە، بەڵام ئەوان لەو كاتەدا زۆر بەناوبانگ نەبوون. لەسەرەتای دەست پێكردندا یان باشترە بڵێم هیچ كاتێ بیرم لەوەنەكردۆتەوە كەڕۆژێك بەپارەوپووڵی نووسەریی بژیم. بەهەرحاڵ ئەم مەسەلەیە لەدەزگای بڵاوكردنەوەی (مینویی) هەرگیز تەرح نەدەكرا. ئاخریەكەی ئەوەبوو كەچۆن بتوانن كتێبەكانم بفرۆشن. ئەمڕۆ نووسەران بەدوای ئەوەدا وێڵن كە كتێبەكانیان بفرۆشن. بیكیت نانی قەڵەمەكەی نەدەخوارد. زۆر پێویستی پێی نەبوو بەدەرامەتە كەمەكەی خێزانە خۆشگوزەرانەكەی ژیانی خۆی دەگوزەراند. لەلایەكی دیكەوە هیچ كاتێ نەچوو خەڵاتی نۆبڵەكەی وەربگرێ. بێ ئەوەی كەس بزانێ خەڵاتەكەی بەخشی بەرێكخراوێكی خێرخوازی

ئیرلەندایی. ئەوەی من دەمنووسی خوێنەرێکی کەمی هەبوو. بەلامەوە ئاسایی نەدەهاتە بەرچاو بەڵام ڕاستیەکەی ئەوەبوو.

ئەمڕۆ لەگەڵ بڵاوبوونەوەی کتێبی (دوبارەبوونەوە)دا کە پێشانیش لەلایەن کۆمەڵێ کەسی جیاوازەوە خوێندراوەتەوە، یەکسەر هەست دەکەم چیتر تەنها چەند هاوڕێیەکی خاوەن روانین نین کەکتێبەکەم دەخوێننەوەو خۆیان دەدەنە دەست ڕووداوەکانی کتێبەکەو بەو شێوەیە دەیخوێننەوە کەپێویستە بخوێنرێتەوە. پێت وانەبێت کەبەلامەوە گرنگ نەبێ کە خەڵکێکی زیاتر کتێبەکەم بخوێننەوە یان نەتوانن بیخوێننەوە. بەپێچەوانەوە زۆر بەلامەوە گرنگە. عەشقی منیش بۆ ئەوەی (نووسەر خۆی مامۆستای خۆی بێ) لەهەمان مەسەلەوە سەرچاوە دەگرێ.

** یەعنی دەبێ چۆن کتێبەکانی تۆ بخوێنرێتەوە؟*

-ئەوەی کەزیاتر سەبارەت بەرەوتی کامڵ بوونی ئەدەب روونکردنەوە بدرێ؛ ئەو روونکردنەوەو ئاماژانەی کە لە توندوتیژیو زبری ئەم جۆرە بینای ریوائییە کەم دەکەنەوە. ئەم جۆرە بینای ریوائییە، شەجەرە نامەیەکی هەیە. ئەگەر کەسێ لەو کاتەدا کەمن رۆمانی (ئیرەیی)م بڵاوکردەوە، (هێڵنج)ی سارتەرو (نامۆ)ی کامۆ-ی باش خوێندبایەتەوە. کتێبێکی وەکو (ئیرەیی) هەرگیز تا ئەو ڕادەیە سەرسامی نەدەکرد. دەبوو هەردوو هەستی بینینو بۆنکردن پێکەوە گرێ


سارتەر

بدەن. دەربارەی شێوازی نووسینی من قسەیان لە (قوتابخانەی گۆشە نیگا)کردووە؛ بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا بەشی زۆری (ئیرەیی)بەدەنگە جیاوازەکان دروست بووە. جۆرێك بەیەکداچوون لەنێوان گۆشە نیگاو دەنگەکاندا هەیە. ڕەخنەگرەکان هەستیان بەمە نەکرد. زۆربەیان کتێبەکەیان ڕەتکردەوە. هەتا رولان بارتیش سەبارەت بەئیرەیی تووشی گومانو دوو دڵی ببوو. لەبەر ئەوە کاتێ سەبارەت بە (دووبارە بوونەوە) هەمووان سەرسامیی خۆیان دەردەبڕن، نیگەران دەبم. هەڵبەتە تێدەگەم کەبۆچی کەسانێك کەلە ساڵانی دوایی جەنگی دووەمی جیهانیدا نەژیاون، ئەم حیکایەتە پڕ ڕازو مەتەڵو تەمو مژاویە کێشیان دەکات. لەم رۆمانەدا ئامادەبوونی بەهێزی مێژوو دەبینین. ئەوەی کەخەڵك وابیریان دەکردەوە کە سوسیالیزمی جیهانی هاتووە بۆ ئەوەی نەزم بەجیهان ببەخشێ- نەك هەر ئەوە نەزمی سوسیالیستیش، یەکسەر هەستیان بەوەکرد کە گەورەترین شێتیو دێوانەیی قابیلی وێناکردن بووە. لەساڵی *1945*دا هەستمان بەهەموو ئەمانەکرد. من گەنجێتیم لەناوجەرگەی بیرو باوەڕی زیادەڕەویی ڕاسترەودا بەسەربرد. پاشان ئەوروپایەکی وێرانمان لەبەردەستدا مایەوە. نەك تەنها شاری جێگای لەدایك بوونم واتە (بریست) بەڵکو تەواوی ئەو شارەجوانو ڕازاوانەی ئەڵمانیا وەکو دیرد، لایبزیك خاپوربوون- لەگەڵ هەموو ئەم نەهامەتیانەدا، ئەڵمانیا

بــەلای منــەوە هــەر بــەولاتی گۆتـــەو هیگـــل مایەوە.

*** تـۆ شـایەتی تێکشـاندنی خـەونی بـاوکت بووی..**

-نەك تەنها خەونی باوكی من، بەڵكو شایەتی تێكشاندنی خەونەكانی سەراپای شارستانیەتێك بووم..

هەروەكو كەسانی وەكو ئادۆرنۆ لەو رۆژگارەدا وتیان، مرۆڤایەتی بوو كەوێران بوو هەرەسی هێناو مایەپووچی تەواوی ئەوروپای خۆرئاوای گرتەوە . ئەو مەسەلەیە پاشان بووە هۆی ئەوەی بەهانەیەك بدات بەدەست ئەوەی دووەمی (قوتابخانەی فرانكفۆرت)و كەسانی وەكو (هابرماس)ەوە بۆ ئەوەی پروپوچی لەم جۆرە بهۆننەوە (هەموو ئەوشتانە لەبەر ئەوە روویاندا چونكە لەجیاتی ئەوەی گوێ لەقسەی خەڵك بگیرێ، گوێ لە كەسە تایبەتیەكان گیرا).

راست بەپێچەوانەوە خودی خەڵك ئەو رژێمەیان ویستبوو. پاشان لەساڵی *1947*دا چوومە بولغاریاو لەوێ رژێمێكی پۆلیسیم بینی كەهەموویان مراقەبەی یەكتریان دەكردو ترس و تۆقاندن هەموو جێگایەكی گرتبۆوە. لەبەر ئەوە ئەوە تەنها ئەڵمانیاو نیچە نەبوون كە هەرەسیان هێنا، ماركس چەپی لەوان كەمتر نەبوو. نووسینەكانی من، بەشێوازو سیاقی خۆیان، مامەڵە لەگەڵ ئەو مەسەلەیەدا دەكەن و بێگومان (دوبارە بوونەوە) لەهەموو نووسینەكانم زیاتر باسی ئەو مەسەلانە دەكات، بەخەیاڵ و (فەنتازیا كانمەوە).

## پەراوێزەكان

*1-Sollers Philippe* (نووسەری هاوچەرخی فەرەنسایی).

*2-Jean Dormesson* (نووسەرو رۆژنامەنووسی هاوچەرخ).

*3-Minuit*یەكێكە لەدەزگا ناسراوەكانی بڵاوكردنەوە لە فەرەنسا كەمافی بڵاوكردنەوەی هەموو بەرهەمەكانی رۆب گرییێی هەیە.

*4-Pleiade*: كۆمەڵە (مجموعە)كتێبێكە كە لەناو بڵاوكراوەكانی گالیماردا چاپ دەكرێ و بەگشتی ئەو كتێبانەن كەبەكتێبی گیرفان لەچەند سەد یان چەند هەزار لاپەرەی تەنكی ناسراو بەكاغەزی ئینجیلی یان (تویكڵە پیازی)و لەچەند بەرگێكدا چاپ دەكرێن، كەهەموو نووسینەكانی نووسەرێك لەخۆی دەگرێ و جاری وایە هەتا كوژانەوەو رەشنووس و نامەو یاداشتی رۆژانەی نووسەرێكی ناسراو لەخۆ دەگرێ.

*5*-پول كلودل نووسەری فەرەنسایی (*1867-1955*).

## سەرچاوە

ادبیات داستانی -ژ-*3*- ابان *1380*

# لەگەڵ شاعیری هاوچەرخی ئێرانی (سەید عەلیساڵحی)دا

▪ لە فارسییەوە: هیلال ئیبراهیم

## لە کاتی نوسینی شیعردا هەرگیز "بوونم" نییە

سەید عەلی ساڵحی سەرەڕای نووسینی شیعر لە زەمینەگەلێکی ئەدەبی دیکەشدا وەك ڕەخنەی ئەدەبی و دووبارە نووسینەوەی دەقە کۆنەکان دەستبەکارە، بەم دواییە چەند کتێبێکی نوێی بڵاوبۆتەوە، ئەمەی خوارەوە دەقی گفتوگۆیەکی وەرگێڕاوە لەگەڵ ئەم شاعیرەدا.

***-زۆر لە دۆستان لە پڕکاری و چالاکی ئێوە سەریان سوڕ دەمێنێ، بۆ زۆربەیان جێی پرسیارە کە ئێوە تا ئەم تەمەنە چۆنچۆنی (137) کتێبتان بە چاپ گەیاندووە، ئەم کتێبانە لە چ بوارێکدابوون؟***



سەید عەلی ساڵحی

+137 کتێب بە ناوی منەوە بڵاوبۆتەوە بەڵام کتێبەکانی من بە پەنجەی دەست دەژمێردرێن، لە کۆمەڵە شیعری "عاشق شدن دردی ماه، مردن بە وقت شهریور" تا "اخرین عاشقانەهای ری را" تەنها حەوت کۆمەڵە شیعر و هیچی تر، هەرچی تر کە بە ناوی منەوەیە "ئەزمونی نان" بووە.

نموونەی دووبارە هێنانەکایەی "هەزارویەکشەو" کە زیاتر لە حەفتا بەرگە، بە چاپی حەوتەم گەیشت کە جێگای هەمان "سەرسامبوون"ە وەك ئاماژەت پێدا.

ئیمتیـازی ئیشـکردن بـۆ خـۆم نییـه، لەگـەڵ ئەوەشـدا مـن ئێسـتاکە تەنـها کـات بـە نووسـین دەبەمە سەر، بەم دواییـە بڵاوکەرەوەیـەکی بـەڕێز پێـی وتم گـەر خـەو و خەیاڵـەکانت نووسـی مـن چاپیان دەکەم.

ئەم چاکەیـە هـەروا هـەرزان و سـادە بەدەسـت نایـەت، بـەڵکو دەرئـەنجامی چـەند ڕێکـەوتنێکی پێویسـت بـووە، عەشـق و کـار، تەنانـەت لـە سـەردەمێکدا بەرهەمـەکانم بـۆ نـان دەنووسـی، دیسـانەوە عەشـق پـەیوەندی شـاراوەی منـی بـە ئەفراندن گەیاند بۆ ئیشکردن بۆ مناڵان کە هەستی من بە بوونی پاکی ئەوانەوە گرێ دراوە، بەڵام لە کۆتاییدا تەنها "شاعیرم"!

با لەسەری بڕۆم؛ بەر لە دە بەرگ کتێب لەناو فراوانکردنـی شـیعری تـردا بـووم، ئەمـەش بـە پـەیوەندی ئـەنجامی گرتـووە، بۆئـەوەی شـوێنی شیعر خاڵی نەبێ، وەڵامی ئەوە بەوە دەدەمەوە کە شوێنی بڵاوکراوەیەکی جدی بۆ شیعر بەتاڵە.

نزیکـەی *25* سـاڵ بـووم بـە شـێوەیەکی سیستەمییانە شەو و ڕۆژێك شەش سەعاتی تەواو کـارم دەکـرد، سـێ سـەعات خوێندنـەوە و سـێ سەعات نووسین، هەر کەسێك بەم شێوەیە کاربکات جێگـای (سەرسـامبوون) بـۆ خـۆی دەهێڵێتـەوە، خوێندنەوە و شیعرنووسین بۆتە داب و پەرستن بۆ من، شکستەکانم لە شوێنی تردا بەکاردەهێنا، کە ئەوە هەندێك جار ئـەبووە ڕیتمـی ئیشـکردنم. لـە لاوێتیمدا دایك و باوکم بۆ چاودێری بۆچوونەکانم چرا نەوتییەکانیان دەکوژانـدەوە، مـن شـەوانێکی زۆر لـەژێر ڕووناکی مانگدا دەمخوێندەوە، هـەموو جارێك چاویلکەیەکی بەهێزم بەکاردەهێنا کـە لـە ئەنجامدا بووە هـۆی کوێربوونـی چـاوی ڕاسـتم و مردنی ڕێچکەی دەماری بینینم.

دراوسێ سادە و هەژارەکانی ئێمە بە دایکمیان وتبوو ئـەو منداڵـە جنۆکـە دەسـتی لێوەشـاندووە لەژێر ڕووناکی مـانگدا تـا درەنـگ چ دەکـا، بـڕۆن دوعانووسێك بهێنن.

جارێکیـان بـە خوالێخۆشـبوو سـەید سـەفەرم گوت لە یەکێك لە شەوەکاندا فریشتەی پیرۆز هاتە لام و فـەرمووی بـە سـەید سـەفەر بڵـێ دیـواری بـەردینی ژیـانی لەسـەر منـاڵی منـی دروسـت کـردووە، بۆیـە منیـش ئـەوم نـەفرەت کـرد تـا بـۆ هەمیشـە بە هـەژاری بمێنێتـەوە. ئەوکاتـە لـە پـۆلی دووەمـی نـاوەندی بـووم، هـەموو خـەڵکی گـەڕەك نارەحـەت بوون کـە بۆچـی سـەید سـەفەر دیـواری حەوشـەکەی لەناو خەڵکدا بەرزکردۆتەوە دەعوا و شـەڕەکانی بێبەرهـەم بوو، سەید سـەفەر وتـی تـۆ درۆ ناکەی سبەی ڕۆژ دیواری نزمی بەردینی ئێمە دەڕوخێت و دوو مەتر دێتە دواوە، چەندین سـاڵ چاوەڕێ بوو تا لـە هـەژاری و ماندووبوون ڕزگـاری بێت، تەنانەت جارێکیان وتـی "توخمـی جن، ئـەی بۆچـی بەهرەمـەند نـەبوون!" منیـش وتم "مامـە سـەفەر یـەك ڕۆژی جنـەکان بەرامبـەر دە سـاڵی ئێمەیە، پێویستە ئارام بگری!" و دووبارە باوەڕی کـردەوە، ڕاسـتەوخۆ پڕکـاری ئـەمڕۆم ڕەنگـە ئـەنجامی دوعـای ئـەو جنۆکانـە بێـت، بەهـەرحاڵ دیوارەکەم نەکێشایەوە دواوە!

*-شـیعرەکانی ئێـوە لـەنێو لاوانـدا جێگـای ڕازیبوونـە، بـە بۆچوونـت پـەیوەندیی*

*خۆشەویستانەی ئێوە لەگەڵ لاواندا دەگەڕێتەوە بۆ چی؟*

+دەکرێ بگەڕێینەوە بۆ چەند وەڵامێکی زانستییانە؟ بۆ نموونە کرانەوەی ئەم بۆچیانە لە دیدی کۆمەڵناسییەوە و چی و چی تر..! بەڵام ڕاستیت بوێ خۆشم نازانم بۆ..! خۆشەویستییان (قەدەرێکە) و کۆتاییەکەی ڕاستییەکە "صداقەتە" و هیچی تر!

*-ئاگادار کراینەوە کە یەکێك لە کتێبەکانتان لە کوردستانی عێراق بە زمانی کوردی وەرگێڕاوە، ئایا هۆی سەرنج و ئاراستەکردنی کوردەکان بۆ لای شیعرەکانتان چییە؟*

+دەفتەری "خولیاکانی ئەو باویلکە غەمگینەی لە باشوورەوە هاتبوو*" لە سلێمانی چاپ کراوە، یەکەم جار لە گۆڤاری "سەردەم" لەژێر چاودێری "شێرکۆ بێکەس" دواتر هەواڵ هات کە بەسەربەخۆیش چاپ کراوەتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا کتێبی "نامەکان"** یش وەرگێڕاوەتە سەر کوردی و بڕیار وایە لە داهاتوودا سەردانی سلێمانی بکەم، ئەڕۆم و هەواڵی ئەم پەیوەندییە ڕووبەڕووە دەپرسم، ئەگەر وەڵامێکی عاشقانەم بیست، ئەوکات بەشی کۆتایی پرسیارەکەی ئێوە وەڵام دەدەمەوە.

*-شاعیر کاریگەری فەزا و ڕووداوە کۆمەڵایەتییەکانی لەسەرە؟ ئێوە تا چ ئەندازەیەك شیعرەکانتان بەشدارە لە کێشەو گرفتە کۆمەڵایەتییەکانی کۆمەڵگەکەتان؟*

لەم بارەوە بەرهەمی هەر هونەرمەندێك هیچ نەبێ لە لایەکەوە لە کێشەی ئینسانی و کۆمەڵایەتی دەکۆڵێتەوە "ئەم شتانە لەناو سیاقێکی مێژووییدا بوونیان هەیە، وەکو کەرەستەیە گەر ئەم شتانە لە بەردەست هونەرمەندا بن"

*-ئێوە تا چ ئەندازەیەك لە کاتی لەدایکبوونی بەرهەمێك یا نووسینی شیعرێك لە ئاشکراکردنی ڕووداو و ڕاستییەکانی دەوروبەر لە دیدگاتەوە، ئازادانە کاردەکەن؟*

+من تەنیا بۆ خۆم شیعر دەنووسم. هەرچی تایبەتیتر بێ، گشتیترە! پەیمان و چیرۆکی دەردە کۆمەڵایەتییەکان و دەرخستنی ڕاستییە کۆن و تازەکان پەیوەندی بە شیعرەوە نییە، شیعر ئەگەر شیعر بێ، بەسروشتی بوونی ڕەخنەیە و ڕەخنەشە لە بوون، گشت ئەو بوارانەی کە دیاریت کردوون بە شێوەیەکی داڕێژراون، شیعر و ڕۆمانا لەدایکبووی هەست و زاتی شاعیرن. کە شیعر لەدایکبوو، وشەی دژی بێدەنگی هاتە دنیاوە، وشەی یەکەمی فیزیکی شیعرە، وەك ئەوەی تۆ شاعیربی مانای تاوانی تەنیایی ئینسانی، مەگەر ئەتوانی لە سەرهەڵدانی ڕەخنە بەهەر شێوەیەك بێ دوور بکەویتەوە؟!

*-دەربارەی گەمەی زمانەوانی کە بە شێوەیەکی زۆرلێکردن لەنێو شاعیرە لاوەکاندا سەری هەڵداوە ڕاتان چییە؟*

+ڕاهێنانی ئازادی، لە هەڵەکردنەوەیە هەر ڕووداوێکی دیارییەك پێویستیە. ئێمە پێویستیمان بەم هەڵانە و بە تەجرووبە و بەم ڕووداوانە هەیە. هەموویان زۆر لەخۆکردن نین، زۆر لەخۆکردنیشمان هەیە، هەڵسووکەوتی نامۆ

لــــەدایکبووی داواکردنـــی (گەورەیـــــە)، ئـــــەم خۆشەویستانە بــە پەنجـەی دەسـت دەژمـێردرێن. منیش هەمان ئەم یاریانەم لـە لاوێتیـدا ئـەزموون کـردوون، دەبێـت بــە رێگاکــاندا تێپــەڕی لەوبــەر دەریاکاندا، شارێك هەیە!

*–ئایــا تــۆ ئاگــاداری شــیعری دەهـــەی 70 حەفتاکانی، لەنێو شاعیرانی ئەم دەیەیە کامیانت بەلاوە پەسەندە، بە بۆچوونی تۆ بیر لەوە چۆن دەکەیتـەوە کە بۆچی لە ئێراندا ژمارەی شاعیران هێندە زۆرە؟ ئایا هەمیشە بەم شێوەیە قەرەباڵغی شاعیرمان هەبووە؟ ئایا ژمارەی شاعیرانی ولاتانی تر بە هەمان شێوەیە؟*

+تۆپبارانەکەت زۆرە، ئـارام بگـرە، یـەك یـەك! شـــــیعری دەهـــــەی حــــــەفتا بــــــە هــــــەموو کەموکوڕیەکانییـەوە، خەونـەکانی هـەرزەکاری بـە ئاشـکرا تیـایدا بنبەسـت دەکـرێ. دابــڕان لـــە ســــێبەرەکانی ڕابـــــردوو و وازهێنــــــان لــــــە دەورەی تـەقلیدی و دووبارەکردنـەوە ڕووداوێکـی گەورەیە.

ساڵی *1370* لە میانەی وتارخوێندنەوە لە امل (شـارێکی ئێرانـە) لـە کۆبوونـەوەی (ئەنجوومـەنی ئـەدەبی نیمـا) وتم دەهـەی حـەفتاکان دەهــەی دەرکەوتنــە، کــە دیــارترین "ڕووەکــان"ی ئــەم دەرکەوتنـە تێکـڕا لــە دەهــەی هەشـتاکاندا بــە ئاراستەی ڕاسـتەوخۆ دەناسـرێن. درەوشـاوەترین چراکــانی لاوی ئێمــە پەیوەســتە بــە چــالاکی سیستمی شیعری و یادگارییە. لـە بـارەی بەشـی دووەمـی پرسـیارەکەتان! خۆزگـە دەتانپرسـی کـە لـەنێو شـاعیرانی ئـەم دەیەیـەدا زۆرتـر کامـەیان پەسەند ناکەی؟ ئەوکات گفتوگۆکە لێرەدا کۆتایی دەهات، لە بارەی ئەوەی بۆچی لە ئێراندا ژمارەی شاعیران هێنـدە زۆرە. نـەك "زیـاد"ە! پێـت دەڵێـم کەس ناڵێ چەند هەزار شاعیر، ئەوانـەی وا دەڵێن گاڵتە دەکەن. گەر بتانەوێ جەنگێکی شیعری بەرپا بکــەن و تازەکارەکــانیش بێکــار نەکــەن ناگەنــە سەدوپەنجا.

لە سەردەمی حافزدا چوارسەد شاعیری فارسی و حەفتاوسێ ئەنجوومەنی ئەدەبی لە بەغدادەوە تا ڕەی و تا سەمەرقەند و سەرحەداتی هند هـەبوون، ژمارەی شاعیرانی نەتەوەی عەرەب "عەرەب زمـان" یـا ئیسـپانی زمانـەکان لـە ئـەمریکای لاتـین زۆرن. ڕێـژەی دانیشـتووان و بەشداربووانی فەرهـەنگی و زمــان و داهێـنراوی تــر لــەم بــوون و نەبوونـــەدا دەستیان هەیە.

لە ئێران ڕێژەی شاعیران لەگەڵ هونەرمەندانی تر "نـەوەك ئـەهلی سـینەما" ڕێـژەی ئـەم زیادییـە کـەمی کـردووە، هۆکـاری ئـەم زیادییـە بێشـومارە لێکۆلینـەوەی جوانتر دەخوازێ، یـەکێك لـەو بەڵگـە دیارانـە خـودی زمـانی فارسـییە، زمــانی جوانــی فارسی ڕیشەی لـە ڕوحـی شیعردایە، سرووشـتییە ئاشـکراکردنی ئـەم ڕوحــە ئاسمانییــە، هێنـدەش قورس نییە!

*–ئێوە شیعرەکانتان کتوپڕ دەڵێن، بە هۆی هەستەوەیە کە لقوپۆپی گەلاکان پەروەردە دەکەی یا لە بنەڕەتدا شـیعر بـۆ ئێـوە لـە ئەندێشـەوە ئـاودەخوات، ئایا لـە کـاتی شیعرنووسـیندا یـەك تاکی کۆمەڵی یا یەك کۆمەڵگەیت.. یا یەك تاکی لە واقعی زەینی و ژیانی خۆت؟*

+هەر ئاوازێکی عاشقانە کە ناوی منی تێدابێ، لە هەوڵی پرسینی خاوەنی ئاوازەکەدا نیم، بۆ پێشوازی دەڕۆم، بەخێرهاتنی لێ دەکەم، دواجار شیعریش یەکێکە لە ئاوازە بەهەشتییەکان و هەرچی بتەوێ لە شیعردایە، لە (شیری پەرەسێلکە وە تا پێکەنینی ئاسك)، پاشماوەی وتەکان شوێنی خۆیان هەیە، لە بارەی بەشی دووەمی پرسیارەکەتان پێتان دەڵێم لە کاتی شیعرنووسیندا لە ڕاستیدا "بوونم" نییە، لە ڕاستیدا چرکەی شیعرنووسین غەریبە، پەیوەندی بە جیهانی ترەوەیە، هەم یەکێکە و هەم بێشومار، هەم خود و هەم ناخود، ڕۆیشتنی بێ گەڕانەوەیە.

*–کاری داهاتووتان چییە؟*

+دوانزە ناوم هەڵبژاردووە کە سیانیان لەم کۆمەڵە لە دەرەوەی ئێرانن، لە داهاتوودا دەفتەرێك لە شیعرەکانی ئەم کۆمەڵە بە شێوەیەکی هاوبەش بڵاودەکەمەوە، سەرئەنجام بۆ بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانی ئەم خۆشەویستانە بنکەیەکی بڵاوکردنەوە دەخەمە کار، لە بارەی چۆنێتی پشتگیری لە نەوەی تازە، بە خێرایی پێتان دەڵێم دەبێ پشتگیریی بکرێن.

## سەرچاوە

ایران جوان ژمارە *117*

*دەفتەری خولیاکانی ئەو باویلکە غەمگینە لە باشوورەوە هاتبوو

وەرگێڕانی بۆ کوردی: محەمەد ئەحمەدی

سەردەم ژمارە (*2*)ی نیسانی *1999*

**کتێبی "نامەکان"

وەرگێڕانی بۆ کوردی: شهاب الدين شێخی"یە.



# لە نێوان "بلیمەتی" و "شێتی"دا

خستنەڕووی: مەم بورهان قانع
ناوی کتێب: لە نێوان بلیمەتی و شێتیدا
زنجیرە: "23"ی کتێبی گیرفان
ناوی نووسەر: د. هاشم ساڵح
ناوی وەرگێڕ: نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد

"دەترسم بمخەنە خانەی ئاقڵانەوە (مەبەست نەخۆشخانەی ئەقڵییە)،
لە کاتێکدا خەڵکی لە دەرەوە هەموویان شێتن"

جیرار دونێرڤاڵ



یەکەمین وتاری کتێبی "لە نێوان بلیمەتی و شێتی"دا، بە هەمان ناوەوەیە، واتا وتاری یەکەمی ئەم کتێبی گیرفانە دەربارەی بلیمەتی و شێتییە، کە نووسەر لەم وتارەدا هەوڵی داوە باس لە پەیوەندیی بلیمەتی بکا بە شێتییەوە و ئەو گوتارەمان ئاراستە بکا کە چیتر ناکرێ وا لە بلیمەت بڕوانین کەسێکی جیاوازە و لە هەسارەیەکی ترەوە دابەزیوەتە سەر گۆی زەوی..

لەم وتارەدا، ڕۆشنبیر و نووسەری ناسراوی سووری د. هاشم ساڵح، مێژووی کارکردن و دواجار پەیوەندیی بلیمەتان دەخاتە ڕوو؛ لەوەی دواجار هەندێکیان شێت بوون و لە

نەخۆشخانەی ئەقڵیدا کۆچی دواییان کردووە کە یەکێك لەو بلیمەتانە مۆپاسانە..

یەکێك لەو جیاوازییانەی نووسەر لەم وتارەدا سەبارەت بە بلیمەت و شێت دەیخاتەڕوو، ئەوەیە: بلیمەت هەروەکو شێت، ئارەزووی لە پەراوێزی و یاخیبوون و ملنەدانە بۆ دابونەریتە باوەکان و ملکەچنەکردن بۆیان، بەڵام تاکە جیاوازی کە لەم بارەیەوە لە نێوان بلیمەت و شێتدا هەیە، ئەوەیە شێت هەر لە خۆڕاو بەبێ هۆشیاریی و بە ناشیرینی داب و نەریتەکان پێشێل دەکا؛ ئەمە سەرباری ئەوەی بلیمەت نەریتگەلی خۆی هەیە و ئیلتیزامیان پێوە دەکا و دەبێتە بەشێك لە ژیانی..

هەر لەم وتارەدا، نووسەر پێی وایە بلیمەت کەسێکی ئاسایی و سرووشتی نییە و لە میانەی خوێندنەوەی بیۆگرافیای بلیمەتاندا دەرکەوتووە زۆربەریان منداڵ ناخەنەوە و کاتی خۆیان بۆ پەروەردەکردنی خێزانەکانیان تەرخان ناکەن، جگەرگۆشەی ئەوان (واتا بلیمەتان) بەرهەمەکانیانە و دەیپارێزن، هەروەك چۆن کەسێکی ئاسایی منداڵەکانی خۆی دەپارێزێ.

لەم بارەیەوە و دەربارەی ئەوەی بلیمەتان منداڵ ناخەنەوە و زیاتر بایەخ بە بەرهەمەکانیان دەدەن، نووسەر ناوی چەند بلیمەتێکی بواری فیکر و فەلسەفەمان بۆ ڕیزبەند دەکا کە ژنیان نەهێناوە، کە ئەوانیش ئەمانەن: ڕینێ دیکارت، کانت، سپینۆزا، نیچە، سارتەر و میشێل فۆکۆ و چەندینی تر.. ئەمە سەرباری ئەوەی نووسەر هەر لەم وتارەیدا جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە کە هەموو بلیمەتێك شێت نییە، هەروەك چۆن هەموو شێتێکیش بلیمەت نییە. بەڵام لێرەدا هاشم ساڵح پەیوەندییەکی بەتین لە نێوان شێتبوون و بلیمەتیدا دەبینێ؛ لەوانە ئاماژە بە شێتبوونی فەیلەسووفی گەورەی ئەڵمانی "نیچە" دەکا کە لە دوایین دەساڵی تەمەنیدا بە تەواوی شێت بووە، یان کچە ڕۆماننووسێکی گەورەی وەك "ڤێرجینیا وۆڵف" کە بە ڕەچەڵەك بەریتانیە و بە هۆی تووشبوونی بە نائارامی و شڵەژانی دەروونی سێ جار هەوڵی خۆکوشتنی داوە و لە سێیەمین هەوڵیدا کە بەرد لە قاچەکانی دەبەستێ و خۆی فڕێ دەداتە دەریاوە، دەمرێ. یاخود ڕۆماننووسێکی گەورەی وەك "دیستۆیفسکی" کە پەرکەمی لەگەڵدا بووە، یاخود کەسانی بلیمەتی وەکو ئانتۆنین ئارتۆی تیۆریستی شانۆی توندوتیژی، میشێل فۆکۆ، نیچە، بۆدلێر، شۆمان، لۆتریامۆن کە لەگەڵ بلیمەتی و داهێنانە گەورەکانیاندا لە بواری ڕۆشنبیری و فەلسەفە و هونەردا، بەشێك لە شێتیان تێدا بووە، یاخود فەیلەسووفی گەورەی فەڕەنسی وەك "ئۆگست کۆنت" کە دامەزرێنەری فەلسەفەی پۆزەتیڤیزمە، زیاد لە جارێك گەیشتووەتە کەناری شێتبوون و چەند جارێك خۆی هاویشتووەتە ڕووباری "سینو" و هەوڵی خۆکوشتنی داوە.. سەرباری خستنەڕووی ئەم حاڵەتانە، نووسەر سەبارەت بە "ئۆگست کۆنت" ئەو پرسیارە دەکا کە کەس لەو باوەڕەدا نییە دامەزرێنەری پۆزەتیڤیزم، کە بە لوتکەی ئەقڵانییەت لە خۆرئاوا دادەنرێ، دووچاری شێتی یان ڕووخانی دەروونی بووبێ..

هەر لەم وتارەدا، هاشم ساڵح ناوی چەندین ڕۆشنبیر و فەیلەسووف و بیریار ڕیزبەند دەکا کە دووچاری شێتبوون

هاتوون، ئەمە سەرباری ئەوەی نووسەر دەگەڕێتەوە بۆ ئەو پەندەی کە لەسەر بیرۆکەیەکی فەیلەسووفی گەورەی یۆنان (ئەرستۆ) داڕێژراوە کە تیایدا هاتووە: "کەسایەتیی مەزن، بەبێ هەندێ لە شێتی بوونی نییە".

هەر لەم بارەیەوە و بۆ سەلماندنی ڕاستی قسەکانی، کە پەیوەندییەکی دانەبڕاو و بەهێز لە نێوان شێتیبوون و بلیمەتیدا هەیە، هاشم ساڵح دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی هەژدەیەم، واتا سەدەی ڕۆشنگەری و ئاماژە بە بیری "دیارۆ" دەدات کە ئەو بیرەی گەڵاڵە کردبوو، گوایە: پەیوەندییەکی بەتین لە نێوان بلیمەتی و شێتیدا هەیە و هەردووکیان خەسڵەتگەلێکی نائاساییان هەیە، یان بە ئاڕاستەی چاکەدا دەڕۆن، یاخود بە ئاڕاستەی خراپەدا. شێت لە نەخۆشخانەی ئەقڵیدا بەند دەکرێ و بلیمەتیش پەیکەری بۆ دروست دەکرێ..

یەکێك لەو بلیمەتانەی لە بواری شیعری فەرەنسیدا دەرکەوتووە، ڕامبۆی شاعیرە، کە لێرەدا هاشم ساڵح بە جۆرێك باسی لێ دەکا، ئەم شاعیرە گەورەیە کە هەموو شیعرەکانی لە ماوەی چوار ساڵدا نووسیووە، واتا لە تەمەنی شانزە ساڵییەوە تاوەکو نۆزدە ساڵی، گوایە ڕامبۆ لە ساتەوەختی ئازارچەشتن و خراپبوونی باری دەروونیدا، دەبووە کەسێکی سۆفی، وەك کانییەکی بزر لە زەوییەکی وشکەڵاندا دەتەقییەوە.

هەر لەم وتارەدا، کە بۆ یەکەمین جار نووسەر لە گۆڤاری "نزوی"ی ژمارە "*20*"ی ساڵی *2001*دا بڵاوی کردووەتەوە و *56* لاپەڕەی ئەم کتێبی گیرفانەی گرتووەتەوە، هاشم ساڵح باس لە چەندین بلیمەتی وەکو: شۆپنهاور، بەلزاك، گۆستاف فلۆبێر، ڤۆڵتێر و کافکا دەکا کە لە ژیانیاندا چەندین کاری سەیروسەمەرەیان کردووە، کە کاری کەسانی نائاساییێ، بۆ نموونە شانۆنووس و ڕۆماننووسێکی گەورەی وەك "فرانز کافکا" بێجگە لەوەی هەمیشە لە بارودۆخێکی نائارامی دەروونیدا ژیاوە، بەردەوام بە بەفراو خۆی شتووە!

هەر لەم وتارەدا، هاشم ساڵح دەگاتە ئەو ئەنجامەی کە "پێویستە ئەو وێنە ئایدیالی و ئەفسانەییە لە بارەی بلیمەتەوە لە زەینی خۆمان دەربهێنین، بلیمەتیش کەسێکی ئاساییە و بگرە هەندێ جار لە کەسێکی ئاساییش کەمترە و لە هەندێ ڕەفتار و هەڵسوکەوتیدا زۆر هیچوپوچە. دەشێت ئامانجی هەمیشەیی بلیمەت ئەوە بێت وەکو هەموو خەڵکی تر کەسێکی ئاسایی بێت، جا لەبەرئەوەی ناتوانێت بگاتە ئەو ئاستە، ئیدی پەنا دەباتە بەر خوڵقاندن و داهێنان بۆ پاراستنی هاوسەنگی خۆی".

یەکێکی تر لەو جیاوازییانەی هاشم ساڵح لەم وتارەیدا سەبارەت بە بلیمەتی و شێتی دەیخاتەڕوو، ئەوەیە: "قەیرانی بلیمەت لە ڕێگای داهێنانەوە ئاوا دەبێ، کەچی قەیرانی شێت بەرەو وڕێنەیەکی بەتاڵ و کاری ناچیزە و ناشایستەی دەبا". هەر لەم بارەیەوە نووسەر پێی وایە: "ئەگەر داهێنانێکی گەورە نەبووایە، ئەوا بە مسۆگەریی بلیمەت دەبوو بە کەسێکی شێت".

ئەوەی لێرەدا و سەبارەت بە ئەم وتارەی هاشم ساڵح جێگای لەسەر وەستانە، ئەوەیە کە هەندێك جار نووسەر بلیمەت بە کەسێکی ئاسایی ناودەباو هەندێ جار بە کەمتر لە کەسێکی ئاسایی

و جارێکی تریش بە کەسێکی شێت و دواتریش پێی وایە گەر داهێنان نەبووایە (ئینجا بلیمەت بەبێ داهێنان کەی بلیمەتە؟) بە مسۆگەریی بلیمەت دەبوو بە کەسێکی شێت. واتا هاشم ساڵح کە لە ساڵی *1981*دا لە زانکۆی سۆربۆن دکتۆرای وەرگرتووە و ڕۆشنبیرێکی ناسراوی عەرەبە، لەم وتارەدا سەرباری ئەوەی زانیاری وردی دەربارەی ژیانی بلیمەتان خستووەتە ڕوو، بەڵام لە پەرەگرافێك بۆ پەرەگرافێکی تری ئەم وتارەی، ئەگەر بە وردی دیقەت بدەین هەست بە بوونی ڕای جیاواز دەکەین؛ سەبارەت بە بلیمەتی و شێتی، ئەمە لە کاتێکدایە نووسەر لە کۆتایی ئەو وتارەیدا ئاماژە بەوە دەکا کە "دەبەنگی و نەزانینە گەر پێمان وابێ دەتوانین نهێنی بلیمەتی کەشف بکەین، بلیمەتی؛ نهێنی نهێنییەکانە و لە هەموو ڕاڤەکردنێك دەردەچێ". نابێ ئەوەیش فەرامۆش بکرێ کە هاشم ساڵح لە نووسینی ئەم وتارەیدا ئاماژە بە ئامارێك دەکا کە تیایدا ئەوە دەرخراوە بە دەگمەن بلیمەتێك خاڵی دەبێ لە نیشانەکانی شێتبوون و شڵەژانی ئەقڵی، هەر بۆیە بە گاڵتە نییە دەروونناسێکی وەك "سیگمۆند فرۆید" دەڵێ: "داهێنان بریتییە لە قەرەبووکردنەوەی ناتەواوییەك یان کەموکورتییەك لە کەسێتیدا" ئەمە سەرباری ئەوەی جان پۆڵ سارتەری فەیلەسووف و ڕۆماننوس و شانۆنووس دانی بەوەدا ناوە تەنها لە ڕێگای نووسینەوە لە عوساب ڕزگاری بووە.

* * *

یەکێکی تر لە وتارەکانی ناو ئەم کتێبی گیرفانە، کە بەر لە چەند هەفتەیەك و لەلایەن دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم بە چاپ گەیەندرا، وتارێکە بە ناوی "ڕۆڵی ئافرەت لە ژیانی بلیمەتاندا".

لەم وتارەدا، نووسەر ئاماژە بەوە دەکا بلیمەتان بە گشتی دوو هەڵوێستی جیاوازیان لە بەرامبەر ئافرەتدا هەیە، کە ئەوانیش دژ بە یەکن و یان ئەوەتا بایەخێکی زۆری پێ دەدەن، یاخود بە تەواوی فەرامۆشی دەکەن، واتا بلیمەتان هەڵوێستێکی پەرگیریان هەیە کە جیایە لە کەسانی ئاسایی.

سەبارەت بە ژیانی ئاسایی بلیمەتانیش، هاشم ساڵح لەم وتارەدا ئاماژە بە فەیلەسووفی ئەڵمانی "کانت" دەکا کە جارێکیان ئافرەتێکی مارە کردووە و پاشان سەرقاڵی نووسینی یەکێ لە گرنگترین کتێبەکانی بووە و دەزگیرانەکەی بیرچووەتەوە، کاتێکیش بیری دەکەوێتەوە و دەیەوێ بگەڕێتەوە بۆ لای دەزگیرانەکەی، دەبینێ ماوەیەکی زۆرە شووی بە یەکێکی تر کردووە و چەند منداڵێکی هەیە!

هەر لەم وتارەدا، نووسەر باس لە چەندین بلیمەتی وەك سارتەر (هەرچەندە ژنی نەهێناوە بەڵام خۆشەویستی کردووە)، ئەراگۆن و سلڤادۆر دالی دەکا کە ئافرەت چ ڕۆڵێکی بینیووە لە ژیان و داهێنانەکانیاندا.

* * *

وتاری "چۆنیەتی گونجاندنی نێوان فەلسەفە و ئیمان" سێیەم وتاری ئەم کتێبی گیرفانەیە؛ کە تیایدا نووسەر دەگەڕێتەوە بۆ یەکێك لە فەیلەسووفە دیارەکانی ئەڵمانیا کە ئەویش "کارل یاسپێرز"ە و ساڵی *1969* کۆچی دوایی کردووە.

لەم وتارەدا، کە تیایدا هاشم ساڵح بۆ ئەم فەیلەسووفە وجودییە باوەڕهێنەرە دەگەڕێتەوە کە لە فەلسەفەکەیدا ئەقڵ و ئیمان پێکەوە گرێ دەدا،

نووسەر باس لە چەمکی "ڕۆشنگەری" لە دیدی یاسپێرزەوە دەکا، کە وتوویەتی: "ڕۆشنگەری ڕاست و دروست بریتییە لەو تێگەیشتنەی پێشوەخت هیچ سنوورێك لە دەرەوە بۆ ئەقڵ دانانێ و پێویستە ئەقڵ ئازاد و ڕەها بێت، سنوور و كۆتی بەسەردا نەسەپێنرێ. تێگەیشتنی ڕاستەقینەی ڕۆشنگەری تەنها بە هەڵوەشاندنەوەی فیكرە دەمارگیرەكان و خورافە و ئەفسانەكان واز ناهێنێ، بەڵكو خۆیشی دەخاتە شوێنی گومان و ڕەخنەوە، بەو پێیەی ئەقڵی ڕۆشنگەری لە هەڵە و كەموكورتی خاڵی نییە". ئەو ئیعترافەی یاسپێرز كە سەبارەت بە ئەقڵی ڕۆشنگەری دەری دەبڕێ بەوەی ئەقڵێكە لە هەڵەو كەموكورتی خاڵی نییە، لەم وتارەدا وا لە هاشم ساڵح دەكا كە ڕای بگەیەنێ بەوەی ئەگەر بەوجۆرەی "كارل یاسپێرز" لە ڕۆشنگەری تێبگەین، ئەوسا تێشدەگەین ڕۆشنگەری ئیمان لەناو نابات بە مانای جەوهەری و ناوەكی و ئازادی و وشەی ئیمان، بە پێچەوانەوە ڕۆشنگەری دەبێتە مایەی فراوانكردنی ئیمان، هەرچەندە زانیاری مرۆڤ فراوانتربێ، پتر دەتوانێ ئیمان ڕۆشن بكاتەوە.

* * *

دوایین وتاری ناو ئەم كتێبە تایبەتە بە "هیگڵ و ڕۆشنگەری كە تیایدا نووسەر باس لە چەمكی ڕۆشنگەری دەكا لە ڕوانگەی ئەم فەیلەسووفە گەورەیەوە؛ كە هەر لەم بارەیەشەوە دەگەڕێتەوە بۆ دید و بۆچوونی چەند فەیلەسووفێكی تر كە سەبارەت بە ڕۆشنگەری خستوویاننەتە ڕوو؛ كە یەكێك لەوانە فەیلەسووفی ئەڵمانی "فیختە"یە كە لەسەر بۆچوونەكانی لە زانكۆ دەركراوە. لەم وتارەدا، د. هاشم ساڵح جیاكاری دەكا لە نێوان بۆچوونی هیگڵ و فیختە سەبارەت بە ڕۆشنگەری و پێی وایە: بانگەشە ئاشكراكانی فیختە سەبارەت بە ڕۆشنگەری بۆ ئەو سەردەمە پێش ڕای گشتی كەوتبوو، بەڵام گوتەیەكی شەرمنانە بوو لە چاو ئەو بابەتانەی لە هەمان ساتەوەختدا هیگڵ لە سویسرادا بە نهێنی دەینووسین.

* * *

ئەم كتێبە كە چوار وتاری د. هاشم ساڵح-ی لەخۆ گرتووە، وتارەكان لە كات و شوێنی جیادا نووسراون و لەلایەن كاك نەوزاد ئەحمەد ئەسوەد كۆكراونەتەوە و بە زمانێكی كوردی ڕەوان كراونەتە كوردی كە شایەنی دەستخۆشی كردنە، ئەمە سەرباری ئەوەی پرۆژەی كتێبی گیرفانیش خزمەتێكی ترە بە كتێبخانەی كوردی.

# قەیرانە ترسناکەکەی جیهانی ئیسلام

ناوی کتێب: قەیرانە ترسناکەکەی جیهانی ئیسلامی
نووسینی: عەبدولوەهاب ئەلموئەدەب
خوێندنەوەی: هاشم ساڵح
لە عەرەبییەوە: هەورامان وریا قانیع

"عبدولوەهاب ئەلموئەدەب" لەو کتێبەیدا کە پێش چەند هەفتەیەك لە پاریس دەرچووە، هەوڵدەدا دەستنیشانی ئەو نەخۆشییە درێژخایەنە بکات کە لە ئێستادا بەدەستییەوە دەناڵێنین و بەم دوایانە بوو هۆی ڕودانی تەقینەوەکەی *11ی* سێپتێمبەری *2001*.

دانەری ناوبراو شاعیر و نووسەرێکی تونسییە و بەفەرەنسی دەنووسێ و ساڵانێکی زۆرە لە فەرەنسا دادەنیشێت. ئەو مامۆستای ئەدەبی بەراوردکارییە لە زانکۆی دەیەمی پاریس (نانتیر)، هەروەها سەرنووسەری گۆڤارێکی دووەلییە بە ناوی (دیدال) ئەمە لە زمانی فەرەنسیدا مانای (وێڵگە–متاهة) دەگەیەنێت. لەگەڵ ئەوەشدا لە ڕادیۆی فەرەنسای ڕۆشنبیری سەرپەرشتی بەرنامەیەك دەکات بە ناونیشانی (ڕۆشنبیرییەکانی ئیسلام–ثقافات الاسلام).

دوای ڕووداوەکانی *11*سێپتیمبەر پێدەچێت ئەویش وەك زۆربەی زۆری ڕۆشنبیرانی عەرەب، ئەوانەی لە دەرەوە دادەنیشن، بگرە وەك زۆربەی ڕۆڵەی جالییە عەرەبی و ئیسلامییەکان، هەستی بە جۆرێك لە توڕەبوون و خەفەت کردبێت، لەبەر ئەوە دەستی دایە قەڵەم و کەوتە گوزارشتکردن لە هەست و هەڵچونەکانی بەرامبەر بە ڕووداوێکی گەورەی لەم جۆرە. ئەو چ وەك عەرەبێك و چ وەك موسڵمانێك هەستدەکات ئەم ڕووداوە بە پلەی یەکەم ئەمیش دەگرێتەوە، چونکە ڕوانینەکان تەرکیزیان دەکردە سەری و وەك ئەوەی لێیبپرسن: بۆچی واتانلێکردین؟ بەڕاستی ئێوە کێن؟ ئایا ئاینەکەتان ڕێگا بەم جۆرە کارانە دەدات؟ بێگومان مەبەستم لەمە ڕوانینی فەرەنیسییەکانە یان بە شێوەیەکی گشتی ڕوانینی ڕۆژئاواییەکان.

لەبەر ئەوەی "عبدولوەهاب ئەلموئەدەب" شانازی بە ڕەگەزە عەرەبی و ئیسلامییەکەیەوە دەکات و، کەلەپورەکەی خۆشدەوێ، بەتایبەتی لایەنە ڕۆحی و سۆفی و شیعرییەکەی، بۆیە نەیتوانی تووڕەبوون و هەڵچوونەکانی خەفە بکات، لەبەر ئەوە ئەم کتێبە هاتە ئاراوە. ئەمە کتێبێکە لە قووڵایی ناخەوە هاتووەتە دەر و خوێنەر هەست بەو زمانە ڕاستگۆیەی ناوی دەکات و هەست بەو ئیرەییە زۆرە دەکات کە ئەم نووسەرە هەیەتی بۆ بەرژەوەندی ئیسلامی و عەرەبی. لەبەر ئەم هۆیە "ئەلموئەدەب" موجامەلەی ڕۆڵەکانی نەتەوەکەی ناکات، بەڵکو هەر لە لاپەڕەی یەکەمەوە ڕاستییە تاڵەکانیان بۆ دەردەخات و بە پیتی گەورە دەڵێ:

(ئەو تەقینەوە گەورانەی کە لە *11*سێپتێمبەردا ڕوویاندا و ئەمریکای لە ناخەوە هەژاند تاوانە، ئەمە تاوانێکە ڕیشەخوازە توندڕەوەکان پێیهەستان، بەڵام پێویستە تاوانی *11* سێپتێمبەر لەو تاوانانەی دیکە جیانەکەینەوە کە پێشتر ڕوویانداوە و بونەتە هۆی لە دەستدانی *150*هەزار کوژراو، بۆنموونە لە جەزائیر، یان تیرۆرکردنی دەیان ڕۆشنبیر و خەڵکی سادە لە میسر و سودان و ئێران و ئەفغانستان وپاکستان..هتد)

تایبەتمەندی دانەر لەوەدایە بەوەوە ناوەستێت کە چارەسەری دیاردەی توندڕەوی لە میانەی زەمەنی کورت و ئەو ڕووداوانەی لە ئێستادا ڕوودەدەن بکات، وەك ئەوەی زۆرێك لە ڕۆژنامەنووسان دەیکەن. بەڵکو ئەو دەیکاتە بابەتێك لە چوارچێوەی تەماشاکردنێکی درێژ و زەمەنێکی دوور کە بەلای کەمەوە نزیکەی هەزار ساڵ دەگەڕێتەوە بۆ دواوە! ئائەمەیە چارەسەری بنەڕەتی بۆ دیاردەی ڕیشەخوازی (الاصولیة). بۆ ئەوەی بەباشی لە دیاردەی ڕیشەخوازی بگەین، پێویستە بگەڕێینەوە بۆ ڕەگە قووڵەکانی کە ڕۆچونەتە ناو خودی ڕابردووی عەرەبی و ئیسلامیمان.

لە قسەکانی "عبدولوەهاب ئەلموئەدەب" تێدەگەین کەوا دەقە ئاینییە پیرۆزەکان لە ئیسلام و غەیری ئیسلامیشدا دەکرێ بە دوولادا بخوێنرێنەوە، گەر دەقەکانمان وەك خۆی وەرگرت ئەوا دەکرێ ئایەتی تێدابدۆزینەوە کە بانگەشە بۆ توندوتیژی دەکات و، دەکرێ ئایەتیشی تێدا بدۆزینەوە کە بانگەشە بۆ لێخۆشبون و بەزەیی و لێبوردەن دەکات. ئەمەی دووەمیان لە قورئانی پیرۆزدا لەوەی یەکەمیان زیاترە، بە پێچەوانەی ئەوەی کە نەزانەکان لە ڕۆژئاوادا مەزەنەی دەکەن. ئاشکرایە بزاوتە ڕیشەخوازە توندڕەوەکان تەنها ئیش بە ئایەتەکانی یەکەم دەکەن و تەنهاپێ لەسەر ئەوان دادەگرن، بۆ هێنانەوەی پاساو بۆ تەقینەوە تیرۆریستیەکان کە لەژێر ناوی جیهاددا پێیهەڵدەسن.

ئەمە مانای ئەوەیە خوێندنەوەی دۆگمایانە بۆ دەقە ئاینییەکان شیاوە، وەك چۆن خوێندنەوەیەکی کراوە یان خوێندنەوەیەکی بەرپرسیارانەش شیاوە. بەڵام تەنانەت ئەو ئایەتانەی کە بە ڕووکەشی مەشروعیەت دەبەخشن بە پرۆژەی ڕیشەخوازەکان، دەکرێ بە ڕێگایەکی دیکە بخوێنرێنەوە بۆ دەرهێنانی بەرە لە ژێر پێی خودی ڕیشەخوازەکان. چۆن؟

لەڕێگەی پەنا بردنە بەر گەورە توێژەرانی کلاسیك، ئەوانەی زۆر عەقلانیترن و زیاتر هەست بە لێپرسینەوە دەکەن لە نەزانە

ڕیشەخوازەکانی ئەمڕۆ. هەروەها دەتوانین لە بەر ڕۆشنایی عەقڵیەتی مۆدێرن بیانخوێنینەوە، عەقڵیەتێك دەزانێ چۆن شتەکان لە یەکدی جیابکاتەوە و چۆن ناوەرۆکی توندوتیژی ئەوئایەتانە والێبکات بەشێوەیەکی ڕێژەیی بن، ئەویش لە ڕێگەی بەستەنەوەی ئایەتەکان بە سیاقە زەمەنی و مێژووییەکەیەوە. ئەوەی بەسەر سەرەتاکانی ئیسلامدا لە باردودۆخێکی دیاریکراودا پەیڕەو دەکرا، مەرج نییە بەسەر ئەم بارودۆخەی ئێستادا پەیڕەو بکرێت کە بارودۆخێکی تەواو جیاوازە.

لێرەوە ڕیشەخوازەکان بۆ خزمەتکردنی ئایدۆلۆژیا شەڕانگێزەکەیان بە ئارەزووی خۆیان یاری بە ئایەتەکان دەکەن، ئەمە لە کاتێکدا گەورە توێژەرانی کلاسیك و هەروەها زانا ئاینییە گەورەکان بە هۆشدارییەکی زۆرەوە مامەڵەیان لەگەڵ ئەوئایەتانەدا دەکرد کە پەیوەندیان بە مەسەلە حەساسەکانی وەك تەکفیر یا بانگەشەی جیهاد یاخود پاساو هێنانەوە بۆ توندوتیژی و تیرۆر، هەیە. هەر لە خۆیانەوە و بە هەوەسی خۆیان قسەیان نەدەکرد وەك ئەوەی زانا ئاینییە تاریکگەراکانی ئەمڕۆ دەیکەن.

بەڵام لە مێژووی ئیسلامدا جگە لە ڕەوتی عەقڵانی یاخود ڕەوتی ڕۆحانی سۆفی، هەموو کاتێ ڕەوتی دەمارگیر و توندڕەو ئامادەییان هەبووە، کە بە درێژای مێژوو زیاد لە جارێك بوونەتە هۆی خولقاندنی کارەسات و کوشتوبڕی گەورە، هەروەها زیاد لە جارێك بە مەبەستی خنکاندن دەستیان خستۆتە بینی ئازادی بیروڕا.

لێرەوە ناکرێ ئیسلام وەك گشتێك بە دەمارگیر تاوانبار بکرێت، وەك ئەوەی ناحەزان و دوژمنان دەیکەن، بەڵکو دەکرێ تەنها ڕەوتێك لە ڕەوتەکانی تاونبار بکرێت. بۆنموونە پەیوەندی "ئیبن عەرەبی" یان "ئیبن ڕوشد" بە دەمارگیرییەوە چییە؟ بەڵام دەمارگیری لە ئەوروپاشدا هەبووە، ئەو کاتەی کەمەسیحیەت دەستی بەسەر ئەورووپادا گرتبوو، بەتایبەتی لە مەزهەبە کاسۆلیکییەکەیدا.

لێرەدا "عبدولوەهاب ئەلموئەدەب" " ڤۆڵتێر" و هەڵوێستە توندەکەی بەرامبەر ڕیشەخوازانی کاسۆلیك بە نموونە دەهێنێتەوە، ئەو ڕیشەخوازانەی سالی *1572* قەسبخانە بەناوبانگەکەی (سانت بارتیلیمی)یان دەرهەق بە ڕۆڵەی نیشتیمانەکەیان – پرۆستانتەکان– ئەنجامدا، واتە لە کۆتاییسەدەی شازدەدا. پاشان کوشتارگا مەزهەبییەکان یان کوشتارگا تایفییەکان لە فەرەنسادا بە درێژای دوو سەدە بەردەوام بوو! واتە هەتا کۆتاییەکانی سەدەی هەژدە، لە دوای ئەوە ڕۆشنکردنەوەی عەقڵییەتەکان هاتە ئاراوە و دەمارگیری زۆر بەرەودوا گەڕایەوە، تاویلێهات بە تەواوەتی لە وڵاتانی ئەورووپای پێشکەوتودا نەماوله بەرچاو ونبوو.

بەڵام لەبەر ئەوەی ڕۆشنگەری فیکری تا ئێستا لە جیهانی ئیسلامیدا ڕووینەداوە، ئەوا تێگەیشتنی دۆگما بۆ ئاین هەر باڵادەستە و، فەتوا هەڕەمەکیەکان یان فەتوا ئاژاوەگێڕییەکان لە هەموو لایەکەوە بەسەرماندا دەبارێن، هەرشێخێکی بچووك یان گەورە دەتوانێ فەتوایەك دەربکات و تێیدا فەرمان بدا بە کوشتنی ئەم یان بە حەڵاڵ کردنی خوێنی ئەو، یاخود بە کافرداناانی کەسی سێیەم..هتد. ئەم بارودۆخەش

زۆرترسناك بووە و هەڕەشە لە پێکەوە ژیانی ئاشتیانەی کۆمەڵایەتی دەکات، نەك تەنیالە جیهانی عەرەبی و ئیسلامیدا بەڵکو لە هەموو جیهاندا. نا بگرە دەمانگێڕێتەوە بۆ دادگاکانی پشکنین کە ئەوروپا بەلای کەمەوە نزیکەی *200*ساڵە تێیپەڕاندووە و لێی دوورکەوتوەتەوە.

پاشان "عبدولوەهاب ئەلموئەدەب" هەوڵدەدا هۆکاری ئەم بارودۆخە فیکری و کۆمەڵایەتییە کلۆڵەی کە پێی گەیشتووین، تێبگات. ئەو وایدەبینێت کۆمەڵێ هۆکاری ناوخۆیی و هۆکاری دەرەکی هەیە، کە بوونەتە هۆی ئەوەی دەمارگیری بڵاوببێتەوە و بارودۆخەکە تێکبچێت. لە پاشان دەستدەکات بە لێکدانەوەی هۆکارە ناوخۆییەکان، چونکە ئەونایەوێت لە بەرپرسیارییەتی ڕابکات، وەك ئەوەی زۆرێك لە ڕۆشنبیرانی عەرەب دەیکەن. ئەو پێش ئەوەی ئەوانی دیکە تاوانباربکات و بەرپرسیارییەتی ئەوەی لە ئێستادا ڕوودەدات بخاتە سەر شانیان، دەیەوێ یەکەم جار پێشدەرگای ماڵی خۆی پاك بکاتەوە. ئەمەش هەڵوێستێکی باش و بەرپرسانەیە بۆ بیرمەندێکی عەرەبی کە خەریکی ڕەخنە گرتنە لە (خود) و دوودڵ نییە لە وتنی ڕاستیەکان، گەرچی ئەو ڕاستیانە بریندارکەر و توندبن بۆ ڕۆڵەکانی نەتەوەکەی یان ئاینەکەی.

لە ڕاستیدا ئەم هەڵوێستە ڕخنەییە لە خود، ئەوەیە کە ئێستا پێویستمان پێیەتی، چونکە هاوڕێکەت ئەو کەسەیە کە بڕوا بە ڕاست وتنەکەت دەکات، نەك ئەوەی بە درێژای کات باوەڕت پێدەکات و موجامەلە و، موراوەغەت لەگەڵ دەکات. ئێمە لە گوتارە ئایدۆلۆژییە سواوەکانی زۆرینەیەك لە ڕۆشنبیرانی عەرەب بێزاربووین، ئەوانەی ڕازینابن کە بەرپرسیاریەتی ئەوەی ڕوودەدات بخەنە سەر شانی خۆیان و هەمیشە خەتاکە دەخەنە سەر پاشکۆیەتی کردن بۆ ئیمپریالیزم و ئیستیعمار..هتد. ئەمە هەڵوێستێکی نا بەرپرسیارانەیە و، هیچ دەرئەنجامێکی ئیجابیشی لێناکەوێتەوە. ئاشکرایە عەرەب و موسڵمانان هیچ پێشکەوتنێك بە خۆیانەوە نابینن تەنها ئەو کاتە نەبێت کە دەچنە ناو پرۆسەیەکی ڕخنەگرانەی ڕیشەییەوە لە کەلەپور و مێژو و ڕابردووی کەڵەکە بوویان. ئەوەشی پەیوەندی بە هۆکارە ناوخۆییەکانی نەخۆشییەکەوە هەیە کە لەمڕۆدا گیرۆدەی بووین و بەدەستیەوە دەناڵێنین، "عەبدولوەهاب ئەلموئەدەب" ئاوای دەبینێ:

جیهانی ئیسلامی بەردەوام و تا ئێستاش سکاڵایەتی بە دەست هەرەسهێنانی شارستانییەتیە کلاسیکییەکەیەوە و پێشکەوتنی خەڵکانی دیکە لەو بوارەدا، ئەو تا ئێستا لە سامی ئەو شۆکە بە ئاگانەهاتۆتەوە، ئەو لەوە تێناگات چۆن مەسیحییە ئەوروپییەکان توانیان سەرکەون بەسەریاو ببنە مامۆستاو گەورەی، لە کاتێکدا پێشتر ئەو مامۆستاو گەورەی ئەوان بووە، موسڵمان تا ئێستا ناتوانێت ئەم بارودۆخە پێچەوانەیە تێبگات و هەزمی بکات.

ئاشکرایە کەوا شارستانییەتی عەرەبی– ئیسلامی شارستانییەتێکی ناوازە بووە، ڕۆشناییەك بووە بۆ گەلانی دیکە، بە تایبەتی گەلانی ئەوروپا. بەلاّم هەرەسی هێناو نەماو بووە بەژێرەوە.. لەبەر ئەم هۆیە موسڵمان وایلێهاتوە هەڵچێت تا کاریگەر بێت، جڵەوکراوبێت نەك جڵەو

لەدەست. ئەم شتەشە نە دەتوانێ لێیتێبگات و نە دەتوانێ وەریشیگرێت، چونکە موسڵمان وایدادەنێت خۆی خاوەنی باوەڕی ڕاستە و ئەوانی دیکە گومڕان، کەواتە ئەی چۆن ئەوانی تر توانیان پێشی بدەنەوە، لە کاتێکدا ئەو لای خودا پەسەندترە؟ ئابەم شێوەیە عەرەب یان موسڵمان کەوتونەتە ناو ئەو شتەی کە "عبدولوەهاب ئەلموئەدەب" پێی دەڵێ هەستی ڕق و کینەی گەرم بەرامبەر ئەوانەی لە شارستانیەتدا پێشیان داونەتەوە. ئەمەش هەستێکی تێکدەر و ڕووخێنەرە و لەم هەرەسەی کە کەوتوینەتە ناوی دەرمان ناهێنێ، مەگەر وازیلێبێنین و پشتگوێی بخەین.

بەڵام لەوانەیە ئەم هەستە پاڵ بە هەندێ توندڕەومانەوە بنێت بۆ جێبەجێکردنی کۆمەڵێ شت کە بەرگەی دەرئەنجامەکەی ناگرین: بۆ نموونە تەقینەوەکانی *11ی سێپتێمبەر*.

ئێمە لە نێوان سەدەی (نۆ و دە)دا ناوجەرگەی شارستانیەتی جیهان بووین (بەغدای عەباسییەکان)، پاشان (قاهیرەی فاتیمیەکان) لە سەدەی یازدەدا، دوایی (قاهیرەی مەمالیکەکان) لە نێوان سەدەی سیانزە و چواردەدا. دوای ئەوە ناوجەرگەی شارستانیەت گوێزرایەوە بۆ ئەوروپا و لە ڕێگای دەریای ناوەڕاستەوە گەیشتە کەنارەکەی بەرامبەرمان. شارستانیەت پێش ئەوەی لە جیهانی ئیسلامی دوورکەوێتەوە و بگاتە (ئەمستردام)، بۆیەکمین جار گوێزرایەوە بۆ (جەنەوا و ڤینیسیا). لە پاشان لە سەدەی نۆزدەدا گوێزرایەوە بۆ (لەندەن)، لەدوای ئەوەش لە سەدەی بیستدا گوێزرایەوە بۆ (نیویۆرك). لەو دەمەوە چیتر "ڕۆحەکە" وەك ئەوەی هیگڵ دەیڵێت، یان "شارستانییەتەکە" وەك ئەوەی خەڵکانی دیکە دەیڵێن بەجێیهێشتین و نەگەڕایەوە بۆلامان، ئیدی ئێمە تا ئێستا گلەیی لە بەختمان دەکەین و بۆ ڕابردووی بەسەرچو و شارستانییەتە بەرزەکەمان دەگرین کە لەوپەڕی شکۆمەندیدا وەستا.

"عەبدولوەهب ئەلموئەدەب" وایدەبینێ کە لە سەرەتای سەدەی چواردەهەمەوە کەموکوڕی شارستانیەتی کەوتە خوێنمانەوە، بەڵام ئێمە هەستمان بە دەرئەنجامەکەی و شوێنەوارەکەی نەکرد، تەنها ئەوکاتە نەبێت کە لەژێر سمی ئەسپەکانی "ناپلیۆن بۆناپارت"دا بەئاگا هاتین، لە کۆتایی سەدەی هەژدەهەمدا. لەوساوە زانیمان ئەوانی دیکە بەڕاستی پێشمان کەوتوون، بە ڕادەیەکی زۆریش، لە هەموو بوارەکانیشدا: لە سەربازییەوە بۆتەکنەلۆجی و زانستی و ئابوری و ڕۆشنبیری و سیاسی..

لەڕاستیدا سەردەمی ڕۆشنگەری تەنها ئێمە و ڕۆژئاوای لێکدی جیانەکردەوە، بەڵکو ڕۆژئاواو هەموو شارستانییەتەکانی دیکەشی لێکدی جیاکردەوە، وەك هەردوو شارستانیەتی چینی و هیندی و ئەوانی تریش. ئیدی لەوچرکەساتەوە، واتە سەرەتای سەدەی هەژدە، ئەوروپا لەدۆڵێکە و ئەوەی دەمێنێتەوە لە جیهان لە دۆڵێکی ترە، لەوێوە ئەوروپا لەڕووی شارستانیەوە پێشکەوت و بەسەر هەموو جیهاندا سەرکەوت، بگرە بە پێوانەی چەندان ساڵی ڕۆشنایی-السنە الضوئیة- کەوتە پێش جیهانی ئیسلامییەوە.

دوای ئەوە دانەر ئاگاداری خاڵێکی بنچینەی دەبێت، لەو

بڕوایەدام ئەم خاڵەی لە بیرمەندی میسری "رشدی ڕاشد" وەرگرتووە، کە ماناکەی بەم جۆرەیە:

جیهانی ئیسلامی لە گەشەی زانستی و فەلسەفیدا گەیشتە بەردەم دەرگای تازەگەری ئەوروپی، لە پاشاندا و لە ناکاو شارستانییتەکەی پچڕاو ڕاوەستا. ئەم ڕاوەستانەش لەدوا چرکەیدا شتێکی ئازار بەخش و ناخۆشە. ئەو بەردەرگایە چییە کە گەیشتینە لێوارەکەی و لە پاشان کەوتین و نەمانتوانی بیبڕین یان پاشەکشەمان لێکرد؟ ئەوە بەسادەییەکی زۆرەوە خۆی لە شۆڕشی مۆدێرنە دەبینێتەوە کە لەسەر دەستی ئەم چوار ناوەی خوارەوەدا دێن دێت: کۆپەرنیکۆس، کیبلەر، دیکارت، گالیلۆ. دەبوو ئێمە ئەوشۆڕشەمان بکردایە ئەگەر لە دواچرکەدا شارستانیەتەکەمان هەرەسی نەهێنایە.

لە دوایدا دانەر ئاماژە بەهۆکارێکی ناوخۆیی‌دیکە دەکات کە بووە هۆی هەرەسهێنانی شارستانییتەکەمان، ئەویش ئەمەیە:

سەرکەوتنی ئەهلی تەقلید و لێکدانەوەی حەرفی بەسەر موعتەزیلەدا، ئەویش دوای شەڕێکی خوێناوی کە لە سەردەمی "مەئمون"ەوە تا سەردەمی "موتەوەکیل" درێژەی کێشا، دوای ئەوە پشتی موعتەزیلەکان شکا- واتە مەزهەبی عەقڵانی وتەئویلی لە ئیسلامدا- تا ئێستاش نەیتوانیوە خۆی بگرێتەوە و هەستێتەوە سەرپێ. هەر لەبەر ئەم هۆیەشە بزاوتە ڕیشەخوازە توندڕەوەکان بەو خەستیەوە دەستیان بەسەر شەقامی ئیسلامیدا گرتووە. ئیدی ڕەوتی عەقڵانی لەباربرا و بەشێوەیەك جەنگ لە دژی بەرپاکرا کە بەتەواوەتی لە گۆڕەپانەکەدا ونبوون؟.

ئابەم شێوەیە خەڵك وا تێگەیشتن کەوا ئیسلام تەنها ڕەوتی ڕیشەخوازی توندڕەو لە خۆدەگرێ و، ئەو هەموو کاتێ هەروابووە، تاهەتاهەتایە هەرواش دەمێنێتەوە. هیچ کەسێ بیری نایەت کەوا ئیسلام لە قۆناغی شارستانیەتی کلاسیکدا فرەیی بووە، قۆناغی بەخشین و بەرهەمهێنان و گفتوگۆ فەلسەفییەکان بووە، هەموو خەڵك لەو باوەڕەدان کەوا ئیسلام ئەم ڕەوتە توندڕەوەیە و هیچی تر.

هۆکارێکی تری هەرەسهێنانی شارستانیەتیەکەمان بریتیە لە هۆکاری ئابوری مادی. لە سەرەتای سەدەی یانزەدا هێڵەکانی بازرگانی لە ناوچەکەماندا بۆ بەرژەوەندی ئەوروپا وەرچەرخا، لێرەوە بۆرجوازییەتی ئێمە بێهێز بوو، ئەم بۆرجوازییەتەش بوو کە پاڵپشتی ڕەوتی عەقڵانی دەکرد لە ئیسلامدا، جا ئەو ڕەوتە لاهوتیی بێت لەسەر ڕێگای موعتەزیلە، یان فەلسەفی بێت لەسەر ڕێگای فەیلەسوفەکان و گەورە ئەدیبانی وەك "ئەلکندی، فارابی، جاحز، تەوحیدی، ئیبن سینا، ئیبن ڕوشد، ئەلمعەری، ئەبی نەواس، ئەبی بەکر ئەلرازی و" زۆرێکی تر.

لەم سەردەمەی ئێستاشدا جارێکی دیکە ڕەوتی عەقڵانی لەبار برا. فیکری تازەگەری "ئیمام محەمەد عەبدە و جەمالەدینی ئەفغانی و عەلی عەبدولرازق و" ئەوانی تر، لە بەرامبەر فیکری "حەسەن بەنا و برایانی موسڵمان"دا دۆڕان، ئەنجامەکەشی ئەوەبوو کە دوریمانەوە: واتە بەرزبوونەوەی

بێوێنەی بزاوتە توندڕەوەکان کە پێشی لێناگیرێ و داخستنی فیکری. لێرەوە هەندێ هۆی نزیك و دوور هەیە بۆ ئەم دۆڕاندنە شارستانییەتیەی کە چەند سەدەیەکە بەردەوامە.

بەلاّم ئەوەی لە ئێستادا پەیوەندی بە هۆکاری دەرەکییەوە هەیە سەبارەت بە تراژیدیای عەرەبی ئیسلامی، دەگەڕێتەوە بۆ هەندێ فاکتەر، لەوانە خیانەت کردنی ڕۆژئاوا لە پرنسیپەکانی ڕۆشنگەری و مافی مرۆڤ، هەر جارێك ڕۆژئاوا ناچاربێت لە نێوان پرنسیپەکان و بەرژەوەندییەکانیدا یەکێکیان هەڵبژێرێت، ئەوا بەرژەوەندییەکانی هەڵدەبژێرێت. هەروەها لەو فاکتەرانە ئیستیعمار کردنی فەلەستین و ڕەزامەندی ڕۆژئاوا لەسەر ئەم پرۆژە نا ئەخلاقییە ڕوون و ئاشکرایە. ئالێرەدا دیسانەوە ڕۆژئاوا خیانەتی لە پرنسیپەکانی ڕۆشنگەری و دادخوازی کردوە.

لە دواییدا ”عبدولوەهاب ئەلموئەدەب" هەندێ پرسیاری یەك لەدوای یەك ڕووبەڕووی ئەمریکا و ئیسرائیل دەکات و دەڵێت: بۆچی ئەمریکا هەموو قورسایی خۆی ناخاتە گەڕ بۆ دۆزینەوەی چارەسەرێکی عەقلاّنی نێوان فەلەستین و ئیسرائیل، چارەسەرێك ببێتە هۆی درووستکردنی دەوڵەتێکی فەلەستینی لە پاڵ دەوڵەتی ئیسرائیلدا کە (قودس) پایتەختی هاوبەشی هەردووکیان بێت؟ ئایا تاوانی *11*سێپتێمبەر بەس نییە بۆئەوەی ئەمریکا چاوی بکاتەوە؟ بۆچی ئەمریکا ئیسرائیل ناچار ناکات ئۆردوگاکان هەڵبوەشێنێتەوە؟ بۆچی ئیسرائیل دان بەو بەرپرسیاریەتیە ئەخلاقیەدا نانێت کە فەلەستینیەکان لە ئەرزوئاوی خۆیان دەردەکات؟ بۆچی دانی پیانانێت، تەنها دانی پیانێت، کەوا دامەزراندنی هۆکارێك بووە بۆ تراژیدیای فەلەستینی کە هەموو سەدەی بیستەمی بەخۆیەوە گیرۆدە کرد؟

”عبدولوەهاب ئەلموئەدەب" چەندین پرسیاری یەك لەدوای یەك دەکات و هێندە توڕەیە خۆی پێناگیرێت! ئەو ئەم پرسیارانە لە کلاّوڕۆژنەی باوەڕهێنان بە ئاشتی و دانپیانان بە واقیی بوونی ئیسرائیل دەکات، بەمەرجی دامەزراندنی دەوڵەتێکی فەلەستینی سەربەخۆ و گەڕانەوەی ئیعتبار بۆ ئەم گەلە خێرنەدیوە، کە لە ڕەگ و مێژو و خاکەکەی هەڵکێشراوە.

دواجار ئەو لەگەڵ "ئارنست رینان" یەکدەگرێتەوە بەو وتەیەی کە دەڵێ گەر ئاینەکان ئادەمیزادەکان لەیەکتری جیابکەنەوە، ئەوا عەقڵ لەگەڵ یەکتریان کۆدەکاتەوە، چونکە تەنها یەك عەقڵ هەیە، ئەمەش ڕاستە، چونکە ئەو مەنهەجیەتە عەقلاّنییەی لە کۆلێژی زانست لە (هارفارد) بەکاردەهێنرێت، هەمان ئەو مەنهەجیەتەیە کە ئێستا لە زانکۆکانی (پەکین، تۆکیۆ، ڕیاز، پاریس، ڕەبات..هتد) بەکاردەهێنرێت. بەڵێ یەکێتییەك لەڕۆحی ئادەمیزادەکاندا هەیە، پێویستە جەختی لەسەر بکەین و گەشە بەو گفتوگۆ ئۆرگانییەی نێوان ڕۆشنبیری ئیسلام و ڕۆشنبیرییەکانی دیکە بدەین، بەڵێ دوا ڕۆژ بۆ شارستانیەتی عەرەبی ئیسلامی تازەوەبووی مرۆڤ دۆستانەیە.

<u>سەرچاوە</u>

شرق الاوسط *2002/9/29*

# هونەری بووکەڵە لە جیهاندا



• مختار السویفی

▪ لە عەرەبییەوە: بەختیار سەعید

بووکەڵە بۆچی؟ پرسیارێکە و بەردەوام بەرەو ڕوو دەبێتەوە.. ئایا شێوەیەکە لە شێوەکانی هونەری فۆلکلۆری؟ ئایا هۆکارێکە بۆ دەربڕین و توانای ئەوەی هەیە کە واتا و ئایدیاکان بگەیەنێتە بینەر وەك هەریەك لە بەشەکانی تری هونەر؟ ئایا هونەرێکە تەنها بۆ منداڵان و پەیوەندی بە گەورەکانەوە نییە؟ ئایا هونەری بووکەڵە هونەرێکی ڕاستەوخۆ و نوێیە وەك سینەما و تەلەفزیۆن؟

لەم بەسەرکردنەوەیەماندا هەوڵدەدەین بۆ هونەری بووکەڵە وەڵامی ئەو پرسیارانە بدەینەوە و باس لە مێژووی سەرهەڵدانی ئەم هونەرە لە چەند وڵاتێك بە گشت لایەك ئاشنا بکەین.

## مرۆڤ و بووکەڵە

بووکەڵە لە مێژەوە لەگەڵ ئەندێشەکانی مرۆڤدا ئاوێتە بووە، کە لە سەرەتادا بووکەڵە بەرهەمهێنەری ئەندێشەی مرۆڤە و هەر خۆشی درێژەپێدەر و گەشەکردووی بەخشیوەتە ئەم هونەرە.

میسرییە کۆنەکان و فینیقییەکان و ئاشوورییەکان و هیندی و چینی و ژاپۆنییە کۆنەکان ئەم هونەرەیان ناسیووە، هەروەها گریکەکان، پێش ئەوەی شانۆ بناسن ئەم هونەرەیان ناسیوە و بە یەکەمین جۆری هونەری دەربڕین دەژمێردرێت.

ئەو پەیوەندییە سایکۆلۆجییەی کە ئینسانی بە گەورە و بچووکییەوە پەیوەست کردووە بە بووکەڵەوە، ئەو هەلەی بۆ بووکەڵە ڕەخساندووە کە ڕۆڵێکی فراوانتر بگێڕێت کە ئەندێشەکانی ئینسان بۆ خۆی خوڵقێنەری بووە کە لەنێویاندا داستان و چیرۆکە ئەفسانەییەکان بووە کە شارستانییەتی مرۆڤایەتی شانازی پێوە دەکات لەسەرتاسەری جیهاندا.

ئەو پەیوەندییە بۆتە هۆی شادمانی خستنە دڵی گشت ئینسانێك کە بووکەڵە دەبینێت، هێزێکی ڕاکێشان بەرەو لای بووکەڵە بە کێشت دەکات هەروەك هێزێکی سیحراوی، هەرچەندە ئەو کەسە شێوازی جدیشی لەخۆ گرتبێت لە ژیاندا، بزەیەك دەبێتە هۆی شادمانی و سەرسوڕماندنی بەو جۆرە هونەرە و ئەو بەرهەمەی کە پێشکەش دەکرێت.

بە درێژایی چەندین سەدە لە پێشکەوتن، بووکەڵە ئەو ئەرکەی لەسەر شانبووە کە شادمانی بخاتە دڵی خەڵکییەوە بە گەورە و منداڵانیشەوە، گەر لە هەر تەمەن و پلەیەکی کۆمەڵایەتیدا بێت، مێژووی هونەری بووکەڵە ئەوەی بەدەرخستووە کە دروستکردنی بووکەڵە لە تەختە یاخود کاغەزی ئەستوور کە بە بەرگێکی ئاڵاو واڵا پۆشراوە کاریگەری لەسەر دەروونی بینەران بەجێ هێشتووە، هەروەها جێگەی سەرسوڕماندن نییە کە لە سەرەتاکانی سەرهەڵدانییەوە هۆکارێك بووە بۆ بڵاوبوونەوەی کاریگەرییە ئاینییەکان لەسەر خەڵکی بە تایبەت لە سەردەمانی بتپەرستی و پاشان سەردەمی مەسیحییەت و دواتریشدا.

### بووکەڵە و بیری ئینسانی

زۆر ئەستەمە بتوانرێت جێگەی سەرهەڵدانی بووکەڵە بۆ یەکەم جار دیاری بکرێت، بەڵکو دەکرێت بڵێین کە لە سایەی



شارستانییەتێکی دیاریکراودا سەری هەڵنەداوە و پاشان بە وڵاتانی تردا بڵاوبووبێتەوە، بەڵکو لەوانەیە لە چەند زەمەنێکی نزیك لەیەك لە چەند ناوچەیەکی جیهانی کۆندا سەری هەڵدابێت.

ئەمەش بەو واتایە نییە کە بووکەڵە جێگەی سەرهەڵدانی نەزانرێت، بۆ نموونە (ئەندێشەی سێبەر- خیال الظل) کە لە چینی کۆندا سەری هەڵداوە کە ناوە هونەرییەکەی (*ombres chinoises*) و پەیوەندییەك لە نێوان ئەم جۆرە بووکەڵەیە و شارستانییەتی چینیدا هەیە، لە هەمان کاتدا زۆربەی شارستانییەتە کۆنەکان بەشدارییان کردووە لە پێشکەوتنی جۆرەکانی بووکەڵە کە لەگەڵ کەشوهەوای هونەری و ئەدەبی گشت ئەو شارستانییانەدا بگونجێت، ئەمەش کارێکی سرووشتییە کە ئەو بووکەڵانە تەعبیر لە ناخی ئەو شارستانیەتانەی ئینسان بکات، تەعبیر لە ڕۆحی ئەو گەلانە دەکات کە دروستکەری ئەو شارستانییەتە بوون.

بووکەڵە بە هەمان شێوەی ئینسان لەگەڵ قۆناغەکانی تەعبیر لە داستان و تەقسە ئاینییەکاندا گەشەی کردووە و پاشان قۆناغی هونەریی درامی پێشکەوتوو لەگەڵ ئەم هونەرەدا هەنگاو بە هەنگاو ڕۆیشتووە.

لە سەرەتاکانی سەردەمی مەسیحییەتدا، کەنیسە بۆ کاریگەری دانان لەسەر خەڵکی تواناکانی بووکەڵەی بەکارهێناوە، کە تیایدا زۆر لە نواندن و چیرۆکی ئاینی کە ئەویش بە مەبەستی بانگێشەکردن بووە بۆ مەسیحییەت، بووکەڵە چەندان کەسایەتی ئاینی و پیاوچاکانی نمایش کردووە، هەروەها نمایشکردنی موعجیزە

ئاینییەکان لە وێنەیەکی درامی زیادەڕۆییدا کە کاریگەری لەسەر هەستی خەڵکی بکات.

کەنیسە لە دوای ئەوەی سوودێکی زۆری لە هونەری بووکەڵە وەرگرت و هێندەی نەبرد ئەم هونەرەی قەدەغە کرد کە کەسایەتی ئاینی نمایش بکەن، هەر بۆیە بووکەڵە کەوتە پیشکەشکردنی چیرۆکی ئازایەتی و کاری فۆلکلۆری و پاشان چەندین دەقی درامی نووسراوە کە بۆ شانۆی ئینسان پێشکەش کراون.

بەم شێوەیە هونەری بووکەڵە ئەو هەلی کارکردنەی بۆ ڕەخسا کە چەندان کاری ئەدەبی ڕۆماننووسە ناودارەکان و شانۆنووسەکان بە شێوەیەکی گشتی پێشکەش بکەن، بە درێژایی مێژوو بووکەڵە کارەکانی (مۆلێیر، ڕاسین، گوستاف لوبیر، کریستوفر مارلو، گۆتە، شیللر، گولدونی، شکسپیر، ڤۆڵتێر، ئیڤان تورجنیف، تۆلستۆی، جۆرج صاند، ئەناتۆل فرانسی، جۆرج برنادشۆ، هانزکریستیان ئەندرسن، ئۆسکار وایلد.. و چەندانی تر) هەروەها بووکەڵە توانیویەتی ناودارترین ئۆپێرای جیهانی پێشکەش بکات لەوانە (فاجر، موتسارت، بوتشینی، ماسکانی، فردی، ئەوفنباخ، و چەندانی تر).



## سەرچاوە ئەدەبییەکان بۆ شانۆی بووکەڵە

شتێکی شاراوە نییە کە بووکەڵە چەندە کاریگەری هەیە لەسەر فێربوونی منداڵان لە بەرامبەر ئەو کارانەی کە پێویستە ئەنجامی بدەن یاخود بە پێچەوانەوە، هەروەها هۆکارێکە بۆ بزواندنی هەست و گەشەکردنی چێژلێوەرگرتن و ئەندێشەیان فراوانتر دەکات، بۆئەوەی بووکەڵە بتوانێت ئەو کارگەرییەی هەبێت پێویستی بە بوونی دوو مەرجی سەرەکی هەیە:

*1*- پێویستە شانۆییەکانی بووکەڵە نزیک بێت لە دڵی منداڵانەوە، لەگەڵ ئەو بنەما کۆمیدیانەی کە لەنێو دەقەکەدا پەیڕەو دەکرێت کە نزیک بێت لە ئاستی هوشیاری منداڵان لەبەرامبەر گفتوگۆ و ڕووداوەکاندا.

*2*- پێویستە شانۆییەکانی بووکەڵە کارێکی هونەری ڕاستەقینە بێت، نەك بە تەنها کارێکی ئاسایی کە نەتوانێت جێگەیەك لە بوونیادی منداڵاندا بەجێ بهێڵێت، واتا بەرهەمێك نەبێت کە هونەری نەبێت کە ئەنجام زیانی هەبێت لە جیاتی سوود بۆ منداڵان.

بە پەیڕەوکردنی ئەو دوو مەرجە ئامانجی پەروەدەیی بۆ شانۆی بووکەڵە لەگەڵ پێداویستییەکانی منداڵاندا لە خۆشی و حەزکردن بە زانینی زانیاری نوێ یەکدەگرێتەوە.

لە ڕووی لایەنی تەکنیکەوە لە شانۆی بووکەڵەدا دەبینین کاری هونەری لەو بوارەدا قورساییەکی تایبەتی هەیە، هەر بۆیە دەبێت گرنگی بە هەڵبژاردنی ڕووداو و گفتوگۆکان بدرێت کە گونجاو بێت لەگەڵ سروشتی بووکەڵەدا لە جووڵە لەسەر شانۆ، لێرەوە دەتوانین ئەوە دەست نیشان بکەین کە ڕووداو و شیکردنەوە دەروونییە ئاڵۆزەکان لەگەڵ

سرووشتی کاری هونەری لەسەر شانۆی بووکەڵە ناگونجێت، کە دەکرێت لەگەڵ ئاستی تێگەیشتنی مندالاندا گونجاوبێت، هەر بۆیە دەبێت کەسایەتییەکان کە لەسەر شانۆی بووکەڵە یاری دەکەن کەسایەتییەکی گشتی و نموونەیی بن.

ئەو جۆرە کەسایەتییانە هۆکارن بۆ بنیادنانی کەسایەتی چیرۆکی ئەندێشەیی و کەسایەتی نەتەوەیی، وەك زانراوە هەر نەتەوەیەك خاوەنی داستان و چیرۆکی ئەندێشەیی تایبەتن و ئەو چیرۆکانە تا ڕادەیەکی زۆر پەیوەستن بەو کەشەی کە گەلەکەی تیادا دەژی. لەو داستان و چیرۆکە ئەندێشەییانەدا ئینسان ڕۆڵی (شێر و ڕێوی و سەگ و مەیمون و گوڵ و.. هتد) دەگێڕێت و لەو نێوەندەدا زۆر لە نووسەرە ناودارەکانی جیهان چیرۆکی تایبەتییان لەو جۆرە چیرۆکە ئەندێشەییانەیان تۆمار کردووە. لە شاعیران و نووسەرانی ڕووس کە بەشدارییان کردووە لەو بوارەدا لەوانە (پۆشکین، گۆگۆل، تۆڵستۆی، گۆرکی، مایاکۆفسکی).

**بووکەڵەی ئەڵمانی**

مێژووی هونەری شانۆی بووکەڵە لە ئەڵمانیادا بۆ سەدەی دوانزەهەم دەگەڕێتەوە، لەودەمەی کە چەندان تیپی هونەریی بووکەڵە لەسەرتاسەری ئەڵمانیادا بڵاوبوونەوە و هونەرەکەی خۆیان نمایش کرد کە لایەنگرێکی فراوانیان بۆ خۆیان بەدەست هێناوە.

ئەم تیپانە لە یەك ئەندام یاخود دوو ئەندام پێکهاتووە و چیرۆکەکانی ئەو سەردەمە زیاتر چیرۆکی فۆلکلۆری و داستانەکان و موعجیزە ئاینییەکان بووە، لەگەڵ ئەوەی ژیانی ڕۆشنبیری لە ئەڵمانیادا لە ئەنجامی جەنگدا وڵاتەکە تووشی نشووستی دێت، لە سەدەی حەڤدەهەمدا و لەو نێوەندەدا هونەری بووکەڵە بە ئازایەتی لەبەرامبەر ئەو نشووستانەدا وەستاوەتەوە و هەڵگری ئیحساسەکانی گەلی ئەڵمانی بووە بە تایبەت ئیحساسە نەتەوەییەکان. هەر هونەری بووکەڵە بووە کە توانیویێتی داواکانی بینەران لە ڕێگای هونەری دارمییەوە بەجێی بهێنن.

هەر لەو دەمەدا بووکەڵەی ئەڵمانی چەندان کەسایەتی



بووکەڵەی لەدایك کردووە لەوانە کەسایەتی (کاشبار) کە کەسایەتییەکی نەتەوەیی بووە کە بە چەندان کەسایەتی نەتەوەیی گەلانی تر دەگات و هونەری بووکەڵەیان گەشاندۆتەوە، هەروەها کەسایەتی (جرتیل) کە ڕۆڵی بووکی (کاشبار) دەگێڕێت، هەروەها کەسایەتی (سیبیل)ی هاوڕێی کاشبار کە بەشداری لە گشت گفتوگۆ و سەرکێشییەکاندا کردووە.

گفتوگۆی نێوان کەسایەتییەکان پەیوەست نەبووە بە دەقێکی دیاریکراوەوە، بەڵکو نواندنەکە زۆرجار ڕاستەوخۆ بووە و گشت ڕووداو و گفتوگۆکانی لەخۆگرتووە و پاشان دەچنەوە سەر دەقە سەرەکییەکە، لە هەمان کاتدا بە

هۆی بەرهەمی هەندێك لە نووسەران و شاعیرانەوە ئەم هونەرە گەشانەوەی بە خۆوە بینیووە، لەوانە "گۆتە" ڕۆمانە ناودارەکەی (فاوست)ی لەسەر شانۆی بووکەڵە پێشکەش کردووە و بۆ خۆشی کاری دەرهێنانی ئەنجام داوە، هەروەها شانۆی بووکەڵە سوودی لە بابەتەکانی (هەزارویەك شەوە)ی عەرەبی (ئۆدیسا)ی یۆنانی و (گەشتێك بە دەوری جیهاندا لە هەشتا ڕۆژدا)ی (جول فیرن)دا، هەروەها شانۆیی (خێزان پێکەوەنانی ئەهریمەن)ی کونت فرانز، و شانۆیی (سیرك جوهر)ی نووسەری سویسری (تزوجت فوجیل) و شانۆیی (موعجیزەی خۆشەویستی)ی (فلهلم فون شولز).

لە هەمان کاتدا شانۆیی بووکەڵەی ئەڵمانی زۆر ئۆپێرای ئەڵمانی و جیهانی پێشکەش کردووە لەوانە ئۆپێرای (باستیان و باستین) موتسارت، ئۆپێرای (سرودی ئەلبن)ی باخ، ئۆپێرای (ئیناس و دیدو)ی بورسیل.

### هونەری بووکەڵە لە چین

یەکێك لە چیرۆکە کۆنەکان دەڵێت (ئیمپراتۆری وتی – *Weti* کە دەسەڵاتداری چینی کۆنی لە ئەستۆدا بووە لە سەدەی یەکەمی پێش زاین تووشی دڵگرانی و غەمێکی لە ڕادەبەدەر دەبێت کە لە ئەنجامی مردنی هاوسەرە ئازیزەکەیەوە تووشی هاتبوو، ئەم حاڵەتە بەسەر کاروباری ئیمپراتۆرەکەوە ڕەنگی دابۆوە، هەر بۆیە خەڵاتێك دەستنیشان کرا بۆ هەر کەسێك بتوانێت ئیمپراتۆر لەو کەشە دەروونییە ڕزگار بکات.

قەشە (تائویست– *Ta oist*) توانی بووکەڵەیەك دروست بکات کە لە شێوەدا زۆر نزیك بووە لەو هاوسەری ئیمپراتۆرەوە، هەر بۆیە ئیمپراتۆر وا بڕوای هێنابوو ئەو بووکەڵەیەی کە دەجوڵێت و قسەدەکات ئەوە ڕۆحی هاوسەرەکەیەتی، هەر بۆیە کامەرانییەکی گەورەی بەخشیبووە ئیمپراتۆر و هێمنییەکی دەروونی باڵای بەدەست هێنابوو، بەڵام کە دواتر زانی ئەوە تەنها بووکەڵەیە و لە لایەن قەشەوە ئەنجام دەدرێت و بە فێڵ ناوی برد بڕیاری دا قەشە لە سێدارە بدرێت، هەر بۆیە جارێکی تریش دەکەوێتەوە دەریای غەم.

توێژەرەوانی بواری هونەری بووکەڵە لەو بڕوایەدان کە چینی کۆن نیشتمانی لەدایکبوونی بووکەڵەیە و پاشان بەرەو هند و دواتریش بەرەو کەنداوی باکووری ئاسیا و دواتریش بۆ ئاسیا و جیهانی ئیسلامی و ئەورووپا و ئەمریکا.

چیرۆکەکانی ئەم بووکەڵانە بە شێوەیەکی گشتی لە شێوەی تەقسێکی ئاینیدا قەشەکان وەك فێڵێکی ڕۆحی بە مەبەستی کاریگەری لەسەر بینەران بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ بەکارهێنراوە، هەر بۆیە یەکەمین کەسایەتییەکانی بووکەڵە لە چینی کۆندا کەسایەتی ئاینی بووە، پاشان کەسایەتی پادشا، و پاشان کەسایەتییە نەتەوەییەکان و دواتریش هونەری بووکەڵە بۆتە هونەرێکی فۆلکلۆری کە لە نێوان گەلاندا ئاشنا بووە.

### سەرچاوە

خیال الظل والعرائس فى العالم

# "دیکروا و.. ئاوازی جەستەی نەدوو.."

▪ لە عەرەبییەوە: شۆڕش محەمەد حسێن

لە ساڵی *1921*دا (جاك كۆبوە) لەناو شانۆكەیدا *Vieux combier* لە پاریس، فێرگەیەکی بۆ ئەکتەرەکان دامەزراند، کە ئامانج لەو فێرگەیەش ڕزگارکردنی شانۆ بوو لەو سستییەی کە دەبووە هۆی دامالینی شانۆ لە پێگە ئەفسانەکەی.

لە گرنگترین دەسکەوتەکانی ئەم فێرگەیە "ڕاهێنانی دەمامك" بوو بە شێوەیەك تیایدا جەستەی ئەکتەرەکان لەسەر چەمانەوە بۆ بەرزترین پلە کە ڕەوشت و نەریتە زانراوەکان ڕێگەی پێ بدات ڕادەهێنرا، هەروەها ئەو دەمامکانەی کە هیچ دەربڕینێکیان تیادا نییە بە خۆیانەوە هەڵدەواسی.

مەبەستیش لێی بریتی بوو لە جیاکردنەوەی ڕوخسار لە ڕاهێنانەکان، ڕوخسار بە پێی ئەوەی وەك دەست "ئامرازێکی درۆکردن و زۆر بڵێیی توندڕەوە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەوپەڕی قووڵایی ناخمان دەردەخات، لە شێوەیەکدا ڕێگا بۆ ڕوخسار ئاسان دەکات کە بە هۆی جوڵەکانی جەستە و گوزارشتەکانی وریایی بینەر بۆ خۆی کێش بکات.. بەمەش لە بەهاو ناواخنەکەی کەم دەکاتەوە، کەواتە تەنها ڕێگەیەك ئەوەیە کە ئێمە بە پاڵپشتی جەستە و هەندێ کات بە هاوەڵی کردنی ئەو دەنگانەی کە لە ڕێگەی دەم یاخود پێیەکان دەدرێت، یاخود لە ڕێگەی کۆمەڵە دەنگێکەوە کە لە ناخی ئافرەتێکی جادووگەر یان قاوەگرەوەدا هەژێنراون و لەبەرخۆیەوە بە پرتەپرت و بۆڵەبۆڵەوە دەریان دەبڕێ، یاخود لە ڕێگەی دەنگی مرۆڤێکەوە کە مێشێك ڕاوی نابێت، یاخود ئەو دەنگانەی کە لە ڕێگەی کاری پیشەیی و دەنگی ئامێرەوە دروست دەبێت، دەتوانین بگەینە جیاکردنەوەی تەواوەتی عەقڵ لە بیرکردنەوەی لە واقیع، تا دەگەینە ڕزگاربوون

لە کێشە و خەمەکانی ڕۆژانەی مرۆڤ.

ئەو جوولانەی کە جێبەجێی دەکەن وەك نمایشکردنی کاسێتێکی فیلمی سینەمایی دێنە بەرچاو کە ڕیتمێکی سستیان هەیە و پوختەی ئەو ئاماژانەن کە ڕۆژانە دەیانبینین، ئا بەم میتۆدە "کوبوە" وەك مامۆستا و ڕاهێنەرێك ئەکتەرەکانی "شانۆی وشە"ی ئامادە دەکرد، بە هەمان شێوەش سەبارەت بە ڕۆژانی گفتوگۆکردنیش بە تەنها لە ڕێگەی وشەوە نەبووە، بەڵکو بە هاوپشتی جەستەشیان بوو.

"ئیتین دیکروا" یەکێك بوو لە خوێندکارانی (کوبوە) هەروەها ئەوینی "دیکروا" بۆ ئەم تەرزە لە هونەر، لە ئەنجامی تەماشاکردنی یەکێك لە نمایشەکانی (کۆنسێرتی پشیلە *Cat Concert*) دروست بوو، کە هێشتا تەمەنی لە خوار دەساڵەوە بوو، کە تیایدا سێ هەواڵبەری نهێنی بە دوای سێ پیاو لە هندییە سوورەکاندا ڕادەکەن، بەلام پاشان بە پێچەوانەوە ڕووی دا بە شێوەیەك هندییە سوورەکان بە دوای هەواڵبەرەکاندا ڕایان دەکرد، کە ئەمانیش لە لایەن خۆیانەوە بە شوێن نێچیرەکەیاندا دەگەڕان.

پاشان دیکروا ئەم تابلۆیە یاخود دیمەنەی بە شێوازێك لە جووڵەی بێدەنگی جەستەیی دانا، ئەکتەرەکان لێدوانیان لەسەر ڕووداوەکان نەئەدرکاند کە بە هۆی ئاماژەوە هەڵدەستن بە گوزارشتکردن لێی، لەگەڵ ئەوەی کە بە کۆمەڵێك جوڵەی وەرزشی هەڵنەسان کە وەهمی ئەوە نیشان بدات گوایە گوزارشتە، بەلام توانیان کە بە شێوەیەکی جۆراوجۆر بە هۆی "جووڵە ئەکرۆباتی و سێرکە مەترسیدارەکان بۆ جەستەیان" گوزارشت لە ڕووداوەکان بکەن.

لەم تابلۆیەدا هیچ شتێك لەسەر تەختەی شانۆ بە ڕێکەوت ڕووی نەدا، پاش ماوەیەکی کورتیش دیکروا لەسەر تەختەی ئەوکاتە "کاربنتر"ی بۆکس وەشێنی دی کە بووە تابلۆیەکی گرنگ بۆ چۆنییەتی گوزارشتی جەستەی بێدەنگی مرۆڤایەتی.. بە هۆی بەهێزی و چوست و بزێوییەوە هەروەها بە هۆی بەژن زراڤی و خۆڕاگرییەوە، ئەمە جگە لە زیرەکییە خۆڕسکە درەوشاوەکەی و ئارەزووی بۆ سەرچڵی و گاڵتەوگەپ.

وە لە پێش ئەوەی کە دیکروا بچێتە فێرگەکەی "کوبوە"، یاری ئەکرۆباتی دەکرد، هەروەها کابرایەکی قەساب و یاریزانێکی پەڕینەوە بوو بەسەر گوریسەکاندا، لوولە چاکەر بوو و هەروەها قاپشۆر و دیسان بۆیاخچێتی کردووە و هەروەها بیناساز بووە.

دیکروا دەڵێ: "ئەم کارانەی کە بەرجەستەم کردوون و ژیاوم لەگەڵیاندا دیومن وردەوردە دەبوونە بەشێکی دانەبڕاو لە خانەکانی مێشکم، بۆئەوەی پاش ئەوە لە پشتەوە لە دوای مێشکمەوە پۆلێن بن بۆ شانەکانم و قولەپێکانم و بگاتە بەشەکانی پەنجەکانم، تاوەکو لە کۆتاییدا هێڵەکانی پاشەڕۆژم بنەخشێنێت".

کەواتە دیکروا ئامادەبووە بۆ چوونە ناو فێرگەی (*VIEU X-COLOMBIER*) و هەروەها ئەوەی کە پێشتر لەلای "کوبوە" تاکە نێوەندکار بوو، لای دیکروا بووە ئامانجێکی وەها کە بڕوای پێ

هێنا و، تا ئەمڕۆش ئەمەکدارە بۆی و بە بەردەوامبوونی لە ڕاهێنانەکانی دەمامکدا توانی تەرزێك لە هونەر دابمەزرێنێت کە بە نواندنی "بێدەنگیی تەواوەتی" ناوزەد دەکرێت.. ئەو هونەرەی کە لە ڕێگەی جووڵەی سەرجەمی جەستە گوزارشتی لێ دەکرێت و بەردەوامیش لەگەڵ جیهانی دەوروبەردا ئامبازی یەکدی دەبن و لێکدەئاڵێن و لەناو یەکتردا دەتوێنەوە.

ئەو هونەرەش (مایم)ە کە دەربڕینی بێ ورتەی پڕ واتایە و بەوە لە هونەری "پانتۆمایم" جیادەبێتەوە کە ئەمەی دواییان وەڵامدانەوەی هەیە بۆ ڕووداوەکان بە ئامانجی گوزارشتکردن لێی لە خودیان، بە پشتبەستن بە دیکۆر و جلوبەرگ و مۆسیقا و بە توانەوەی "هونەری مایم" لە جیهانی دەوروبەردا چونکە (ئەکتەر/ مرۆڤ) دەتوانێت بە جەستەی گوزارشت لە ڕەگەزەکانی ئەم جیهانە بکات و پێی بناسرێتەوە جگە لەو شتە تایبەتییانەی لە ئاکامی بەریەککەوتنیان بەو ڕەگەز و ڕێگرانەدا لەدایك دەبن و لە پێشەوە شتی دیکەی نابەرجەستە و نائامادە لەدایك دەبن ئەوانیش دەبنە هۆی قوڵکردنەوەی ڕوانینەکان بۆ ژیان و هەروەها جوانتر و ناسکتریشی دەکەن.

"جان لوی بارۆ" وا دەبینێ کە ئەو مادە هەبوانەی ناو ئەندێشەمان دەبێتە واقعێك بۆمان، ئەو کاتەی لەسەر جەستەی ئەکتەری "مایم" دەیبینین، کە "ئەویش ئەکتەرە بە پلەیەکی گوزارشت لێکراوی تەواوەتی، بە هۆی وروژاندنی ماسولکەکانی ئەم جەستەیە لە ڕێگەی ئەم مادەیەوە".

"جان لوی بارۆ" یەکێك بووە لە نزیکترین ئەوانەی کە لەگەڵ دیکروا لە سی و چلەکانی سەدەی بیستدا کاری کردووە.

<u>**سەرچاوە**</u>

گۆڤاری "الكويت" ژمارە *94*ی ساڵی *1990*.

# سەدەی هەژدە وەکو زەمینەی ڕۆشنگەری

• ئیلرچ ئیم هۆف
▪ لە ئینگلیزییەوە: پەیوەند

ڕۆشنگەری پەیوەستە بە سەردەمێکی دیاریکراوی مێژووییەوە. هەموو بزووتنەوەیەکی لەم جۆرە پێویستە لەگەڵ ڕاستییەکانی قۆناغە مێژووییەکەی خۆیدا بگونجێت هەرچەندە لەوانەیە جووڵەی ئەو قۆناغە مێژووییە بە دژی ئەو بزووتنەوەیەش بێت. بۆ نموونە هیومانیزم دەبوو لەگەڵ کەنیسەی جیهانی و بیروباوەڕە ئاینییەکەیدا بسازێت، هەروەها دەبوو لیبرالیزم لەگەڵ هەڵچوونی بەتینی هێزە سەربازی و



ڕۆسۆ

ناسیونالیستەکاندا بگونجێت، دیسان دەبوو ڕۆشنگەریش لەگەڵ دابونەریتی ڕەگوڕیشەدار قووڵی حکوومەتی عیلمانی و حکوومەتی ڕۆحانیدا ڕێک بکەوێت.

لەگەڵ ئەوەشدا ڕۆشنگەری کاریگەریی خۆیی لەسەر کەسێتی سەردەمەکەی خۆی دیاری کرد. خەڵکی لە سەردەمی ڕۆشنگەریدا بە ڕێگایەك نووسیویانە و قسەیان کردووە کە جیاواز بووە لەو ڕێگا و شێوازەی کە پێشتر پێیان نوسیوە و پێی دواون، دیارە بۆ ماوەیەکیش لەسەر ئەو شێوازە بەردەوامبوون لە قسەکردن و نووسین هەتا سەردەمی ڕۆشنگەری هاتووە.

هەر پاشایەك تەنانەت ئەگەر زۆرداریش بووبێت، بۆی دەرکەوتووە کە جێگای بایەخ پێدانە ئەگەر خۆی بگۆڕێت یان خۆی وەکو فەرمانڕەوایەکی ڕۆشنگەر دەربخات و زیاتریش وەکو مامۆستایەکی قوتابخانە خۆی نیشان بدات لەچاو ئەوەی کە زۆرداریك بێت.

ڕۆشنگەری کاری کرد بۆ گواستنەوە لە تیۆرەوە بۆ پراکتیك، لە ڕەخنەگرتنی دوور لە کردارەوە بۆ کردار و کارکردن کە ئەوەش بە مەبەستی چاککردن و چاکسازی پەروەردە و دارایی و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و ژیانی سیاسی نەخشەکێشراوە. ڕۆشنگەری ژیانی بەخشی بە ڕەهاگەری ڕۆشنگەرییانە و هەروەك زیندوێتی دا بە دوو کۆماری گەورە لە فەڕەنسا و لە ئەمەریکای باکوور.

ڕۆشنگەریی بریتی بوو لە کاردانەوە بە دژی شێوازی بارۆکی و ئۆرسۆدۆکسی و دژە چاکسازی، شەپۆلی بەردەوامی هیومانیزم لە (ئیراسمۆس) دواندن و لە نووسینی ئاشکرادا جارێکی تریش ڕەخنەگرتن لە مۆدێلی کلاسیکی کە لەوێشەوە ڕێگای خۆی بە ئاراستەی رووکەش دەدۆزێتەوە، چڕ دەکاتەوە. هەروەك ئەو چرکردنەوەیە لە لایەن ئەلبرێخت ڤۆن هۆڵەوە لە دەستەواژەیەکدا داڕێژراوە و دەری دەبڕێت کە ئەویش ئەوەیە: ئەو مرۆڤەی ئازادانە بیردەکاتەوە بە جوانی بیردەکاتەوە".

ڕۆشنگەری پاڵنەرێکی بەهێزی نائاسایی بۆ شێوازی چەق بەستووانە و تەقلیدییانەی شتەکان پێشکەش کرد. خەڵکی گەیشتنە ئەو حاڵەتەی کە سەرنجی پێشەوەی خۆیان بدەن نەك سەرنجی دوایانەوە، یان ئەگەر سەرنجی دواوەش بدەن ئەوا بە مەبەستی وێناکردنی نوێی سەردەمی ڕێنسانس و وێناکردنی وێنانی کلاسیکی بێت، کە ئێستا لە باری دووبارە ئاشکراکردنەوەدان و تەنانەت سەرنجی دواوەیان داوە بۆ وەسفی پیرۆزی دڕندەیەتی خانەدان.

بەڵام دیسان خەڵکی بە دوای جێگیرییەکی نوێدا دەگەڕان لە دوای سەرهەڵدانی قەیرانەکانی سەدەی حەڤدەیەم، واتە قەیرانی ئالوودەبوون بە تاعوون یان قەیرانی دوا دوورخستنەوەی ئەوانەی لە ئایین هەڵگەڕابوونەوە.

گەڕان بە دوای جێگیرییەکی نوێدا دەست پێدەکات. جێگیری لەسەر ڕێکخستنە عەقڵانییەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و سیاسی دامەزراوە و بیناکراوە ئەو عەقڵانییەتەش ئەخلاقییەتی تاکەکەس و پەیوەندییەکانی نێوان دەوڵەتە تەواوەکان پێکەوە لەخۆ دەگرێت. ئەو پێودانگانەی کە ڕێنومایی کراون و نەخشەیان دانراوە یان جێبەجێ کراون لە پێناوی ئەو ئامانجەدا، هەرچەندە بە بەردەوامی خەیاڵ و تێڕامانی ئاشکرایان لە بارەوە لە ئارادا نەبووە وەکو ئەوەی کە بنەماکانی پرۆگرامی ڕۆشنگەری بن، بەڵام وەکو پرۆژە وابوون کە زیاتر لە هەوڵداندا بوون بۆ تێگەیشتنی چاکتر یان وەکو شێوازێکی ڕەخنەگرتن لە دابونەریتە باوەکان. لە ڕاستیدا فرەیێتی و جۆراوجۆرێتی ئەم چەشنە پێوانانە و توندی و پەشێویی نێوانیان و پاڵنەرە جیاوازەکانیان کە هێزی بزوێنەری ئەم

پرۆسەیان پێکهێناوە، ئێمە بە ڕۆشنگەرییان دەزانین.

دیارە بیروڕا و شێواز و هەڵوێستەکانی سەردەمی ڕۆشنگەری دەربڕراون کە بێگومان ئەو دەربڕینەش هەر ئەوە نییە کە لە نووسینی ئەمڕۆدا هەیە، بەڵکو دەشێ لە درووشمە ئایدیۆلۆژی و ئەدەبییەکانی هونەری ئەم سەردەمەدا ببینرێن و هەروەها بشبیسترێن. مۆسیقای ئەو سەردەمە هێشتا مۆسیقایەکی هێجگار زیندووە -لە ڕاستیدا لە مۆسیقای هەموو سەردەمەکانی پێشتر زیندووترە. سەرچاوە مۆسیقییەکانی سەدەی هەژدە هێشتا بە شێوەی ڕێکوپێکی بەردەوام لەم کتێبخانە یان لەوی تر دەخرێنە ڕوو. بەرهەمەکانی کۆرێلی، ڤیڤالدی، ئەلبینۆنی، هاندێل، باخ و کوڕەکانی، تێلیمان، ڕامبۆ، ستامیتز، هایدن، مۆزارت، گلوك و بۆکخیرینی هەمیشە ناو دەهێنرێن، کەچی ژمارەیەکی کەم لە مۆسیقارەکانی ئەم سەردەمە ناویان هەیە. لە ڕێگای سیمفۆنیا و سەمای کلاسیکی و کۆنسێرتەوە و بە ئاوازی نایاب و سادەی جیاواز و بنیاد ئاشکراوە دەشێ ئێمە زۆر بە ئاسانی سیحری تایبەتی ئەم سەردەمە ئاشکرا بکەین.

وێنەکێشانی ئەوکاتە دەشێ وەکو دەستپێکی ئیمپریشنیستەکان سەیر بکرێت، ئەگەرچی ئەو وێنەکێشانە لەسەر شێوازی "هێشتا-زیندوو"ی گاردین بێت، یان وێنە زەیتییەکانی لۆرانس و گەینسبۆرۆ و لاتۆ یان گراف بێت، یان لەسەر شێوەی ئارەزووی ورد و دیمەنە سروشتییەکان و دیمەنە سەرسامکەرەکانی وایتۆ و فراگۆنارد بێت. ئەو جیهانەی کە ئەوان نیشانمان دەدەن چیتر جیهانێکی تاریك و تەمومژاوی نییە و بگرە جیهانێکە زۆر لە ژیان گەورەترە (یان لە جیهانی ئاسایی فراوانترە.. و) واتە گەورەترە لەو ژیانەی کە لە وێنەکانی (بارۆکی)دا دەردەکەوێت.

لە هەمان کاتدا (چێژی ئەو قۆناغە) چێژی ریکۆکۆ هونەری مەعماری گۆڕی و جگە لە ڕازاندنەوەی شێوازی هونەری بارۆکی هونەری مەعماری هیچ بنەمایەکی تری پێشتری نەما. گەوهەر و ناوەرۆکی کەنیسەکان پەیوەستن بە هەمان نەخشەی بنەڕەتی خۆیەوە، بەڵام کاریگەری گشتی یان ئەنجامی گشتی زۆر گەشاوە دەبێت ئەویش بە هۆی ڕەنگەکانی یادەوەرییەکانی ڕابردووی ئاسمانی ئێوارەیەکی هەمیشە خۆرەتاوەوە کە پەڵە هەورە تاریکەکان کردوویانەتە جێگای سەرنجڕاکێشان. وێنەیەکی بچووکی خۆشی بەخش کە بە خێرایی دەجوڵێت و بە تووندی لە پێکهاتەیەکی بە ئاڵتوون پۆشراودا پێچراوەتەوە، کەمتەرخەمانە یاری بە کتێب و بە ترامپێت و بە قیسارە دەکات.. ئەم وێنەیە تەنانەت یاری بە دروشمی میرانە لە تاج و لە گۆچانی دەسەڵات دەکات.


<u>سەرچاوە</u>

*Ulrich Im Hof. The Enlightment.*

*1994- p.p. 8-10.*